

کورتە مێژووی

# بنەماڵەی قازی

لە ویلایەتی موکری

خەلیلی فەتاحی قازی



کورتە مێژووی

# بنەماڵەی قازی لە ویلایەتی موکری

نووسینی:

خەلیلی فەتاحی قازی

وەرگێڕ و ئامادەکار:

حەسەنی قازی

ناوی کتێب: کورتە مێژووی بنەماڵەی قازی لە ویلایەتی موکری
نووسینی: خەلیلی فەتاحی قازی
وەرگێڕ و ئامادەکار: حەسەنی قازی
بڵاوکەرەوەی دەقی فارسی و بژارکار: قادری فەتاحی قازی
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٨٦٠
هەڵەگری: فەرهاد ئەکبەری + شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر ٢٠٠٩
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ٢٧٤ی ساڵی ٢٠٠٩ی دراوەتێ

# سەرەتای کتێب

لە کتێبی "یاد یاران"ی خوداڵێخۆشبوو دوکتور مێهدی ڕەوشەن زەمیر[١]دا هاتووە ڤیکتۆر هۆگـۆ گـوتوویە: من کـاتێک باسی خـۆم دەکـەم، لە ڕاسـتـیـدا باسی تۆم کـردووە". سەرنجڕاکێشە مامۆستا ئەو قسەیەی لە کتێبی دواتریدا بەناوی "دیار خوبان" (مەڵبەندی چاکان) دووپاتە کردووەتەوە. مامۆستا لەو کتێبەیدا نووسیویە ئەو قسەیە گرینگی و نێوبانگی جیهانی پەیدا کردووە.[٢]

بەلە بەرچاوگرتنی قسەی ڤیکتۆر هۆگـۆ، ئەوەی ئینسان سەبارەت بەخـۆی یان بابوباپیرانی خـۆی باسی لێـوە دەکـا، هەر ڕوویەکی سکەیە، هەر هەمان قسە لە ڕووی دیکەی سکەدا ئەو قسە و باسانەن وا لەسەر خەڵکی دی کراون. بە گوتنێکی دیکە ئەو قسانەی کەسێک لە سەر خۆی دەیانکا، یەک لایەنە نییە، بەڵکو هاوکات، لەمەڕ خەڵکی دیکەشە. ئەگەر وابێ ئەم کتێبەی بەردەستتان کە کورتە مێژووی بنەماڵەی قازییە، لەو بنەماڵەیەی تێ دەپەڕێنێ و دێتە نێو شانۆیەکی کۆمەڵایەتی لەمەڕ خۆی و تەنانەت ڕەنگە بکرێ بگوترێ لەویشی تێ دەپەڕێنێ.

ئەم کورتە مێژوویە بابم، خوداڵێخۆشبوو خەلیلی فەتاحی قازی نووسیویەتی. نابێ وا دابنرێ بابم سیاسییەکی لە نێوی هەموو ئەندامانی بنەماڵەی لە بەرانبەر خۆی داناوە و لەسەر تاق تاقی ئەوان هەندێک شتی نووسیوە، وا نییە، بەڵکو ئەم نووسراوەیە لەمەڕ کەسانێکە بەجۆرێک خاوەن ناوونیشان بوون و یان وەزع و حاڵیان بەجۆرێک بووە کە تێکەڵاوی ڕووداوی گرینگ بوون، بەم پێیە لەو کتێبەدا باسی کەسانی ئاسایی مەگین زۆر بەکورتی و بەدەگمەن نەبێ، نەکراوە.

---

١- یاد یاران، لاپەڕەی ١٥٢

٢- دیار خوبان، لاپەڕەی ٥٨٩

بابم هەر لە هەرەتی منداڵییەوە باسوخوداسی لەمەڕ ڕابردووی بنەماڵەی خۆی بیستووە و دوای ئەوەی گەیوەتە تەمەنی پێگەیشتوویی هەوڵی داوە، بەپرسیارکردن لە ئەندامانی بەساڵداچووی بنەماڵە و جارجارەش لە خەڵکی دی زانیارییەکانی پێشووتری خۆی دەوڵەمەندتر بکا و لەو بارەیەوە بگاتە ئاستی یەقین و دڵنیایی. بەشی یەکەمی ئەم کتێبەی لە بەردەستتاندایە ئاکامی ئەو پرسیار و لێکۆڵینەوانەن و بەشی دواتریش، بابم بەچاوی خۆی دیویەتی و هەستی پێ کردووە و دوایە نووسیویەتی.

ئەم جۆرە نووسینانە، بەقەڵەمی تاکوتەرای ناوچەیی، کە ڕەنگە لە داهاتوودا ئیدی هۆیەک بۆ سەرهەڵێنانیان - لەبەر دەستبەتاڵ نەبوونی ئینسانەکان بەهۆی ژیانی خێرای ماشێنی- ئەوەندەش ئامادە نەبێ، لە ڕوانگەی مێژووی ناوچەییەوە کە لە هەمان کاتدا بەزەمان و شوێن و کۆمەڵەکانی دیکەیشەوە بەستراوەتەوە، زۆر بەکەڵک و بەخێرە، بەو مەرجەی لە پلەکانی کۆتاییدا (هەڵوەژاردن و چاپ و بڵاوکردنەوە) خەڵکی لێزان پێیاندا بێنەوە. بەداخەوە ئەوەی کەسانی دی لەسەر ئەو جۆرە بابەتانەیان نووسیوە یان دەنووسن، زۆر جار پڕن لە هەڵە و خەمساردی.

نووسەری لێکۆڵەرەوە کاک سەید محەمەدی سەمەدی لە کتێبە بەنرخەکەی خۆیدا بەناوی "نگاهی بەتاریخ مهاباد" لە لاپەڕەکانی ٩٠ و ٢٣٥ نموونەی ئەو جۆرە ورد نەبوونانەوەی نیشان داوە. بەلە بەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە، نووسراوەکانی کەسانی ئاگەدار و لێزان و بێ غەرەزی خۆجێیی، سەرچاوە و ژێدەری هەرە ساڵح و بەمتمانەترین سەنەد و بەڵگە و باشترین ڕێنوێن بۆ لێکۆڵەرەوەکانی داهاتوو. لەبەر ڕووناکاییی ئەو جۆرە نووسینانەدا دەکرێ ئەو هەڵە و لادانانەی هێمایان پێ کرا، بناسرێنەوە و ساخ بکرێنەوە.

مەیل و مرخی نووسەری ئەم دێرانە کە کوڕی گەورەی نووسەرم، بەڕەچاوکردنی ئەو قسەیەی ڤیکتۆر هۆگۆ کە لە سەرەوەدا ئاماژەی پێ کرا، لە دوو لاوە - هەم لە ڕووی پێوەندیی بنەماڵەیی و هەم لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە - بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی ئەم نووسراوەیە زۆر بوو و زۆر خاڵی مەردمناسی و مێژووییم چ سەبارەت بەڕابردوو و چ سەبارەت بەئێستا تێدا دەدی. بۆیە بڕیارم دا - جگە لەوەی کە بۆ خۆم بێ پسانەوە بۆ ئاگەداربوون ڕووم لێ ناوە - ئەو جار بۆ ئاگەداریی هەمووان ئامادەی کەم و بیخەمە بەرچاو و داوەریی خاوەن ڕایان و هۆگرانی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و سەربهووردەی پێشینیان، بەم پێیە ڕێکوپێککردن و پێداهاتنەوەییم، بەئەرکی خۆڵێنەبوێر و بەدڵی خۆم دانا و بەدەم کار لەسەرکردنی بەبیرمدا هات دوو بەڵگە کە لە ڕابردووەوە

لەبەردەستدان بکەمە تێهەڵکێشی ئەم نووسراوەیە و یەکێکیان لە دەق[1]دا و ئەوی تریشیان لە پەراوێزدا بهێنم.[2]

لێرەدا دەبێ لێی زیاد کەم ئەم جۆرە بەڵگەنامانە لە ڕوانگەی لێکۆڵینەوە نرخی دەرەجە یەکیان هەیە و حەق وایە ئەو کەسانەی بەڵگەنامەی ئەوتۆیان هەیە، لە بەردەست لێکۆڵەرەوە و توێژەرانیان بنێن. "سەنەد و بەڵگە" ئەو بابەتەی باسی لێوە دەکرێ لە حاڵەتی قسەی بیستراو و زارەکی دەردەخەن و پێش لە هەڵە تێوەهاتنی دەگرن، ئەو بەزوارەی لەسەریان نووسراوە واتە "ڕەقەم" زۆر گرینگە و پێشی هەموو جۆرە شک و دوودڵی و گۆترەکاری و گومانێک دەگرێ.

یەک لەو بەڵگانە وەقف نامەیەکە بەپێی وی میرزا عەبدوڵای قازی لە ساڵی ١٢٣١ (کۆچی مانگی) بەشێک لە موڵکەکانی وەقفی کوڕی خۆی کردووە کە لە حوورجەهان خانم کچی مەحموود بەگ (کوڕی شێخاڵی خانی حاکمی موکری) بووە. ئەوی دیکەیان بەڵگەیەکە لە ساڵی ١٢٧٧ (کۆچی مانگی) نووسراوە و تێیدا شاهیدی دراوە خودالێخۆشبوو حاجی میرزا عەبدوڵای ساوجبولاغی لە ساڵی ١٢٥٤ (کۆچی مانگی) بەشێک لە موڵکەکانی خۆی ڕاگوێستووە بۆ دوو کوڕەکانی واتە میرزا عەبدولڕەحمانی قازی و حاجی میرزا عەبدولڕەحیم.

ئەو بەڵگەنامانە تا ڕادەیەک ژیانی حاجی میرزا عەبدوڵای قازیی ساوجبولاغی دەخە ژێر ڕووناکاییی لێکۆڵینەوە. ئەو میرزا عەبدوڵایە کوڕی میرزا مەحموودی خۆشنووسی سابڵاغی و برای بچووکتری میرزا قاسمی قازی (میرزا قاسمی یەکەم) بووە.

کتێب و گۆوار و ڕۆژنامە هەمیشە لە ماڵی ئێمەدا هەبوون. بابم مەیلێکی زۆری هەبوو بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی و زانینی باس و خواسی زانایان و هەلومەرجی جیهان و شەرحی ژیانی عالمانی گەورە و ئەهلی قەڵەم. ناوبراو بەر لەوەی لە مانگی خەرمانانی ١٣٣٠ (ی هەتاوی) لە مهابادەوە بگوێزرێتەوە تەورێز، لە کاتی دەستبەتاڵیدا کاری دوو شت بوو؛ یەکیان، خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامە و ئەوی دیکەیان سەردانی باخی مکایلی[3] کە بەشێکی ئی بەرێزیان بوو. سەردانی ئەو باخە بۆ وی زۆر خۆش و دڵنشین بوو و

١- بڕوانە: دەقی ئەم کتێبە، لاپەڕەی.

٢- بڕوانە بەشی شیکردنەوەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە.

٣- سەبارەت بە باغی مکایلی بڕوانە لاپەڕەی ١٣، پەراوێزی ٢ی ئەم کتێبە. باغی ناوبراو دوای ئەوەی بوو بەموڵکی شارداریی مهاباد و هێندێک ئاڵوگۆڕی تێدا کرا، ئێستا ناوی لێنراوە پارکی میللەت.

ئارامییەکی زۆری پێ دەدا. ئێستاش لە ناسیاوان دەبیستم - بابم - لک بە لکی قەڵەمەکانی باخ و دارە بییەکەی خۆی بەسەر دەکردەوە کە لە تەنیشت چۆمی پاک و زوڵاڵی مهاباد هەڵکەوتبوو کە ئەو زەمانی هەموو جۆرە ماسییەکی تێدا بوو، و دوایە بەو ڕێگایەیدا هاتبوو دەگەڕاوە ماڵێ. شەوانەش هاتنی دراوسێ و دۆست و ئاشنایان کە لەهەمان کاتدا خزمایەتییان لەگەڵ ئێمە هەبوو، وەکو خوداڵێخۆشبوو میرزا قاسمی قادری و خوداڵێخۆشبوو حەمەدەمینی ڕەحمانی و خوداڵێخۆشبوو میرزا کەریمی یەمینی قازی و کەسانی دی کە بەسادەیی و بێ هیچ جۆرە تەشریفات و قەید و بەندێک نە لە لایەن ئێمە و نە لە لایەن ئەوانەوە دەهاتنە ماڵمان، لە خۆشحاڵیی بابمی زیاد دەکرد. لە جێدا، ئەو زەمانی کە لە ڕوانگەی ماددییەوە نێوانێکی زۆر و سەرسوڕهێنەر لە ناو خەڵکدا پێک نەهاتبوو، چاولێکەری و تەشریفاتی زێدە و قەید و بەند لە لانی کەمی خۆیدا بوو، بەڵکو هەر هیچ نەبوو، لەو بابەتەوە خەڵکی ئەو سەروبەندی لە چاو خەڵکی ئێستا زۆر ئاسوودەتر دەژیان.

کاتێک بابم لە مەهابادەوە ڕاگوێزرا بۆ تەورێز، لەگەڵ هاوشارییەکان و جار جار کوردستانییەکانی دانیشتووی تەورێز بەبۆنەی جۆر بەجۆر و لەوانە هاتنی دوو جێژنی قوربان و ڕەمەزان سەری یەکدییان دەدا. هەموو ساڵێک لەو دوو جێژنەدا هەموویان لە دەوری یەکدیی کۆ دەبوونەوە و بەئاسایی لە پێشدا دەچوونە ماڵی مامۆستا مەلا ئەحمەدی تورجانیزادە کە بەلای ئەوانەوە زۆر خۆشەویست بوو. بۆ ئەو کەسانەی خوداڵێخۆشبوو مامۆستا تورجانیزادەیان نەدیتووە، دەبێ بڵێم ئەو خوداڵێخۆشبووە جگە لە شارەزاییی بێ وێنە لە ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی، زۆر مەجلیس خۆش و قسە خۆش و دڵاواڵە و کراوە بوو. بەکورتی ڕۆژێک لە بەیانییەوە تا شەوێ کاریان سەردان و سەردانەوە و چاوپێکەوتنی یەکدیی بوو.

ئەم نووسراوەیەی -لێرەدا دەکەوێتە بەرچاوی خوێنەوەران، بەشی دوایی یادداشتەکانی بابمە کە لە کتێبی (سالهای اضطراب) (بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازی) - (ساڵانی پەشێوی) ئاماژەم پێ کردوون. هەڵبەت بابم دوای خانەنشین بوون و گەڕانەوە بۆ شار و وڵاتی خۆی مهاباد، کە ئەو ساڵانە هاوکات بوو لەگەڵ سەردەمی پیری و سست بوونی بەرێزیان، هەرکاتێک حاڵ و حەوسەڵەی بووبا، دەستی دەکرد بەنووسین[1]. لێرەدا

١- بابم جگە لەو بەشە نەبێ، پاشماوەی نووسینەکانی خۆی دوای ڕاگوێزرانی بۆ تەورێز، لەو شارە نووسیوە.

بەبێ جێی نازانم چەند دێڕ لە یادداشتەکانی دوایی بابم بۆ ئاگەداریی خوێنەرەوانی بەڕێز بهێنمەوە. دەستپێکردنی ئەو بەشە لە بیرەوەرییەکانی بابم ئاوایە:

"لە یەکێک لە ڕۆژەکانی ناوەڕاستی مانگی جۆزەردانی ١٣٥٧ (ی هەتاوی) بۆ کات دەربازکردن کە ڕەسم و دابی ئاسایی کەسانی بەساڵداچوو و خانەنشینە، چوومە بازاڕێ و لە دووکانی یەکێک لە دۆستان دانیشتبووم. دیتم جەوانێک هاتە ناو دووکانەکە و گوتی عەزیزی یووسفی کۆچی دوایی کردووە. ئەو خەبەرە نەک تەنها لە سەر من، بەڵکو لە سەر دوو سێ کەسی دیکەیش کە لەوێ بوون، شوێنێکی ئەوتۆی دانەنا، چونکو لە دنیایەکدا کە ڕۆژانە هەزاران کەسی ئاسایی و دەیان کەسایەتیی گەورە دەمرن، مەرگی یەک نەفەر چ گرینگییەکی دەتوانێ هەبێ؟ باشم لە بیر نییە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ دواتر بیستم تەرمی کاک عەزیزی یووسفی بۆ ناشتن لە تارانەوە دەهێنن بۆ مەهاباد. تا ئەوەی ڕۆژێک دوای نیوەڕۆ گوتیان ئەوڕۆ تەرمی ئاغای یووسفی دەگاتە ناو مەهاباد. ئەو خەبەرە وەک بۆمب لە ناو شاری دەنگی دایەوە..."

شێوازی نووسینی بابم شێوازی ئیدارییە، مەبەستم لە شێوازی ئیداری ئەوەیە لایەنی وەسفیی زۆر بەکار هێناوە و هەروەها جارجار ڕستەکانی بێ کردار بەدوای یەکدا هێناوە، نووسەری ئەم دێڕانە کرداره وەلانراوەکانم لە جێی خۆیان داناوە. بێجگە لەئەمە، بابم ڕستەکانی لەوپەڕی سادەیی و ڕەوانیدا نووسیوە و جوان دەردەکەوێ - لە کاتی داڕشتنی ڕستەکاندا هیچ جۆرە گرفت و کێشەیەکی نەبووە. بابم کەمتر بەیادداشتەکانی خۆیدا دەچووەوە، هەروەها کاری نووسینیشی بەپێی شێوە و نەزم و گەڵاڵەیەکی تایبەتی لە پێشدا - دیاریکراو بەرەوپێش نەدەبرد، بەو مانایە هەرچێکی لە کاتی دەستپێکردنی نووسین لە زەینیدا بووە هێناویەتە سەرکاغەز، بەم پێیە پێوەندیی نێوان بابەتی پێشوو و دواتری بەڕێزیان زۆر جار زەینییە و نەک بەپێی عیبارەت و، ئەم شێوازە بەنۆرەی خۆی زۆر خۆڕسکی و جوان و بێ گرفتە و حاڵەتی چیرۆکێکی چاوڕاکێش و سەرگەرمکار بە نووسینەکە دەبەخشێ.

لە کۆتایی ئەم وتارەدا سپاسی نووسەر و شاعیر و لێکۆڵەرەوەی بەڕێز کاک ئەحمەدی قازی، کوڕی خوداڵێخۆشبوو حاجی مەلا کەریمی قازی دەکەم کە زەحمەتی خوێندنەوەی ئەم نووسراوەیەی بەر لە چاپ دا بەر خۆی و تەئییدی فەرموو.

سپاسی برام دوکتور یووسفی فەتاحی قازی دەکەم کە تێچووی چاپی ئەم کتێبەی

خسته سەر دەستئاواڵەیی و هێممەتی خۆی و پێشنیازی چاپکردنی کرد. تەمەن درێژایی و گەورەیی و سلامەت و بەختەوەری و سەرکەوتنیان هەمیشە ئارەزووی منە. لە برام کاک مستەفای فەتاحی قازی کە پشتی بەرگی کتێبەکە کاری بەرێزیانە و هەروەها کاک رەحمانی میسباح کە ژمارەیەک لە وێنەکانی لەبەر دەست من نا لە دڵەوە سپاسی دەکەم.

الحمد لله رب العامین.

لە هەوەڵەوە تا دوایی.

تەورێز – یەک شەمۆ شەشەمی جۆزەردانی ١٣٧٨

قادری فەتاحی قازی

نووسەری ئەم کورتە مێژووە خەلیلی فەتتاحی قازی، کوڕی میرزا ڕەسووڵ (مەشهوور بەمیرزا ڕەسووڵی باخچەی) لەمێژ بوو ئارەزووم بوو بەئەسڵ و ڕەچەڵەک و ڕیشەی بنەماڵەی قازییەکانی مهاباد بزانم، کە بۆ خۆم یەکێکم لە تاکوتەرای ئەوان و زانیاریی تەواوی پشت بەستوو بەسەنەد و بەڵگەی نووسراو و سەرچاوەی ڕاستی، پەیدا بکەم، بەڵام بەداخەوە هەرچەندی لەو بارەیەوە پرسیارم کرد و حەولم دا، نەگەیشتمە مەبەستی خۆم کە ئەویش وەدەستهێنانی زانیاریی نووسراو بوو[1] بەڵام لە جیاتییان لە کەسانی باوەڕپێکراو و بەساڵداچوو، بابەتی زۆر چاوڕاکێش و جێی سرنجم لەو بارەیەوە دەبیست و لەبەرئەوەی گشت ئەو بابەتانە زارەکی بوون، بۆ نووسەری ئەم دێرانە، بەتایبەتی سەبارەت بەتاکوتەرای زۆر کۆن، ئەوەندە جێی پێ پێمل بوون و متمانەدەر نەبوون. بەڵام لە هەمان کاتدا لەبەرئەوەی گێڕانەوەکانی هەموو کەسەکان وەک یەک وابوون و کەمترین جیاوازییەکیان بەتایبەتی لەمەڕ هاتنی یەکەم کەسی ئەو بنەماڵەیە لە گورجستانەوە بۆ ئەم ناوچەیە تێدا نەبوو، قسەکانی ئەو کەسانە دەیتوانی تا ڕادەیەکی زۆر پێملم بکەن. بۆیە ئەسڵ و ڕەچەڵەکی ئەوانم بەپێی ڕیوایەتی ئەو کەسانەی خوارەوە لە بنەماڵەی قازی کە هەنووکە لە بەساڵداچووترین و گەڕاوەترین تاکوتەرای ئەو بنەماڵەیەن و، هەروەها لە زمان کەسانی دی بەساڵداچوو و ئاگەدارەوە کە لەگەڵ تاکوتەرای بنەماڵەی قازی پێوەندیی نزیک و دۆستایەتی و هاموشۆی هەمیشەییان هەبووە، بۆ خۆیان یان کەسانی ئەوان، دەنووسم. گێڕەرەوەکان لە بنەماڵەی قازی ئەم کەسانە بوون:

---

١– هێندێک قەباڵە، شاهیدینامە، وەقفنامە ماونەتەوە بەڵام محاڵ وەبەرچاو دێ کەسێک کورتە مێژوویەکی سەربەخۆی لەو بارەیەوە نووسیبێ، چونکو کورتە مێژوو نووسین کە لێرەدا مەبەستی بابمە، لە نێو بنەماڵە مامێتونجییەکاندا باو نەبووە. (بژارکار قادری فەتاحی قازی).

١- بابم ڕەسووڵی فەتتاحی قازی[١] کوڕی حاجی خەلیل کوڕی میرزا ڕەحمانی قازی، لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا.

٢- حاجی مەسعوودی ئاڵبولاغ[٢] کوڕی عەبدولکەریم کوڕی حاجی عەبدولڕەحیم کوڕی میرزا عەبدولای قازی لە تەمەنی ٦٤ ساڵیدا.

٣- مەلا ڕەحیمی ئاڵبولاغ کوڕی مەلا لەتیف کوڕی میرزا ڕەحمانی قازی لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا.

٤- پیرۆزە خانم کچی خوالێخۆشبوو میرزا قاسمی قازی لە تەمەنی ٧٠ ساڵیدا. ئەو میرزا قاسمە کوڕی میرزا ئەحمەدی قازی، کوڕی میرزا قاسمی قازی کوڕی میرزا مەحموودی خۆشنووسی سابلاغییە.

پیرۆزە خانم، چەند ساڵ لەمەوبەر وەفاتی کرد، ئەو دەمی کە زیندوو بوو، زۆر جار ئەو ریوایەتەی بۆ نووسەر گێڕاوەتەوە.

هەڵبەت ئەو گێڕانەوانە لە بەر ڕوون نەبوونی ڕێکەوتی ڕوودانیان و لایەنەکانی دی کەموکورتییان یەکجار زۆرە و وەک مشتێکن لە خەروارێک، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو کورتە گشتییانەش، بەتێپەڕینی زەمان، نەکەونە تاریکانی لە بیر چوونەوە و لە نێو نەچن، ئەم بەندەیەی کەمترین هێنامە سەرکاغەز و نووسیمن و هەروەها حەولم دا ئینشائەڵلا سەربهووردەی کەسانی هاوچەرخ، بەتایبەتی ئەوکەسانەی کە خاوەن کەسایەتی و لێوەشاوەیی بوون، وردتر و بە وردە ڕیشاڵ بەیان بکرێ.

بابم، خوالێخۆشبوو ڕەسووڵی فەتاحی قازی و کاک حاجی مەسعوودی کەریمی ڕایان گەیاند ئەم ڕیوایەتانەیان -هەر بەو شێوەیەی بەندە دەیاننووسم- لە دایک و بابی خۆیان و کەسانی بەساڵداچووی بنەماڵە کە سینگ بەسینگ ڕاگوێزراون، بیستووە و بەتایبەتی لێیان ویستوون -چلۆنایەتیی ئەحوالات بۆ ئەولاد و منداڵانی خۆیان بگێڕنەوە بۆ ئەوەی بەتێپەڕینی ڕۆژگار، شەرحی حاڵی ئەوان لە نێو نەچێ. لەو قسەیەڕا دەردەکەوێ - پێشینیانی ئەم بنەماڵەیە، زۆریان بەلاوە گرینگ بووە لە داهاتوودا منداڵەکانیان لە ناسێنە

---

١- لە بەرواری دووشەمۆ ١٣/ ٢ / ١٣٢٧ بەرانبەری ٢٣ی جمادی الثانی ١٣٦٧، لە مەهاباد کۆچی دوایی کردووە.

٢- بڕوانە: سالهای اضطراب، بیرەوەرییەکانی خەلیل فەتاحی قازی، لاپەڕەی ٤٦، پەراوێزی ٣. کتێبی نێوبراو کە بەشێک لە بیرەوەرییەکانی بابم دەگرێتەخۆ، لە ساڵی ١٣٧٠ لە شاری ورمێ لە لایەن ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبییەوە چاپ کراوە.

و سەربەهووردەی باب و باپیرانی خۆیان بەباشی ئاگەدار بن و هیچ دوور نییە کەسانی زانا و ئەهلی قەڵەمی بنەماڵە سەربەهووردە و ئەسڵ و ڕەچەڵەکی خۆیان نووسیبێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی ناوچەی کوردستان بەتایبەتی شوێنی دانیشتنی ئەو بنەماڵەیە، واتە ساوجبولاغی موکری یان مهابادی ئێستا، لەبەر هەڵکەوتی لەسەر سنوور، هەمیشە شانۆی شەڕ و پێکدادانی دەوڵەتی ئێران لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و ڕووسییەی قەیسەری یان مەیدانی لێ دە و بخۆی تایفە جۆربەجۆرەکانی کورد لەگەڵ یەکدی یان لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندی بووە، دانیشتوانی ئەم هەرێمە و لە نێو ئەواندا ئەندامانی ئەم بنەماڵەیە کە لەچاو تایفە و عەشیرەتە کوردەکان ژمارەیان کەمتر و لاوازبوون و سەر بە چینی ئەهلی زانست بوون، دەربەدەر و تاڵان کراون، بۆیە ئەگەر لەو بارەیەوە سەنەد و بەڵگە و یادداشتیش هەبووبێ لەبەر کێشمەکێش و بارگرژی لە نێو چوون(١) من خۆم نووسەر - تا کاتی نووسینی ئەم یادداشتە - حەوت هەشت جار ماڵی خۆم بەتاڵانکراوی دیوە، بەشێوەیەکی وا کە جگە لە حەسیر و پەلاسێکی دڕاو نەبێ شتێک لە ماڵەکەدا نەماوە و بۆ خۆشمان لە ماڵ و حاڵی خۆمان ئاوارە بووین و بۆ ماوەی درێژ سەرگەردان بووین. لە تافی منداڵیی بەندەدا ئەو تاڵان و بڕۆیە چەندین جار قەوماوە کە بەندە لە دایک و بابی خۆمم بیستووە، بەڵام بۆخۆم ڕووداوەکانم وەبیر نایەتەوە. بەباسکردنی ئەو وردە ڕیشاڵانە لە ڕاستبوونی گشتیی ئەو بابەتانەدا بۆ بەندە جێی هیچ دوودڵی نامێنێتەوە، بۆیە چلۆنایەتیی پەیدابوونی ئەو بنەماڵەیە لەم ویلایەتەدا، تا ئێستا بەم شێوەیەی خوارەوە دەنووسم. هیوادارم لە پاش بەجێماوان و داهاتووانی ئێمە دوای ئێمە ڕێز لەو کورتە مێژووە بگرن و نرخی خۆی بدەنێ، تەواوی بکەن و چاپی بکەن و لە ناو ئەندامانی بنەماڵەدا بڵاوی بکەنەوە.

---

١- خوالێخۆشبوو عەبدولڕەحمانی سالاری موکری، کوڕی خوالێخۆشبوو قازی فەتاح، شەرحی حاڵی خۆی و ڕووداوەکانی ناوچەی نووسیبووەوە. سەروان کەنزی سەرۆکی سازمانی ئەمنییەتی مهاباد (ساواک) بە هەبوونی ئەو یادداشتانە دەزانێ و ئەوان لە کاک عەبدولڕەحیمی جەوانمەردی قازی (کوڕی ئاغای سالار) وەردەگرێ و دەستیان بەسەردا دەگرێ.

هەروەها خوالێخۆشبوو میرزا برایمی قازیزادە، کوڕی میرزا جەلیلی قازی، مێژوویەکی سەبارەت بە کوردستان و چلۆنایەتی هەرێمی موکری نووسیبوو. ناوبراو نووسراوەی باسکراوی بۆ چاپکردن ناردبوو بۆ عەبدولڕەحمانی کیوی موکریانی کە کەسێکی زانا و خوێندەوار و خاوەنی زۆر کتێبی جۆر بەجۆر بوو و لە هەولێر چاپخانەی هەبوو، بەداخەوە هیچ دەنگێک لە چاپکرانی دەرنەکەوت.

ئەمن قادری فەتاحی قازی، کوڕی گەورەی نووسەر لێی زیاد دەکەم: ئەو جۆرەی باس دەکرێ یادداشتەکانی خوالێخۆشبوو سالار ئاخرەکەی دەکەوێتە لای کاک ئەحمەدی قازی کوڕی خوالێخۆشبوو حاجی مەلا کەریمی قازی و بەداخەوە لە لای بەڕێزیان لە نێو دەچن.

## پەیدابوونی بنەماڵەی قازی لە ویلایەتی موکری

لە دەورەی سەلتەنەتی شا تەهماسب کوڕی شا ئیسماعیلی سەفەوی - تەقریبەن لە دەوروبەری ساڵی ۹٤۳ی کۆچی مانگی - هەندێک سەرهەڵدان و ئاڵۆزی لە گورجستان کە ئەو دەمی بەشێک بوو لە خاکی ئێران دەقەومن. بۆ سەرکوتکردن و دامرکاندنی ئەو سەرهەڵدان و بارگرژییانە، لە ئێرانەوە لەشکرکێشی دەکرێ بۆ گورجستان. ئاساییە لەو جۆرە ڕووداوانەدا سوارەی چریکی خۆجێییش بەشداری دەکەن، بەو پێیە لە عەشیرەتەکانی کوردستان، ژمارەیەکی تەیار بەفەرمانی دەوڵەت بەسەرپەرستی و فەرماندەری بداغ سوڵتانی بابامیری لە خانەکان و خاوەن موڵکانی بەناوبانگی کوردستان،بەرەو گورجستان دەچن.[1] بداغ سوڵتان بەپاکی و تەقوا و پیرۆزی زۆر بەناوبانگ بووە و حکوومەتی ساوجبولاغی موکری (مهابادی ئێستای) بەدەستەوە بووە و پردی سوور[2] و مزگەوتی جامیعی[3] ساوجبولاغ ئەو دروستی کردوون و لە دێیەکانی خۆی نزیکەی سەد دانگ موڵکی وەقفی دروستکردنی ئەوان کردووە.

لەشکریانی بداغ سوڵتان ماوەیەک لە تەنیشت شارۆچکەی قازان لە شارەکانی وڵاتی گورجستان، چادر لێ دەدەن و خۆیان دادەمەزرێنن. لەو دەمەدا جەوانێکی دوازدە سێزدە ساڵە، بەناوی عیسا، خەڵکی شارۆچکەی قازان شار، سەر بەبنەماڵەیەکی ناسراوی ئەوێ کە بەتاتولا (تاتیڤێلی) بەناوبانگ بوون، شەوێک حەزرەتی ڕەسووڵی ئەکرەم (دروودی خودای لێ بێ) دێ دەخەونییەوە، پێی دەفەرموێ" ئەی محەمەد ئەمن ئیسلامم، ئاولەمەی تۆ لە ڕۆژی ئەزەلەوە وەک موسوڵمان گووراوە، دەبێ دینی ئیسلام قبووڵ بکەی و بۆ

---

١- ژیانی بداغ سوڵتان لە ساڵی ۹٤۳ بە لە بەرچاوگرتنی ڕێکەوتی دروستکردن یان تەواوبوونی مزگەوتی سوور (مزگەوتی جامیعی مهاباد) کە ساڵی ۱۰۸۹ی کۆچیی مانگییە، محاڵ وەبەرچاو دێ.

٢- پردی سوور بەداخەوە دوای سازکردنی سەددی ئەمرۆیی، لە لایەن یەک دوو کەس لە کاربەدەستانی ئەو دەمی سەدەکەوە لەبەر خەمساردی و کەمتەرخەمی بەرێوەبەرانی ئەو کاتی پاراستنی ئاسەواری کۆنینە وێران و خاپوور کرا.

٣- بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە، ژمارەی ١

بەجێـهێنانی ڕێوڕەسـمی هاتنە سـەر دینی ئیسـلام بچێـە لای نوێنەر و نایبی من، بداغ سولْتـان کە فەرماندەری لەشکریانی کوردسـتانە و هەر لە قەراغ ئەم شارەی ئێوە چادری هەڵداوە.

جـەوانی ناوبراو لە هەیبـەتی ئەو کـەسـە نوورانیـیـە، لە خـەو ڕادەپەڕی و دەست دەکـا بەگریان و شیوەن. بەدەنگی شین و گریانی دایک و بابی وەخـەبەر دێن و دێنە ژوور سـەری و هۆی گریان و شیوەنەکەی لێ دەپرسن. ئەو جەوانە وردە ڕیشاڵی ئەو خەونەی دیتوویە بۆ دایک و بابی دەگێڕێتـەوە. دایک و بابی دڵداری دەدەنەوە دەڵێن، ئەوە هەمووی خـەیالات و ترسـە، گـرینگ نیـیـە، دیسـان دەینوێننەوە. جـەوانەکـە بۆ جـاری دوویەم خـەون بەکـەسـە نوورانییەکەوە دەبینێ کە قسەی پێشووی خۆی دووپاتە دەکاتەوە. جەوان لە خـەو ڕادەپەڕێ بێ تابی دەکـا. دیسـان دایک و بابی دێنە لای و لە سـەرڕا ئارامی دەکـەنەوە. جـەوانـەکـە دیسان خـەوی لێ دەکـەوێتـەوە، جاری سێـیـەم هـەمـان کـەسی نوورانـی و بەهـەیبـەت دێ دە خەونییەوە و قسـەکانی پێشووی بەتووڕەیی و هـەڕەشە و تەئکیدی زیاتر دینێتە سەر زمان و تەنانەت بەو شیرەی بەدەستیەوە بووە هەڕەشەی لێ دەکا.

ئەو – جـارەیان جـەوانەکـە لە کـاتێکدا – حـەول دەدا دایک و بابی وەخـەبەر نەیێن، بەهەڕاکردن بەرەو ئـەو شوێنە دەچێ کە لەشکری کوردسـتـان، ئۆردووی لێ دابوو و خـۆی دەگـەیێنێتـە چادری بداغ سـولْتـان. لەو دەمـەدا بداغ سـولْتـان لە دەرەوەی چادر خـەریکی دەستنوێژ هەڵگرتن دەبێ بۆ نوێژی بەیانی. بەبێ ئەوەی جەوانی ناوبراو قسەیەک بکا، بداغ سـولْتـان بەمـحـەمـەد بـانگی دەکـا و پێـخـۆشـبـوونـی خـۆی لە هاتنی ڕادەگـەیەنێ، دوایە دەینێرێتە ناو چادر و دیسان دەیخاتە بەر لوتف و محەبەت و دڵدانەوە.

دوای تاوهەڵات دایک و بابی کـوڕەکـە دێنە ئۆردووگـەی کـوردسـتـان و سـەرو سـۆراغی کوڕەکەیان دەکەن. لەشکرییەکان ئەوان بەرەو چادری بداغ سولْتان ڕێنوێنی دەکەن. دایک و باب دەچنە لای بداغ سولْتان و بەدەم گریان و شیوەن داوای کوڕەکەیان دەکەنەوە. بداغ سـولْتـان لە وەلامـدا پێیـان دەڵێ ئەو جـەوانە خـودا هیـدایەتی کـردووە و بەپێـی خـەونێکی دیتـوویە و بۆ ئێـوەی گێـڕاوەتەوە بەدڵی خـۆی ئیسـلامی هێناوە و هیـچ کـەسـیش ناچاری نەکردووە ئەو کارە بکا، بەلام دیارە ئەگـەر بۆخـۆی پێی خـۆش بێ لەگـەڵتـان بێتـەوە، کـەس پێش بەهاتنەوەی بۆ لای ئێوە ناگرێ.

دایک و بـابی جـەوانەکـە لە دەرەوەی چـادر لەگـەڵ دڵدانـەوە و لەبـەر پاڕانـەوەی ئەوەی پێویست بێ، دەیکەن، دواجـار دوای پێکێشی و گریان و شـینی دایک و بابی، پێیـان دەڵێ

ئەمن بەدڵ و ڕەزای خۆم چوومەتە سەر دینی ئیسلام و ئیدی هاتنەوەم بۆ لای ئێوە نالوێ و ناگەڕێمەوە.

لەبەرئەوەی دایک و بابی جەوانەکە بەڕێگای دڵدانەوە و شین و شەپۆڕ بەمەبەستی خۆیان ناگەن، دیسان دەچنەوە و دەستەوداوێنی بداغ سوڵتان دەبنەوە و دەڵێن ئێمە ئامادەین گشت دارایی خۆمان لە نەغدینە و کەلوپەل و موڵکەکانمان کە یەکجار زۆرە، بەئێوە پێشکێش بکەین بەو مەرجەی کارێکی وابکەن کوڕەکەمان پێمل بێ، بگەڕێتەوە لامان. بداغ سوڵتان لە پەژراندنی ئەو داوخوازە دەست دەکێشێتەوە و دەڵێ: (ئەو کارە لە دەست من نایە). بەکورتی دایک و باب بەچاوی پڕ لە گریان و دڵی پڕ لە حەسرەت و چخارەوە بەرەو ماڵی خۆیان دەچنەوە.

مانەوەی سپای ئێران لە گورجستان درێژ دەبێتەوە، دواجار کێشە و دژبەری نامێنێ و بەئاشتی و سەفا کۆتایی دێ و لەشکریانی بداغ سوڵتان دەگەڕێنەوە زێدی خۆیان.

لەو ماوەیدا کە سپای ئێران لەوێ دەبن، دایک و بابی جەوانی نوێ موسڵمان، پەیتا پەیتا بۆ دیتنی کوڕی خۆیان دەچن بۆ ناو لەشکری کوردستان و لە ئاکامی هەستان و دانیشتن و تێکەڵاوی لەگەڵ موسڵمانان و دیتنی هەڵسوکەوت و بیستنی قسەی باشی بداغ سوڵتان، بەرە بەرە نووری موسڵمانی دە دڵی ئەوانیش دەگەڕێ و بەشەرەفی قبووڵی دیانەتی ئیسلام موشەرەف دەبن، بەڵام سەرەڕای ئیسلام هێنانیش لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە. بەو جۆرەی کە بیستراوە ئەوان هەموو ساڵێک بەدیاری و باربووەوە لە گورجستانەوە بۆ دیتنی کوڕەکەیان هاتوونە کوردستان و ماوەیەک لە لای بوون و دوایە گەڕاونەتەوە گورجستان.

خوداڵێخۆشبوو دوکتور مستەفای شەوقی قازیزادە کوڕی خوداڵێخۆشبوو قازی لەتیف کە لە ترکییە دەژیا، لە سەفەری دوایی خۆیدا کە بەڕێگای رووسییەوە بەرەو ئێران هاتبووەوە، دەیگێڕاوە لە شاری تفلیس - یان شارێکی دی لە شارەکانی گورجستان - لە میوانخانەیەک لەگەڵ کەسێکی گورجی بەهەڵکەوت ناسیاوی پەیدا دەکا، لە ناو قساندا باس دەکاتە سەر ئەسڵ و ڕەچەڵەک. خوداڵێخۆشبوو ئەسڵ و ڕەچەڵەکی بنەماڵەی قازی بەم جۆرەی کە لێرەدا نووسیومە، بۆ کابرا باس دەکا و بەهەڵکەوت گورجیی ناوبراو یەکێک لە ئەندامانی بنەماڵەی تاتولا (تاتیفیلی) دەبێ، و دوای زانینی ئەم بەسەرهاتە، خوداڵێخۆشبوو دوکتور شەوقی لەگەڵ هەندێک لە خەڵکی دیکە بانگهێشتنی ماڵی خۆی دەکا و ئەوپەڕی ڕێز و ئیحتیرامی لێ دەنێ و پێی دەڵێ بنەماڵەی ناوبراو هێشتا ماون و لە گورجستان دەژین.

وەک پێشتر گوتمان سەربزێوی و ئاڵۆزی لە گورجستان دوای ماوەیەک بەبێ شەڕ و خوێنرێژی تەواو دەبێ و لەشکریانی بداغ سوڵتان دەگەڕێنەوە ماڵ و زێدی خۆیان. بداغ سوڵتان عیسای مەسیحی گورجی، واتە هەمان محەمەدی نوێ موسڵمان بەحورمەت و ڕێزلێنانی پێویستەوە لەگەڵ خۆی دەهێنێتەوە بۆ کوردستان و بۆ ئەوەی فێری زانستی دینی و زانستەکانی باوی تری ئەو زەمانی بکا، حەول و تێکۆشانی پێویستی خۆی دەدا. جەوانی ناوبراو لەبەر هۆش و زەکای زگماکی و ئاگاداری لێکرانی باشی لە لایەن بداغ سوڵتانەوە لە ماوەیەکی کورتدا مەعلووماتی کافی وەدەست دەهێنێ و لەبەر نەجیب بوونی خوداپێداو و پاکی و دروستکاری و کارزانی و تەقوا، سەرنجی بداغ سوڵتان بەرەو لای خۆی ڕادەکێشێ بەشێوەیەکی ئەوتۆ بداغ سوڵتان بەڕێوەبردنی کاری شەخسی خۆی و کاروباری حکوومەتی پێ دەسپێرێ و لە حکوومەتی ساوجبولاغی موکریدا پلەی خەزێنەداری دەداتێ، دوایە کچی برایەکی خۆی لێ مارە دەکا.

محەمەد دوای چەند ساڵ بۆ بەجێهێنانی فەریزەی حەج دەچێتە سەردانی ماڵی خولای. لە گەڕانەوەیدا لە سەفەری حیجاز، بەشێوەیەک کە هەتا ئێستاش لە نێو حاجییاندا باوە، تەسبێحێکی نارگیل و تاقێک عەبا بەدیاری دێنێ بۆ بداغ سوڵتان. لە بەرانبەر ئەو دیارییەدا، بداغ سوڵتان پێشنیازی پێدەکا بەهەموو گوندەکانیدا بگەڕێ و یەکێکیان بۆ ماڵدانان و موڵکایەتیی خۆی هەڵبژێرێ. حاجی میرزا محەمەد دەچێتە گشت دێیەکانی بداغ سوڵتان کە زیاتر لە سەد پارچە ئاوەدانی بوون و بەشی هەرە زۆری بەشەکانی ئاختاچی، بێهی، تورجان، یەڵتەمر، و شارویران[1] یان وەبەر دەگرت. دواجار دێی دۆستاڵی کە لە باکوری ڕۆژهەڵاتی مهاباددا هەڵکەوتووە و فەرسەخ و نێوێک لە مهاباد دوورە و شوێنێکی خۆش ئاو و هەوایە و گوندەکانی ئێستای قەرەبولاغ، زگدراو، کەپەکەند، تیکانلووجە، مۆئمین ئاوا[2] سەر بەوێ بوون و ئێستا جوێ بوونەتەوە، هەڵدەبژێرێ. لە گەڕانەوەدا بداغ سوڵتان لێی دەپرسێ: کامە گوندت بۆ خۆت هەڵبژارد؟ حاجی محەمەد دەڵێ دوستاڵیم هەڵبژارد. بداغ سوڵتان دەڵێ: دێی زۆرم هەن لە دۆستاڵی گەورەتر و ئاوەدانترن، هۆی چییە ئەو دێیە پەڕپووتەت[3] هەڵبژاردووە؟ حاجی میرزا محەمەد لە

---

١– یەڵتەمر و شارویران لە دەوروبەری مهابادن.

٢– بژارکار نازانێ گەلۆ ئێستا دێیەک بەو نێوە لەو ناوچەیەدا هەیە یان نا؟

٣– بەوەسفێکی کە نووسەر لە دۆستاڵیی کرد، ناکرێ بگوترێ –ئەوێ دێیەکی پەڕپووت بووە، دوایە هەستم پێ کرد– بابم دانیشتوانی گوندەکەی لە بەرچاو گرتووە کە ئەو زەمانی ژمارەیان کەم بووە.

ولامدا دەڵێ: دوای مردنی من و ئێوە ڕۆژگارێک دێ منداڵەکانی ئێوە ئەم دێیە پەڕپووتەش بەمنداڵەکانی من ڕەوا نابینن.

هەرچۆنێک بێ، ئاوەدانیی ناوبراو دەبێ بەموڵکی حاجی میرزا محەمەد، بەو مانایە بداغ سوڵتان قەباڵەی ئەو گوندە لە بری تەسبێحێکی نارگیل و تاقەیەک عەبا و بیست و سێ قران[1] دراوی ئەو زەمانی دەنووسێ و دۆستاڵی بەبەیعی شەرعی بەحاجی محەمەد دەفرۆشێ. حاجی میرزا محەمەد کوڕێکی بووە بەناوی ئەحمەد. ناوبراو دوای تەواوکردنی خوێندنی زانستی دینی دەگاتە پلەی قەزاوەت، لە سەرەتاوە بۆ ماوەی دوو ساڵ لە شنۆ خەریکی کاری قەزاوەت دەبێ و دوایە دەگەڕێتەوە مهاباد.[2]

میرزا ئەحمەدی قازی هاوچەرخی بداغ خانی کوێر[3] بووە. بداغ خانی کوێریش لە بنەماڵەی بداغ سوڵتانی بابامیرییە کە حکوومەتی مهاباد و مەراغەی[4] بەدەستەوە بووە و ناوەندی حکوومەتەکەی مهاباد بووە.

میرزا ئەحمەدی قازی لەگەڵ کچێک لە بنەماڵەی بداغ سوڵتان زەواج دەکا و کوڕێکی لێی دەبێ، کە ناوی دەنێن عوسمان. عوسمان دواتر دەچێتە حیجاز و ماڵی خولای زیارەت دەکا و ناوبانگی بەحاجی عوسمانی قازی بڵاو دەبێتەوە.

حاجی عوسمان کەسێکی دەروێش مەسلەک و خۆ پارێز و ئەهلی سۆفیگەری و عیرفان بووە و لە دێی دۆستاڵی زیاتر خەریکی نزا و پاڕانەوە بووە. حاجی عوسمان لەو مەزرایەی کە بە" تەکیە" بەناو بانگ بوو لە پشت کێوی قوڵقولاغ[5] ڕووگەیەکی سازکردووە کە

---

١- بابم بەدوای ئەو ڕستەیەدا دەنووسێ: دەبێ بزاندرێ لەو زەمانیدا دراو زۆر کەم و بەنرخ بووە و بەو برە، دەکرا موڵکی وەکو ئەوێ و بەڵکو لەویش باشتر بکڕدرێ.

٢- مهاباد پێشتر بەنێوی ساوجبولاغی موکری بەنێوبانگ بوو. لە زەمانی ڕەزا شای پەهلەویدا نێوی ئەوێ و چەندین جێگەی تریان گۆڕی (خەرمانانی ١٣١٤) لەوانە نێوی ورمێ یان کرد بە ڕەزائییە. نێوی چۆمەکانی تەتەهوو و جەغەتوویان کرد بە سیمینە ڕوود و زەرینە ڕوود و نێوی دێهخارگانیان کرد بە ئازەرشەهر

٣- بڕوانە: شیکردنەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە، ژمارەی ٢

٤- عەلی مراد خانی زەند، ئەحمەد خانی مەراغەیی لە حکوومەتی مەراغە لادا و بداغ خانی موکری ساوجبولاغی لە جێی وی دانا. نگاهی بە تاریخ و جغرافیای میاندوآب و تکاب و شاهین دژ (ئاوڕێک لە مێژوو و جوغرافیای میاندواو و تیکانەتەپە و سایین قەڵا)، نگارش و تحقیق جمشید محبوبی، لاپەڕەی ١٠٣.

٥- قوڵقولاغ (قورتقولاغ)، تورکییە، واتە گوێی گورگ

هێشتاش ئاسەواری ماوەتەوە. حاجی عوسمان هەموو ساڵێ بەتاقی تەنێ چوار مانگان لەوێ ژیاوە و خەریکی پاڕانەوە و چلە گرتن، بووە. وا مەشهوورە حاجی عوسمان دوو دەروێشی هەبوون بەناوی دالە و زالە[1]. ئەوان لەو ئەشکەوتەی کە بە" گڵە زەرد" بەناوبانگە و لە کێوی قولقولاغ هەڵکەوتووە، رووبەڕووی دێی خانەگی ئێستا ژیاون. دەروێشانی ناوبراو وەکو باڵندان لە چیای قوڵقولاغەوە بەرەو چیای خەزایی، بێ هیچ جۆرە ئامراز و کەرەستەیەکی میکانیکی و، تەنها بەپشت بەستن بەهێزی عیرفان و پاکیی دەروونی، هەڵفڕیون. کێوی قوڵقولاغ لە باکوری رۆژهەڵاتی مهاباد و چیای خەزایی لە باکوری ئەو شارە هەڵکەوتوون. دیارە باوەڕکردن بەو چیرۆکە لە لایەن خەڵکی ئەمڕۆیی و مۆدێرن زۆر دژوار و محاڵە، بەڵام ئەوکەسانەی سەروکاریان لەگەڵ مەعنەوییەت هەیە، ئەفسانەی زۆر سەیر و سەمەرەتر لەوەش لە عالەمی عیرفاندا قبووڵ دەکەن. شێخی پایە بەرز سەعدیی شیرازی لەو بارەیەوە گوتوویە:

طیران مرغ دیدی، تو زپای بند شهوت

بدرآی، تاببینی طیران آدمیت[2]

(لەبەر پێبەندبوون بەشەهوەتەوە فڕێنی باڵندانت دی، دەرکەوە، تا فڕینی ئینسانان ببینی).

مەعلووم نییە گەلۆ حاجی عوسمان خەریکی کاری قەزاوەت بووە یان نا؟ بەڵام بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی ناوبراو زۆربەی کاتی خۆی بە نزا و پاڕانەوە و چلەکێشییەوە تێپەڕ کردووە و دەستی لە دنیا هەڵگرتووە، ڕێی تێ ناچێ خەریکی پیشەی قەزاوەت و پێڕاگەیشتن بەداوخوازیی خەڵک بووبێ، چونکە دەرفەت و دەرەتانێکی بۆ ئەو کارە نەبووە.

حاجی عوسمانی قازی کوڕێکی بووە، بەناوی مەحموود کە دواتر بەمیرزا مەحمووودی قازیی ساوجبولاغی ناوبانگی رۆیشتووە. میرزا مەحموود پیاوێکی زۆر عالم و زانا و بەئیمان بووە و لە هونەری خەتنووسیدا، مامۆستایەتی و دەسترەنگینییەکی تەواوی هەبووە و خەتی نەستەعلیق و نەسخی بەو پەڕی جوانی نووسیوە، ئەو شێعرە لە زمان وییەوە دەگێڕنەوە:

---

١- لە دال و زال وەرگیراون و لایەنی ئیستیعاری هەیە.

٢- مەبەستی سەعدی لە فڕینی عادەتی و ئاساییی - وەک فڕینی باڵندان - بۆ ئینسان نەبووە. بەڵکو مەبەستی سەعدی بەرەژوورچوونی رۆحی و مەعنەوی و گەیشتن بە کەماڵی ئینسانییەت بووە.

خط قلعەیی ست محکم ازمن شدەست یاغی

سردار خۆش نویسان محمود ساوجبلاغی

(خەت قەڵایەکی پتەوە و لێم یاغی بووە

سەرداری خۆشنووسان مەحموودی سابڵاغی)

میرزا مەحموودی قازی پێنج بەرگ قورئانی مەجیدی بەخەتی خۆی نووسیوەتەوە. لەو قورئانانە یەکیان، لە لای دوکتور مستەفای شەوقی، کوڕی خوداڵێخۆشبوو حاجی قازی لەتیف بووە. نوسخەیەکی دیکەی خوداڵێخۆشبوو دوکتور شەوقی لە مووزەی ئەستەمبووڵ دیتبوو. نوسخەیەکیش لە مووزەی بریتانیا بووە لە لەندەن، دوو نوسخەکەی دی یەکیان لە لای خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، کوڕی قازی عەلی و ئەویدییان لە لای خوداڵێخۆشبوو حاجی مەلا کەریمی قازی کوڕی قازی مونعیم کوڕی قازی وەهاب بووە.(١) خوداڵێخۆشبوو حاجی مەلا کەریمی قازی جارێکیان گوتی خوداڵێخۆشبوو میرزا مەحموودی قازی حەوت قورئانی نووسیوەتەوە نەک پێنج.

میرزا مەحموود پلەی قەزاوەتی شەرعی مهابادی هەبووە و هەروەها لە موڵکی بەئیرس پێ براوی خۆی لە دۆستاڵی کشتوکاڵی کردووە و لە مهابادەوە بەسەری ڕاگەیشتووە.

خوداڵێخۆشبوو میرزا مەحموودی قازی کوڕێکی بووە، بەناوی محەمەد. ئەم کوڕە لە هەرەتی لاوێتیدا بەمەبەستی خوێندنی زانستی دینی چووەتە گوندی بێتووش. بێتووش لە بەشی ئالانی سەردەشت هەڵکەوتووە. لە ڕێگای ئەوێدا، لە نێوان سەردەشت و محاڵی بێتووش لە بناری کێوی هۆمل، محەمەد لەگەڵ فەقێیەکی دیکەی کە دۆست و هاوڕێی بووە دەکەونە بن ڕنووی بەفر و دەمرن. بەدوای ویدا میرزا مەحموود نامەیەک بۆ حاکمی سەردەشت بەنێوی زولفەقارخان دەنووسێ و کوڕەکەی کە بەمەبەستی خوێندن بەرەو ئەو ناوچەیە چووە دەناسێنێ و داوای لێ دەکا ئاگاداری تەواوی لێ بکا و چاوی بەسەر خوێندنییەوە بێ، هەروەها لە خەبەری سڵامەتیی وی ئاگەداری بکاتەوە. زولفەقار خان بۆ ئاگاداری لە وەزعی میرزا محەمەد سێ سوار دەنێرێ بۆ بێتووش، بەڵام هیچ سەرو سۆراغی ناکەن و بێ ئەوەی چییان دەست بکەوێ دەگەڕێنەوە سەردەشت، زولفەقار خان دیسان هەندێک سوارە دەنێرێ بۆ بێتووش و گوندەکانی دەوروبەری، ئەوجاریش

---

١- بژارکار (قادری فەتاحیی قازی) لە لای کاک یووسفی قازی، کوڕی خواڵێخۆشبوو حاجی مەلاکەریمی قازی قورئانێکی دەستنووسم دی، بەڕاستی زۆر بەرز و بەقیمەت بوو. بەدڵنیاییەوە، ئەوە هەمان نوسخەیە کە بابم ئاماژەی پێ دەکا.

ناردراوەکانی زولفەقارخان هەرچەندی دەگەڕێن، چییان دەست ناکەوێ تا ئەوەی لە وەرزی بەهاردا کە بەفر دەتوێتەوە، ئەو دەمی تەرمی محەمەد و هاوڕێیەکەی و کتێبەکانیان لە قەدپاڵی چیای هۆمل لە ناو گژوگیا و گوڵە وەحشییەکانی کوێستانێدا دەدۆزنەوە. زولفەقار خان کتێبەکان دەنێرێتەوە بۆ میرزا مەحموودی قازی و نامەیەکی سەرەخۆشی و دڵدانەوەی بۆ دەنێرێ و کارەساتەکەی بۆ دەنووسێ. شێخی سەعدی دەڵێ:

عجب نیست ازخاک اگر گل شکفت

کـه چندین گل اندام در خـاک خـفت

(سەیر نییە ئەگەر لە خاکەوە گوڵ دەپشکوێن، چونکە چەندین گوڵ ئەندام دەخاکدا نووستوون).

تەڵەبەی زانستی (دینی) کۆن لەو باوەڕەدابوون لە شوێنی خۆیان و لە نزیک کەسانی خۆیان، ئەو جۆرەی پێویستە ناتوانن دەرس بخوێنن و نزیکییان لە کەسوکار و بنەماڵە و پێوەندی و تێکەڵاویی جۆربەجۆر لەگەڵ کەسانی دەوروبەریان، ڕێ لە خوێندنیان دەگرێ. بۆیە، زۆرجار تەڵەبەکان دوای فێربوونی سەرەتای خوێندن، دەچوونە شوێنە دووردەستەکانی ئێران و تەنانەت وڵاتانی دیکەی ئیسلامییش. تەڵەبەکانی کوردستانی ئێران دەچوونە عێراق و ترکییە و قاهیرە و لەو شوێنانە خوێندنی خۆیان درێژە پێ دەدا و زۆر جار سەفەری ئەوان چەندین ساڵی دەخایاند و جاروبار لە کاتی خوێندندا لە غەریبایەتی سەریان دەناوە. جا هەر بەپێی ئەو داب و شوێنە بووە کە کوڕی میرزا مەحموودی قازی سەرەڕای بوونی زانا و عالمی زۆر و خانەی زانستیی گرینگ لە مهاباد و دەوروبەری، بەرەو بێتووش[1] چووە. ئەو دابە تا ئەم دوایانەش لە ناو تەڵەبەکانی زانستی دینیدا باو بوو. دوای ئەوەی سنوورەکان گیران، بڕا.

کاتێک کوڕی جەوانی میرزا مەحموودی قازی، بەو جۆرەی باس کرا، دەمرێ، نەخۆشیی کەوتوویی بەمهاباد و کوردستاندا بڵاو دەبێتەوە، خەڵکێکی زۆر پێی دەمرن. شاری مهاباد کەسی تێدا نامێنێ، دانیشتووەکانی یان دەمرن یان داڵدە دەبنە بەر گوند و چیاکانی دەوروبەر. لەبەر بڵاو بوونەوەی ئەو نەخۆشییە، گشت تاکوتەرای نێر و مێی، میرزا لەناو دەچن و میرزا مەحموود تەنها خۆی دەمێنێتەوە. ماڵی شوێنی دانیشتنی میرزا مەحموودی قازی هەر ئەو خانووە کۆنەیە کە لەڕۆژهەڵاتی ئیدارەی دوخانیات و ڕۆژئاوای سەرای سەید

---

١- مەدرەسەی زانستی دینی گوندی بێتووش لە مەدرەسەکانی زۆر بەناوبانگ و بەئعتیباری کوردستان بووە و عالمی زۆری لە خۆیدا پێگەیاندووە.

عەلی حوسێنی و باشووری ڕۆژهەڵاتی مزگەوتی قازی هەڵکەوتووە.[١]

میرزا مەحموود لەبەر تەنهایی و دەردی زۆری مردنی بەکۆمەڵی ئەندامانی بنەماڵەکەی، خانووەکەی خۆی بەجێ دێڵێ و لە حوجرەی مزگەوتی قازی[٢] کە هەر لە پێش هەمان خانووی شوێنی دانیشتنی خۆی بووە دادەمەزرێ. لەو سەروبەندەدا کە میرزا مەحموود گەیشتبووە تەمەنی پیری و لەشکری خەم و پەژارە و بێ کەسی لە هەموو لایەکەوە دەورەی دابوو، شەوێک لە خەونیدا دەبینێ کەسێک پێی دەڵێ: ئەی مەحموود زۆر پەرۆش و پەرێشانی، بەڵام دەست لە بەخشەندەیی خودا بەر مەدە، ئەگەر خوداوەند ژن و منداڵەکانی لە دەست ئەستاندی، دەتوانێ دیسان ئەولادت پێ ببەخشێ، بۆ ئەوەی ئەولادت ببێ دەبێ لەگەڵ کچی یەک لە شازادان زەواج بکەی و مزگێنیت دەدەمێ خودای گەورە و گران منداڵت دەداتێ و دەرد و کوێرەوەرییەکانت لە سەر سووک دەکا.

میرزا مەحموود لە ڕۆژێکی جومعەدا دوای بەجێهێنانی نوێژی جەماعەت لە مزگەوتی جامیعی مهاباد (بەمزگەوتی سوور بەناوبانگە) لە یەکێک لە حوجرەکانی مزگەوت کە بەئاسایی دوای نوێژکردن ژمارەیەک لە ڕدێن سپی و پیاو ماقووڵان لەوێ چەند دەقیقەیەک بەدەوری یەکترییەوە دادەنیشن و قسە دەکەن، وردە ڕیشاڵی خەونەکەی خۆی بۆ ئامادەبووان دەگێڕێتەوە و لەهەمان کاتدا ئەو خەون دیتنەی خۆی بەلاوە سەیر دەبێ و دەڵێ ئەمن کە پیرە پیاوێکی ڕۆحانیم لە کوێ لە دەستم دێ کچی شازادەیەک بهێنم و کچی شازادە چلۆن ئامادە دەبێ مێرد بەمنی هەژار بکا؟ هەرچەندی دەیهێنم و دەیبەم سەرەدەر لەو خەونەی خۆم ناکەم و ناوەرۆکی ئەم خەونە لەگەڵ وەزعی من ناخوێنێتەوە.

حاجی سەید عەزیزی گردک شانە (گردک شانە دێیەکە لە لاجانی مامەش کە ئێستاش ماوە) کە دۆستی میرزا مەحموودی قازی و میوانیشی بووە و لەو مەجلیسەدا ئامادە دەبێ و گوێی لە ناوەرۆکی خەونەکە دەبێ بەمیرزا مەحموودی قازی دەڵێ: ئەوەی لە خەونتدا پێیان گوتووی کچی شازادە بهێنە، مەبەست لە شازادە ساداتە کە ڕەچەڵەکی وان دەگاتەوە حەزرەتی ڕەسووڵی ئەکرەم (دروودی خودای لە سەربێ)، بۆیە پێویستە لەگەڵ کچی یەکێک لە سادات زەواج بکەی و پاشان دەڵێ من خۆم حەوت کچم هەیە، یەکێک لەوانت پێ دەبەخشم و ئەگەر بمکەیە وەکیل یەکیان کە لە هەموو ڕوویەکەوە لێوەشاوەیە و

---

١– بروانە کتێبی: سالهای اضطراب، بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازی، لاپەڕەی ٥٧

٢– بە لە بەرچاوگرتنی ئەو بابەتانەی لە لاپەڕەکانی دواتردا باس دەکرێن لەو ڕێکەوتەدا مزگەوتی قازی دروست نەکرابوو و یان لانی کەم تەواو نەبووبوو.

کەماڵ و جەماڵی زیاترە، بۆت هەڵدەبژێرم. میرزا مەحموود لەگەڵ پێخۆشبوون و سپاس لێکردنی ڕەزایەتی خۆی ڕادەگەیەنێ. حاجی سەید عەزیز دوای دوو سێ ڕۆژ مانەوە لە مهاباد دەگەڕێتەوە گوندی خۆی، گردک شانە.

لە دوای ڕۆیشتنی حاجی سەید عەزیز، میرزا مەحموودی قازی خەریکی ئامادەکردنی سەرەتاکانی خوازبێنی دەبێ و بریار دەدا بەپێی داب و شوێنی باو، چەند کەسێک لە عالمان و پیاوماقوولان ئامادە کا و بۆ بەڕێوەبردنی تەشریفاتی خوازبێنی بیاننێرێتە ماڵی حاجی سەید عەزیز لە گردک شانە.

ڕۆژێک لە پڕ، بێ ئەوەی ئاگەدار کرابێ، حاجی سەید عەزیز بەسێ چوار سوار و پیادەوە کە دوو لە سوارەکان جلوبەرگی ژنانەیان دەبەر دادەبێ و یەکێک لەوان ڕووبەندی سووری بەدەم و چاوییەوە دەبێ کە نیشانەی بووکە لە حەوشەی میرزا مەحموود دادەبەزن. میرزا مەحموود بەپیل میوانەکانەوە دەچێ، دوای بەخێرهێنان و هەواڵ پرسین، حاجی سەید عەزیز دەڵێ: بەپێی ئەو بەڵێنییەی پێم دابووی، کچەکەمم لەگەڵ خۆم هێناوە. میرزا مەحموود لە وڵامدا دەڵێ ئێوە بەو کارە هۆی شەرم و بەخۆداشکانەوەی منتان پێک هێناوە. من پێوەبووم چەند ڕدێن سپی و پیاوماقووڵ زەحمەت بدەم و بۆ خوازبێنی بیاننێرمە ماڵی ئێوە، ئێستا کە ئێوە بێ ڕاگەیاندنی پێشوو، کچەکەتان لەگەڵ خۆتان هێناوە لە ڕاستیدا هۆی شەرم و تەریقبوونەوەی منتان ساز کردووە. هەر چۆنێک بێ، میرزا مەحموود هەر ئەو دەمی کچەکە بەپێی شەرع بۆ خۆی لە خۆی مارە دەکا. ئەو کچە ناوی پەریخان بووە و پاشان بەناوی " نەنکە پەریخان" لە ناو بنەماڵەی قازیدا ناوی ماوەتەوە.

لە ڕووداوەکانی جێی سرنجی دەورەی میرزا مەحموودی قازی یەکیان ئەوەیە لەو زەمانیدا حکوومەتی ساوجبولاغی موکری ئیرسی و ئی بنەماڵەی خانزادەکانی تۆرمەی بداغ سوڵتانی موکری بووە. سەرای حکوومەتی خانزادەکان ئەو دەمی خانووی ئێستای ئیدارەی دوخانیاتی مهاباد بووە، خانووبەرەی ئێستای خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتتاحی قازی و برازاکەی خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم[1] کە لە باکووری ئیدارەی دوخانیات هەڵکەوتوون، ئەو زەمانی بەهاربەندی خانزادەکانی فەرمانڕەوای موکری بوون، بەپێی داب

١- ئەمن بژارکار خانووبەرەی خواڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازیم وەکو وێرانە دیوە و بەحەوشەکەیان دەکوت بەهاربەند، بەڵام خانووبەرەی خواڵێخۆشبوو قازی مونعیم شوێنی تێدا دانیشتن و ئاوەدان بوو و مەحکەمەیەکی بە سەفای هەبوو کە بەداخەوە رووخێندرا. خانووی قازی مونعیم حەوزخانەی هەبوو و ئاوی بن زەوی بەلای خوارووی ئەوێدا دەخوشی.

و شوێنی ئەو سەردەمی کە جەوانانی خانزادە زۆر جار ئێواران لە پێش سەرای حکوومەتی خەریکی غارە ئەسپ و ڕمبازێن بوون، بەڕواڵەت مەیدانی غارە ئەسپەکەیان پێ بەس نابێ و تەما دەگرن خانووبەرەی میرزا مەحمەوودی قازی و حەوشەکەی کە لای سووچی ڕۆژهەلاتی سەرای حکوومەتی بووە و بەڕادەی پێویست بەرین بووە بڕووخێنن و تەختی بکەن و وەسەر مەیدانی غارە ئەسپی خەن. بۆ جێبەجێکردنی ئەو کارە ولام دەنێرن بۆ میرزا مەحمەوودی قازی و ئاگاداری دەکەنەوە پێویستە هەرچی زووتر خانووبەرەکەی خۆی چۆل کا بۆ ئەوەی حاکمزادەکان بیڕووخێنن و مەیدانەکەیان بەرفرەوان کەنەوە.

میرزا مەحمەوود کە لەوزەی دانابێ ماڵێکی دی بۆ لێ ڕۆنیشتنی خۆی پەیدا کا، بەناچاری لە وەرزی پایز لەو پەڕی پەرێشانی و دڵشکاویدا بڕیار دەدا لە دەست زوڵم و زۆری حاکمەکانی سەردەمی سەرەڕۆیی هیجرەت بکا و سەری خۆی هەڵگرێ و بچێ بۆ خاکی عێراقی عەرەب. بەو مەبەستە دوو گوێدرێژ بۆ گواستنەوەی کەلوپەلی خۆی ئامادە دەکا و بەناوچەی مەنگوڕایەتیدا بەرەو سەرزەویی عێراقی عەرەب وەڕێ دەکەوێ. ناوبراو شەوێ لە دێی قەشقونە کە لە بەشی زێوەی مەنگوڕایەتی هەڵکەوتووە، لە ئاغەڵێکی مەڕ و دەوارانەدا ڕۆژ دەکاتەوە. ئاوەدانیی ناوبراو ئەو دەمی چۆل بووە و هیچ دانیشتووی نەبووە چونکو بەپێی داب و شوێنێک کە هێشتا دەناو عەشیرەتی مەنگوڕدا باوە، ئەوان هاوینان گوندەکان چۆل دەکەن و لە قەد پاڵی کوێستانی سەوز و زەنوێر و لە نزیک کانیاوان لە تاوڵاندا دەژین و خەریکی مەڕداری و پەز لەوەڕاندن دەبن، کاتێک هەوا سارد داگەڕا لە نێوەڕاست پایزێدا دەگەڕێنەوە گوندەکان.

عەیالی میرزا مەحمەوود سەیدزادە پەریخان کە دووگیان بووە لە دێی ناوبراو لە ئاغەڵی مەڕیدا دوو کوڕی ئاواڵدوانەی دەبێ. ناوی یەکیان دەنێن قاسم و ئەوی دوویەمیان عەبدوڵا. لەو ناوەدا هەندێک لە عولەما و پیاوماقووڵانی شاری، هیجرەتی میرزا مەحمەوودی قازی دەبیسن، بەکۆمەڵ دەچنە لای حاکم و پێملی دەکەن جارێ لە ڕووخاندنی خانووبەرەی میرزا مەحمەوودی قازی دەست هەڵگرێ و ئەو کارە وە دوایە بخا. حکوومەت قۆڵ لە سەر داوخوازی پیاوماقووڵان بۆ مۆڵەتدان بەمیرزا مەحمەوود دەکێشێ. چەند کەس لە عولەما و پیاوماقووڵانی شاری دەچن لە دووی میرزا مەحمەوودی قازی کە تا ئەودەمی لەبەر منداڵبوونی هاوسەرەکەی لە دێی قەشقونە بەناچاری مابووەوە و دڵی دەدەنەوە و بەحورمەت و ڕێزی پێویستەوە دەیهێننەوە بۆ شار و مەسەلەی ڕووخاندنی خانووەکە تا

دەمەو جێژنی نەورۆز دوادەخرێ. کاتێک زستان تەواو دەبێ و کەم کەم هەوا بۆ غارە ئەسپ لەبار دەبێ، دیسان کەسوکاری حاکم دەچنەوە سەر میرزا مەحموود و دەڵێن دەبێ بەلێبراوی لە ماوەی دوو شەو و ڕۆژدا خانووبەرەکە چۆڵ بکا تاکو وەستا و فەعلە بیڕووخێنن و بۆ مەیدانی غارە ئەسپ ئامادەی کەن.

میرزا مەحموود لەبەر ئەو گوشارە توندە و ئەو نارەحەتییە و لەبەرئەوەی هیچ جێگایەکی تری نابێ خۆی و خێزانی تێیدا بژین، پەنادەباتە بەر یەکێک لە حوجرەکانی مزگەوتی سوور بەناوی حوجرەی دەروێشە ڕەش. دەروێشی ناوبراو گۆیا دەروێشێکی هیندی بووە کە بۆ ماوەی دوورو درێژ لە حوجرەی ناوبراودا ژیاوە و خەریکی ریازەت کێشان بووە. میرزا مەحموود شەو و ڕۆژ لەو حوجرەیەدا خەریکی موناجات و نزا و پاڕانەوە لە خوداوەند دەبێ، شەوێک درەنگان، لای نیوەشەوێ، هەست دەکا کەسێک ئەوە خەریکە لە پلیکانەکانی حوجرە وەسەر دەکەوێ. میرزا مەحموود دەرکەی حوجرە دەکاتەوە. تازەهاتوو بەفری سەر جلوبەرگەکەی دەتەکێنێ، دوایە دێتە ناو حوجرەوە. میرزا مەحموود دەبینێ ئەو تازەهاتوویە حاجی سەید عەزیزی خەزووریتی. میرزا مەحموود دەڵێ: بەو درەنگانە و بەو بەفر و بۆرانە بۆچی هاتووی و زەحمەتت وەبەر خۆت ناوە؟ حاجی سەید عەزیز دەڵێ: بۆ کۆمەک و یارمەتیدانی ئێوە هاتووم؛ چونکو دەمزانی زۆر پەرێشان و شپرزەن، ئێستا بەلوتفی خودا مەترسی ڕەوییوەتەوە، حاکمی زاڵم بەدەردی خۆی گرفتار بووە، لەبەر زیادەڕۆیی لە شەراب خواردنەوە و کەوتنەخوارەوە لە پەنجەرە مردووە. هەستن بابچینەوە ماڵێ. هەر ئەو دەمی هەر دووکیان بەخۆشحاڵی و دڵکراوەیی دەچنەوە ماڵێ.

بۆ بەیانی ئەو ڕووداوە دوای شین و شەپۆڕ و ناشتنی تەرمی حاکم، کەسوکار و لەدوابەجێماوانی حاکم کە ئاگایان لە ڕەنج و مەزلوومییەتی میرزا مەحموودی قازی بووە، ئەو ڕووداوە چاوەڕواننەکراوە بەخواگیر بوون لێک دەدەنەوە و لە کردەوەی زۆردارانەی خۆیان پاشگەز و پەشیمان دەبنەوە و لە ترسی ئەوەی نەکا ئەو جۆرە بەڵایانە دووپاتە ببنەوە، بۆ داوای لێبوردن دەچنە لای میرزا مەحموود و خەڵاتی دەکەن و داوای لێ دەکەن گەردنیان ئازاد کا.(١) بەم پێیە مەسەلەی ڕووخاندنی ماڵی میرزا مەحموود هەڵدەوەشێتەوە.

میرزا قاسمی قازی و میرزا عەبدوڵا کوڕانی میرزا مەحموود دوای تەواوکردنی

---

١- گەردنی کەسێک ئازادکردن لە زمانی کوردیدا یانی حەڵاڵکردنی و لە گوناه خۆشبوونی.

خـوێندنی زانسـتی دینی و کـۆچی دوایی بابیـان هەردووکیـان پلەی قـەزاوەت بەدەست دەهێنن کـە ئێـرسـی و تەرخـانی ئەو بنەمـاڵەیە بووە. گـوندەکـانی دۆسـتـاڵی، قـارنجـە، گردیاقوب، چەقەڵ مستەفا، هەروەها باخی حـاجی خدر[1] و باخی مکایلی[2] ئی ئەوان بووە. هەر دوو برا بنیاتنەری مزگەوتی ئێستای قازی لە مهاباد بوون.

مزگەوتی قازی پێشتر حەوشـەیەکی بەرێژە گەورەی هەبوو و دوو حوجرەی تێدا دروست کرابوو. پاشان لە سەردەمی ڕەزا شادا بەشی سەرەکیی حەوشەکەیان وەسەر خانووبەرەی ئێستای ستادی تیپی مهاباد خست. لەو دوایانەدا شارداری (شارەوانی)ی مهاباد هەر لەو خـانووبـەرەیەدا دامـەزراوە. مـزگـەوتی قـازی لە سـاڵی ١٣٤٩ (ی هـەتاوی) لە بنـاخـەوە ڕووخێندرا و بەهیممەتی تاکوتەرای بنەماڵەی قازی لە سەر ڕا دروست کراوەتەوە.

ئەو مزگەوتە پێشوو هەیوانێکی دڵنیشینی هەبوو دەیڕوانییە باخەکانی باکوری شاری و چۆمی مـهـابادێ، لە بن هەیوانەکە دوو حـەوزخانە هەبوون کە بەدەرگایەک ڕێگایان بەرەو یەکدی هەبوو، حەوزخانەی یەکەمیان گەورە بوو و ئەویدییان پچووکتر، مزگەوتەکە ئاوی ژێر زەویی هەبوو کە لە باشوورەوە واتە بەژێر بینای دوخانیاتدا دەهات و کەمێکیش سوێر بوو. ئاوی حـەوشـەی خـودالێخـۆشـبـوو قازی مـونعـیم و ئاوی حەوشـەی کـۆن و بەرین و خـێـزانداری ئێـمـەش هەر لەو سـەرچاوەیەوە بوو. دواتر ئاوی حـەوشـەی ئێـمـە لەبەر پڕبوونەوەی بەستێنی لە ژێر زەویدا، بڕابوو.

حـەزرەتی مـەولانا خـالیدی ڕۆمی[3] کە لە عـارفـان و مـەشـایخی کـوردسـتـانە، بەر لەوەی بچێتە لای شێخ عەبدوڵڵای دێهلەوی لە هیندسـتان، دێتە مهاباد دوو شـەو لە باخـی ناسراو

١- کاک میـرزا مەنافی شـافیـعی کوڕی خوالێخۆشـبوو میرزا مارفی شـافیـعی ڕایگەیاند: ئەو باغەی ڕووبەڕووی باغی مکایلی (لەوبەری چۆمی) هەڵکەوتووە، باغی حـاجی خدری بووە. حاجی خدر باپیری خوالێخـۆشبـوو حاجی مـیرزا ڕەحـمـەتی شـافیـعی بووە. حـاجی مـیرزا ڕەحـمـەت لە سێـزدەهەمی خـەرمانانی سـاڵی ١٣٣١ (ی هەتاوی) کـۆچی دوایی کـردووە. گۆڕسـتـانی مـەلا جامـی لە مـهاباد بە قەڵەمی نووسـەر (قادری فەتاحی قازی)، لاپەڕەی ٢١، پەراوێزی ٣

٢- باخی مکایلی لە خوار سەدی مـهاباد هەڵکەوتووە. خـاوەنی دوایی بەشێک لە باخـەکـە، بابم بوو. باغی مکایلی لە کۆنەوە شـوێنی گەشت و گەڕان و ڕابواردنی خـەڵکی مـهاباد بوو. لەم دواییـیانەدا ئەو باغە بوو بە موڵکی شارداریی مهاباد بۆ ئەوەی گەڕانگەیەکی گشتی لێ ساز بکا. لەبەر ئەوەی باغی مکایلی بۆ کەلک لێوەرگرتنی گشـتی دەکار دەکردرا بابم بە برێکی کەم کە لەلایەن شارداریـیەوە پێی پێشنیاز کرا قوڵی لێ کێشا و بەشی خۆی دا بە شارداریی مهاباد بە مەبەستی کەلک لێوەرگرتنی گشتی.

٣- بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە، ژمارەی ٣

بەباخی گوێزێ[١] و شەوێک لە حوجرەی مزگەوتی قازی کە ڕووی لە باکور و گۆشەی ڕۆژئاوای مزگەوتەکە بوو، ماوەتەوە. نووسەر و براکەم حەسەنی فەتاحی قازی لەو حوجرەیەدا خەریکی خوێندن بووین کە شەرحی وی بەجوێ دەنووسرێ.[٢]

میرزا عەبدوڵڵای قازی کە ئەو کاتی جەوان[٣] و یەکجار زۆر بەئیمان بووە تکا لە مەولانا دەکا لەگەڵ خۆی بیبا بۆ سەفەری هیندستان بەلام برا گەورەترەکەی میرزا قاسم کە پێی خۆش نەبووە براکەی ئەو سەفەرە بکا، بەمەولانا خالید دەڵێ لەگەڵ خۆیدا نەیبا. لە لایەکی ترەوە میرزا عەبدولا بۆ چوونی هیندستان پێکێشی دەکا. مەولانا خالید بۆ ئەوەی میرزا عەبدولا لە چوونی هیندوستان پاشگەز کاتەوە، یەکێک لە دێوانەکانی هاورێی خۆی ناچار دەکا[٤] بەئانقەستە سووکایەتی و گاڵتە بەمیرزا عەبدولای قازی بکا بۆ ئەوەی هەستی بورووژێنێ و دڵسارد و نائومێدی، کا. دێوانەی ناوبراویش ئەو کارە دەکا. لە ئاکامدا میرزا عەبدولا بەدڵشکاوی سکالا دەباتە بەر قوتبی عارفەکان مەولانا خالید. مەولانا خالید بزەیەکی دێتێ و لە وڵامدا دەفەرموێ لەبەرئەوەی براکەت میرزا قاسم ڕازی نییە ئەتۆ بۆ ئەو سەفەرە لەگەڵ ئێمە بکەوی، بۆیە دێوانە گاڵتەی پێ کردووی و دڵی ئێشاندووی. ئێستا کە برایەکەت ڕازی نییە بەسەفەری تۆ، حەق وایە ڕێز لە بۆچوونی بگری و گوێڕایەڵی بی. میرزا عەبدولا قۆڵ لەسەر ئەمری برایەکەی دەکێشێ، کاتی دەرکەوتنی مەولانا لە ساوجبولاغ، تا دێی کولیجە کە لە سی کیلۆمیتری ڕۆژهەلاتی سابلاغ هەڵکەوتووە لەگەڵی دەچێ. مەولانا و میرزا عەبدولا یەک دوو شەو لە دێی کولیجە لە ماڵی سەید کاکەجان میوان دەبن[٥]. دوای ڕۆیشتنی مەولانا خالید لە کولیجە، میرزا عەبدولا دەگەڕێتەوە سابلاغێ.

---

١- باخی گوێزێ لە خوارەوەی تەپەی تابانی (باکووری مهاباد) هەڵکەوتبوو. ئێستا لە نێوچووە و لەوێ خانووبەرە دروست کراوە.

٢- سالهای اضطراب، بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازی، لاپەڕەی ٥٨

٣- بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە، ژمارەی ٤

٤- بە دوای ئەم ڕستەیە دا بابم، دێوانە ئاوا شی دەکاتەوە: دێوانە بە کوتەی ئەهلی عیرفان موریدی حاڵ ورووژاون کە لە ئەوین و خۆشەویستی لە ئاست مورشیدی خۆیاندا هەمیشە لە حاڵی جەزمبوونی بەردەوام دان و دۆخێکی وەک شێتی و مەستی پەیدا دەکەن.

٥- بە دوای ئەو ڕستەیەدا بابم لێی زیاد دەکا: ئێستا مەزرایەک لە کولیجە بە نێوی سەید کاکە جان بە نێوبانگە و چاکێکیش هەر بەو نێوە هەیە لە سەر ڕێگایەکەوە کە لە کولیجەوە بەرەو سەهۆڵان، قادراوا، نیسکاوا و خانەقای شەرەفکەند دەچێ.بابم ئەو ڕستەیەی لە نێو کەوان داناوە.

میرزا عەبدوڵا لە سەفەری حیجاز کە بەمەبەستی بەجێهێنانی فەریزەی دینی دەچێتە حەج، لە دەریای ئەحمەڕ دەکەوێتە بەر بەزەیی خودا و گیان لە دەست دەدا و بەوجۆرەی کە داب بووە لە ناو کەشتی ڕا تەرمەکەی لە ئاوی دەریا داوێژن! لەو سەفەرەدا میرزا عەبدوڵا حاجی خانمی خوشکی(١) و حاجی عەبدولرەحیمی کوڕی و حاجی خەلیلی نەوەی خۆی (باپیری نووسەر) لەگەڵ دەبێ کە منداڵێکی پچووک بووە و کاتێک باپیری ویستوویە بچێتە سەفەری حیجاز بەگریان و شیوەن گرنەی گرتووە دەبێ لەگەڵ خۆی بیبا.

بەگوێرەی بەڵگەیەکی وەقفنامە کە بەهەڵکەوت بەدەست نووسەری ئەم یادداشتانە گەیشتووە و ئێستا لەبەر دەستانە، خوداڵێخۆشبوو میرزا عەبدوڵای قازی سێ لەیەکی بەشی خۆی لە کاروانسەرا و باخێک لە مەزرای مەحموودکان جگە یەک لە دەی نەبێ کە کردوویەتە وەقفی گشتی، وەقفی کوڕی خۆی کردووە کە لە حوور جیهان خانم، کچی مەحموود بەگ، کوڕی شێخ‌عالی خانی حاکمی موکری بووە. ڕێکەوتی وەقفنامەکە ڕەبیعوئەوەلی سەنەی ١٢٣١ی کۆچی مانگییە. وەقفنامەکە ئاوایە:

هوالباقی، مخفی و پوشیده نماند که عالی جناب میرزا عبدالله قاضی حصهء خود را از کاروانسرا که عبارت از ثلث باشد و از باخ که واقع در مزرعهء محمودکان است سوای یک عشر او که وقف عام نموده از اولاد ذکور عصمت پناه حور جهان خانم که از نسل خودم باشد، بنت محمود بیگ خلف مرحوم عالیجاه شیخ علی خان حاکم موکری وقف نمودیم به سه روز قبل از وفات خودش الا علی فالاعلی الاول فالاول وقفا صحیحا شرعیا لاتباع و لاتوهب و لاترهن فمن بدله بعد ما سمعه فانما اثمه علی الذین یبدلونه تحریرا فی شهر ربیع الاول سنه ١٢٣١.

(هەر ئەوە کە دەمێنێتەوە - شاراوە و نهێنی نەمێنێتەوە کە جەنابی بەرز میرزا عەبدوڵای قازی بەشی خۆی لە کاروانسەرا کە بریتییە لە یەک لە سێ و لەباخ کە لە مەزرای مەحموودکان هەڵکەوتووە جگە لە یەک لە دەی ئەو بەشە نەبێ کە کردوویەتە وەقفی گشتی، وەقفمان کردە ئەولادی نێرینەی دەپەنای پاکیدا حوور جیهان خانم کە لە وەجی خۆمە کچی مەحموود بەگ کوڕی خوداڵێخۆشبووی جێ بەرز، شێخ‌عالی خانی موکری بەسێ ڕۆژ بەر لە وەفاتی خۆی. نووسرا لە

١- بابم ڕوونی نەکردووەتەوە - خوشکی میرزا عەبدوڵا ناوی چ بووە.

مانگی ڕەبیعوئەوەلی ساڵی ١٢٣١).

لە پەراوێزی وەقفنامەی ناوبراودا، نەزر نامەیەکیش بەم شێوەیەی خوارەوە هاتووە:

البایع الناذر عالیشأن محمود بیگ خلف مرحوم شیخ علی خان موکری. المشتری المنذورلهاعلیا جناب قمرنقاب حوری جهان خانم بنت بایع مزبوره که در متن مسطور است. الثمن مبلغ شانزده (در متن شازده) تومان رایج ساوجبلاغ که نصفه تاکیدا للاصل مبلغ صد ریال فتحعلی شاهی است. المبیع یک باب دکان واقع در راسته بازار محدوده بەحدود اربعه حد اول شرقیا دکان علی کچل غربیا دکان عبدالله قبلیا دکان سید قادر بعده خانهء میر حسین و بینهما عقد مبایعهء صحیحه مشتمل بر ایجاب و قبول و جمیع ارکان معتبره جاری گردید. فبذلک خرج من ملکیه البایع و انتقلت الی المشتری.

(فرۆشیاری چاوەدێر جێ بەرز مەحموود بەگ کوڕی خوداڵێخۆشبوو شێخاڵی خانی موکری. کڕیاری نەزرپێ کراو جەنابی قەمەر نیقاب حۆری جیهان خانم کچی فرۆشیاری کە لە دەقدا نووسراوە. قیمەت بڕی (لە دەقدا شازدە) تمەنی بەبرەو لە ساوجبولاغ کە نیوەی بە لە دووەدانی ئەسڵ سەد ڕیاڵی فەتەلی شایە. ئەوەی کڕدراوە چاوەیەک دووکان کە لە ڕاستە بازاڕ هەڵکەوتووە و چوار سنووری بریتین لە لای ڕۆژهەڵاتەوە دووکانی عەلی کەچەڵ، لە لای ڕۆژئاواوە دووکانی عەبدوڵا پێش لە دووکانی سەید قادر، دوایە ماڵی میرحوسێن و لە نێوانیاندا گرێبەستی کڕینی ساز درا بریتی لە هەموو ئیجاب و قەبووڵێک و گشت بنەماکانی و، بەو شێوەیە ئەوە لە موڵکییەتی فرۆشیار دەرچوو و ڕاگوێزرا بۆ کڕیار.)

مۆرەکانیش بەو شێوەیەی خوارەوەن:[1]

١- لا اله الا الله الملک الحق المبین عبده بوداق (مۆرەکە چوارگۆشەیە تەقریبەن بەشکلی دووجا).

٢- لا اله الا الله عبده عبدالله (من المطلعین علی مافیه الحقیر ابن عبدالصمد عبدالله).

٣- اللهم صل علی محمد و آل محمد (من المطلعین علی مافی ضمن المزبور محمد بن رسول المدرس).

---

١- زانیارییەکانی لەمەڕ مۆرەکان لەلایەن بژارکار (قادری فەتاحی قازی) وە ناسێندراون.

٤- یا رسول الثقلین ١٢٢٦ (من المطلعین علی ما فیه الحقیر رسول المدرس بساوجبلاغ)

٥- افوض امری الی الله عبده عبدالله (و قد جری هذا الوقف العبد الحقیر عبدااله الواقف)

٦- لا الهالا الله عبده... الله (مۆرەکە هێلەکەییە. لە خوارەوەی لای ڕاستی ناخوێندرێتەوە)

٧- العبد قاسم (بەڕواڵەت مۆری میرزا قاسمی قازی برا گەورەی میرزا عەبدوڵایە)

بەڕواڵەت میرزا عەبدوڵای قازی ژنێکی دیکەیشی هەبووە لە بنەماڵەی بداغ سوڵتان بەناوی خونچە خانم کچی عەبدوڵا خانی موکری. میرزا عەبدوڵای قازی لە حوری جیهان خانم یان لە خونچە خانم دوو کوڕی هەبووە بەناوی میرزا ڕەحمان و حاجی عەبدولرەحیم[1] و لە ژنێکی دیکەی بەناوی فەرەنتی و بەڕواڵەت سەر بەعەشیرەتی ماوەت چوار کوڕی هەبووە، بەم نێوانەی خوارەوە:

١- مەلا عەبدولەلیک توختە

٢- میرزا مۆئمین

٣- مەلا قودووس

٤- مام ئەمین

میرزا ڕەحمانی قازی کەسێکی عالم و زانا بووە، بەتایبەتی زۆر خەت خۆش بووە. ناوبراو لە مهاباد - پیشەی قەزاوەتی هەبووە و هەروەها چەند بەرگ قورئانی مەجیدی بەخەتی جوانی خۆی نووسیوەتەوە. نووسەر قورئانێکم بەخەتی میرزا ڕەحمانی قازی هەیە لە ساڵی ١٢٧٩ی کۆچی مانگی لە گوندی دۆستاڵی نووسیویەتەوە. بەڕاستییش مرۆ لە دیتنی ئەو خەتە جوانە ڕۆحی شاد و تازە دەبێتەوە.[2]

حاجی عەبدولرەحیم لە زانستی پزیشکیی کۆندا زانیاری و ئەزموونی زۆری هەبووە، کارامەییی بەڕادەیەک بووە، دەڵێن تەنانەت نەخۆشیی گولی و نەخۆشییە بەمەترسییەکانی دیکەی بەگیا و بەهاراتی نەریتی تیمار کردووە. ناوبراو لە گوندی دۆستاڵی بەلێکۆڵینەوەی پزیشکی و کشتوکاڵەوە خەریک بووە.

مەلا عەبدولەلیک کەسێکی عالم و خۆش خەت بووە و خوێندنی خۆی لە عێراق (ڕەواندز و کۆیە) تەواو کردووە. بابم خوداڵیخۆشبوو ڕەسووڵی فەتاحی قازی دەیگوت. زۆر منداڵ بووم، مەلا مەلیک بە ئێمەی منداڵی بنەماڵەکەی دەگوت: بابیلە کاتێک من لە غەریبایەتی

---

١- بڕواننە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ٥

٢- ئەو قورئانە ئێستا لە لای برام کاک سمایلی فەتاحی قازییە.

دەمخوێند، زۆر جار لە کوتە جیرە نانێک زیاتر نەبێ هیچی ترم نەبوو: نیوەییم بەڕۆژ دەخوارد ئەو یدیکەشم لە قەڵەمدانەکەم[١] دەنا بۆ شەوێ[٢]، بەو پێیە درێژەم بەخوێندن دەدا، ئێستا کە ئێوە وەسیلەی خوێندنتان هەیە کوا ئەوە ئینسافە کاتی خۆتان بەفیڕۆ دەدەن و ناخوێنن؟

مەلا مەلیک کەسێکی بێ ئازار و دەروێش مەسلەک بووە و زیاتر خەریکی کاری باخەوانی و کشتوکاڵ بووە. مەشهوورە دەڵێن مەلا مەلیک لە فکری گرتنی جندۆکانیشدا بووە و بۆ ئەو مەبەستە چووەتە ئەشکەوتی کێوی باخی مکایلی و لەوێ بەسەعاتان وێردی کردووە و پاڕاوەتەوە. وا بڵاو بووتەوە لە مەزرایە هاواری لە جووتی کردووە کوتەک بکوتە، ئاموورەکەش لەخۆوە وەجووڵە کەوتووە و بەرد و کوڵۆی ناو مەزرایەی کردووەتە خاکێکی نەرم.

میرزا ڕەحمانی قازی خاوەنی پێنج کوڕ بووە، بەم ڕیزەی خوارەوە:

١- قازی قادر[٣]

٢- مەلا لەتیف

٣- حاجی خەلیل

٤- میرزا جەلیلی باخچەی

٥- میرزا عەزیز

شەش دانگی دێی باخچە و سەرباخچە لە مەحاڵی یەڵتەمر، ئی ئەوان بووە. قازی قادر

---

١- لە دەقدا نووسیویە لە قەڵەمدانم...

٢- بەدوای ئەو ڕستەیەدا بابم لێی زیاد کردووە: لە زەمانی کۆن قەڵەمدان لە جیاتی دەوات و قەڵەمی ئێستا باو بوو و بریتی بوو لە مەحفەزەیەکی پچووک لە مقەبا یان داری گوێز و دەنێویدا مەحفەزەیەکی دیکە هەبوو کە قاپیلکەیەکی پچووک لە زێو یان برینجیان تێ دەنا بە نێوی حۆققە. برێک مەرەکەبی ڕەش لە دوودەی نەوت یان شتی دیکە ساز دەکرا، لەو قاپیلکەیان دەکرد و هێندێک بەنی ئاوریشمیان تێوە دەدا و چەند دار قامیش و قەڵەمتراش و مەقتەعێک و میقرازێک و سوانەیەکیان لە قەڵەمدانەکە دەنا. و قەڵەمدانەکەیان لە پارچەیەکەوە دەپێچا. نووسەران لەبەر پشتێندی خۆیان دەنا و بۆ هەر کوێیەک چووبان پێیان بوو.

٣- بەپێی نامەیەک کە ماکەکەی لە لای برام کاک سمایلی فەتاحی قازییە (بەڕواڵەت ئەو نامەیە بۆ وەلیعەهد نووسراوە) قازی محەمەد کوڕی گەورەی قازی قادر بووە. نامەکە بریتییە لە گوزارشتی کۆچی دوایی قازی قادر بە وەلیعەهد. وڵامی نامەکە لە پەراوێزدا نووسراوە و ڕێکەوتەکەی ٢٨ی مانگی جمادی اولی ١٣١٦ ی (کۆچی مانگی) یە.

لەگەڵ ئەوەشدا پلەی قەزاوەتی هەبووە، خوێندەواریی کەم بووە و کاری لە مەڕ قەزاوەتی بەیارمەتیی برایەکەی مەلا لەتیف و دوو کەس لە عالمانی تر کە زۆرجار لە مەحکەمە لە لای بوون، ڕاپەڕاندووە. قازی قادر کەسێکی زۆر دەستبلاو و لەسەرەخۆ و ئازا و خۆ پارێز و بەتەقوا بووە. ناوبراو لە لای کاربەدەستان و هەروەها لەلای خەڵک حورمەتێکی تایبەتی هەبووە. قازی قادر لەگەڵ سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچە و هەروەها لەگەڵ شێخەلیسلام و عالمانی دەرەجە یەکی تەورێز پێوەندیی دۆستانەی هەبووە.

کێشەی شێخ عوبەیدیلا و قەتڵی هەمزاغای مەنگوڕ لە زەمانی ژیانی قازی قادردا قەوماون.

بە فەرمانی شازدە ئەحمەد میرزای کێشکچی باشی[1] لە سەرای حکوومەتی[2]دا تەقە لە هەمزاغای مەنگوڕ و کەسوکاری دەکەن، و چەند کەس لە خزمان و نۆکەرانی هەمزاغا دەکوژرێن و تەرمەکانیان لە حەوشەی حکوومەتدا بەجێ دەمێنێ، بەڵام هەمزاغا خۆی و چەند کەسی دیکە لەو داوە بەسلامەت ڕزگاریان دەبێ، هەر بەدوای دەرباز بوونی ئەواندا، فەڕاشەکان دەرگای بینای حکوومەت گاڵە دەدەن. هەمزاغا بۆ وەرگرتنەوەی تەرمەکان لە خانووی حکوومەت دوور ناکەوێتەوە و دەستبەجێ یەکێک لە نۆکەرەکانی خۆی بەدوای قازی قادردا دەنێرێ. قازی قادر کە لەگەڵ هەمزاغا دۆستایەتی و سەمیمییەتێکی زۆری دەبێ، دەستبەجێ بۆ پێشگیری لە قەتڵ و کوشتار دەچێتە لای هەمزاغا. هەر کە هەمزاغا قازی قادر دەبینێ، دەڵێ: جەنابی قازی، نەڵێی هەمزە ترساوە، سوێندم بەسەری تۆ ئەو سەبیلەی بەدەستمەوە دەبینی، هەر هەمان سەبیلەیە لە سەرای حکوومەتی بۆیان پڕ کردمەوە و هێشتاش خەریکم دەیکێشم. دەیانویست بەزۆر زنجیرم، کەن و وەک شێتان دەست و لاقم ببەستن، ئێستا داوات لێ دەکەم تەشریفت بچێتە لای حاکم و پێی بڵێی هەمزە بێ مەیتی کەسوکاری خۆی ناڕوا و ئەگەر مەیتەکان نەداتەوە، بەخۆم لە دیواری ڕا لێی وەسەر دەکەوم و ئەودەمی خۆم دەزانم و ئەو.

خودالێخۆشبوو قازی قادر لەو ڕووداوە زۆر پەرۆش دەبێ و خەم و پەژارەی خۆی دەردەبڕێ و تکا لە هەمزاغا دەکا تا دەچێتە لای حاکم و وڵام دێنێتەوە، هیچ نەکا، هەمزاغا

---

١- تاریخ و جغرافی دار السلطنهء تبریز، تالیف شاهزاده نادر میرزا، چاپ سنگی، ص ٣٢٦. نگاهی بەتاریخ مهاباد، ص ٩٠: لطفعلی میرزا...

٢- سەرای حکوومەتی هەر هەمان ئەو خانوویەرە گەورەیەیە کە لەرۆژئاوای مزگەوتی شا دەروێش هەڵکەوتووە و ئێستا بەچەندین خانووی نوێ دابەش کراوە.

قۆڵی لە سەر دەکێشێ. خودالێخۆشبوو قازی قادر، دەچێتە سەرای حکوومەت و لە دەرگا دەدا و بەفەڕاشەکان دەڵێ بەحاکم بڵێن قازی قادر هاتووە، حاکم کە لە سەرنەکەوتنی خۆی و زیندوو مانەوەی هەمزاغا هەراسان و نیگەران بووە هاتنی قازی قادر بەنیعمەتێکی ئاسمانی دادەنێ و دەستبەجێ فەرمان دەدا بیهێننە ناو سەراوە. قازی دەچێتە لای حاکم و زۆری سەرکۆنە دەکا بۆ ئەو کردەوە نگریس و ناعاقڵانەیە. حاکم پێی دەڵێ هەرچۆنێک بێ من لە دەست ئەو غووڵە بیابانییە ڕزگار کە. خودالێخۆشبوو قازی قادر پێی دەڵێ: هەمزاغا تەنێ مەیتی کەسوکاری خۆی دەوێتەوە. حاکم قۆڵ لە سەر دانەوەی مەیتەکان بەهەمزاغا دەکێشێ و تا بردنە دەرەوەی تەرمەکان و دوورکەوتنەوەی هەمزاغا قازی قادر لە لای خۆی ڕادەگرێ. هەمزاغا مەیتەکان داوێتە سەر پشتی ئێستر و فەرمان دەدا سێتەپڵ لێ دەن و بەمەیتەکانەوە جارێک بەدەوری شاریدا دەگەڕێ و دوایە بەرەو ماڵی خۆی لە گوندی دێبۆکر دەچێتەوە. هەمزاغا بەدوای ئەو ڕووداوەدا بێ پسانەوە لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان لە لێ دە و بخۆدا دەبێ و شارەدێی سەردەشت تالآن دەکا.

مەحکەمەی قازی قادر هەمیشە لە میوان جمەی هاتووە، بەڵام ناوبراو داهاتێکی ئەوتۆی نەبووە و بەشی خەرج و مەسرەفی نەکردووە، لەبەر ئەوە نۆکەرەکانی قازی قادر بۆ حاواندنەوە و بەخێوکردنی میوانان زۆر جار کەلوپەلەکانیان لە بازاڕ بەگرێو داناوە و قازی قادر هەمیشە بەبازاڕییەکان قەرزدار بووە. میرزا جەلیلیش کە برای پچووکی بووە نەک ئەوەی لە داهاتی دێی باخچە هیچی نەداوەتێ بەڵکو هەرکاتێکیش هاتووەتە شاری شتێکیشی بەدەستی لێ وەرگرتووە.

ڕۆژێک کابرایەک بەناوی مەلا ئەحمەد کە بانگدەر و نابینا بووە، دەچێتە مەحکەمەی قازی قادر و دەپرسێ: ئەمڕۆ بۆ نانی نیوەڕۆ چتان هەیە؟ وەڵامی دەدەنەوە ئەمڕۆ شتێکی ئەوتۆ لێ نەندراوە و سفرە و خوان لەنگە. مەلای ناوبراو برێک دە فکرەوە دەچێ و دوایە دەڵێ خودا ڕزق دەدا و بەدڵنیاییەوە شتێک دەگەیێنێ. پاشان بەنۆکەرەکانی قازی دەڵێ: ئەگەر کابرایەکی دەوڵەمەند بەم دەوروبەرانەدا تێ پەڕی زوو ئاگادارم کەن. بەهەڵکەوت لەو دەمەدا سەید کەریمی نەقیب کە لە توێژی ڕۆحانی و لە خاوەن مولکانی پارەدار بووە، بەپێش مەحکەمەی قازی قادردا تێ دەپەڕێ و بەرەو مزگەوتی قازی دەچێ کە لەوێ نزیکە. نۆکەرەکان مەلا بانگدەرەکە ئاگادار دەکەن سەید کەریمی نەقیب هەر ئێستا بێرەدا تێ پەڕی. مەلا ئەحمەد لە زمان قازییەوە فەرمان دەدا بانگی کەن بۆ مەحکەمە. نۆکەرەکان دەستبەجێ بەدوویدا دەچن و بانگی دەکەن بۆ لای قازی. کاتێک سەید کەریم دێتە ژوورێ و

دادەنیشێ مەلای بانگدەر ڕووەو سەید کەریم دەڵێ ئەمن شتێک دەزانم، ئەگەر پێت بڵێم و فێری بی، بەئەندازەی سەد هەزار تمەن قازانجی بۆ تۆ تێدایە. ئامادەبووانی مەجلیسیش بەپێی قەرارو بڕیەیەکی پێش هاتنی دایان نابوو، زۆر بەجیددی لە دووی قسەکانی مەلا ئەحمەد دەدەن. سەید کەریمی نەقیب دەڵێ: باشە بفەرموو ئەوە چییە بەپێی قسەی جەنابت سەد هەزار تمەن دێنێ ؟ مەلا ئەحمەدی بانگدەر لە وڵامدا دەڵێ، گوتنی شتێکی وا گرینگ ئەوەندەش سەهل و ئاسان نییە، جارێ لە پێشدا پێنج تمەنم حەقی زەحمەت بدەیە تا عەرزت بکەم. سەید نەقیب بڕێک ڕادەمێنێ و دەبینێ ئەوە سەودایەکی خراپ نییە بەدانی پێنج تمەن سەد هەزار تمەن قازانج بکا. بەدوای ئەوەدا دەست دەبا بۆ گیرفانی و دراوەکە دەردێنێ و دەیدا بەمەلای بانگدەر. مەلاش دراوەکەی لێ وەردەگرێ و دەیدا بەیەکێک لە فەڕاشەکانی قازی و دەڵێ بڕۆ بەو پارەیە خواردنێکی باش ئامادە بکە و بیهێنە. پیاوەکە دراوەکە وەردەگرێ و دەچێ بۆ بازاڕ و بەو پارەیە هەرچی پێویست بووە دەیکڕێ و دەگەڕێتەوە[1] سەید نەقیب دەڵێ: باشە ئێستا کە پێنج تمەنەکەم دایەی بۆچی شتەکەم پێ ناڵێی ؟ مەلا وڵامی دەداتەوە جارێ برسیمانە دوای فراوین خواردن مەسەلەکەت پێ دەڵێم و ئەتۆش مەڕۆ و نانمان لەگەڵ بخۆ. سەید نەقیب قۆڵی لێ دەکێشێ و لە مەحکەمە نان دەخوا. دوای نانخواردن مەلای بانگدەر ڕوو لە سەید نەقیب دەکا و دەڵێ: جەنابی نەقیب ئەو شتەی بەڵێنم پێ دابووی پێت بڵێم، ئەمەیە جوانت گوێ لێ بێ، ئەی ئامادەبووانی مەجلیس ئێوەش شاهید بن و ببینن داخوا ئەو شتە بۆ جەنابی نەقیب سەدهەزار تمەن زیاتر دەهێنێ یان نا. دوایە دەڵێ جەنابی ئاغای نەقیب بڵێ: اشهد ان لا الە الا اللە و اشهد ان محمدا رسول اللە. سەید نەقیب بەدوای ئەوەدا لەوپەڕی نارەحەتیدا مەجلیسەکە بەجێ دەهێڵێ.

بەڵام سەبارەت بەمیرزا جەلیل، دەبێ بڵێم - میرزا جەلیل کەسێکی زۆر ئازا و لە کاروباری مڵکداری و کشتوکاڵدا زۆر لێوەشاوە و بەوەج بووە. دەستەڵاتی تەواوی بەسەر ڕەعییەتەکانیدا شکاوە و خاوەنی کەلوپەل و دراوی نەغدینە و دانەوێڵەیەکی زۆر بووە و لەگەڵ کەسوکار و براکانی خۆیدا بەو پەڕی خەمساردی جووڵاوەتەوە و ئەگەرچی ئەوان دەستەنگ بوون، کەمترین یارمەتیی چییە پێی نەکردوون، لە لایەکی دیکەوە زوڵم و

١- ڕەنگە ئەو فراوینە کەبابی بەتامی مهاباد بووبێ کە هەژار سەبارەت بەو گوتوویە:

تۆ بڵێی تازە بخۆین تێر و تەسەل

چای عیمادیش و کەبابی حەمە شەل؟

زۆرداریی ئەو دەرحەق بەرەعیەتەکانی ئەوەندە زۆر بووە کە پێیان گوتووە جەلیل بێ خولا. ناوبراو لەگەڵ ئەوەشدا ئەنباری زۆرو زەوەندی گەنمی هەبووە و بەساڵان گەنمی دەچاڵدا بووە و زۆرجار لەبەرئەوەی زۆر لە بن ئەرزیدا ماونەتەوە ڕزیون و پووکاونەتەوە، سەرەڕای ئەوە نانی بنەماڵەی خۆی بەئاردی جۆ و هەرزن دابین کردووە.

لە کێشەی شێخ عوبەیدیلادا (کە لەساڵی ١٢٩٧ی کۆچی مانگی ڕوویداوە) دوای شکانی لەشکری شێخ، حەسەنعەلی خانی ئەمیر نیزامی گەڕووسی لەگەڵ قادراغای دێبۆکری[1] خاوەنی گوندی ئێندرقاش دەچێتە دێی باخچە.خەڵک لە ترسی هاتنی قوشوونی دەوڵەتی هەڵاتبوون. میرزا جەلیل هەموو کەلوپەلی ماڵەکەی خۆی دەپێچێتەوە و دەیشارێتەوە و وەتاغەکانی چۆل دەکا و عاشتەبایان تێدا نابێ. کاتێک ئەمیر نیزام دەگاتە باخچە، بۆ میوانداری و حەسانەوەی هیچ کەلوپەلێک لەبەردەستدا نابێ. ئەمیر نیزام بەناچاری لێفەیەک لە شاڵی تورمە لە نوێنی تایبەتی خۆی بەسەر کورسییەکەدا دەدا. قادراغا کە پێشینەی ناخۆشی و دڵئێشی لەگەڵ بنەماڵەی قازی دەبێ، ئەو هەلە بەدەرفەت دەزانێ و دەست دەکا بەغەیبەت و پێهەڵکاڵانیان و دەڵێ میرزا جەلیل و برایەکەی قازی قادر لەگەڵ لەشکری شێخ بوون و خەڵکیان تاڵان کردووە، تەنانەت ئەم لێفەیەش کە بەکورسییەکەدا دراوە ماڵی تاڵانییە و میرزا جەلیل بەتاڵان هێناویە. ئەمیر نیزام لە بەدوێژییەکانی قادر ئاغا سەبارەت بەمیرزا جەلیل، یەکجار تووڕە و دڵمەند بووە و بڕیاری دابوو بەتوندی میرزا جەلیل تەمێ کا، کاتێک باسی لێفە دێتە گۆڕێ، فیکری دەگۆڕێ و بەقادرئاغا دەڵێ: وا دەردەکەوێ ئەوەی هەتا ئێستا بەمنت گوتووە لە ڕووی غەرەز و دوژمنایەتیی شەخسییەوە بووە، چونکە ئەم لێفەیە ئی میرزا جەلیل نییە، بەڵکو ئی خۆمە. ئەمیر نیزام لەبەر دۆستایەتییەک کە لەگەڵ برای میرزا جەلیل واتە قازی قادر دەیبێ لەگەڵ میرزا جەلیل بەخراپ ناجووڵێتەوە، تەنێ پێی دەڵێ: چاوت وەچاوی گورگ دەچێ.

کوڕەکانی دیکەی میرزا ڕەحمانی قازی، هەر وەک دەزانین بریتی بوون لە: مەلا لەتیف، حاجی خەلیل و میرزا عەزیز.

مەلا لەتیف خوێندەوار بووە و زیاتر خەریکی کیمیاگەری بووە و خاوەنی قەرع و ئەنبیق و کوورە بووە و زێڕێکی زۆری خانمەکانی بنەماڵەی، بەمەبەستی تاقیکردنەوە، لەگەڵ مس و

---

١- بەپێی نووسینی دوکتۆر محەمەد جەوادی قازی، قادر ئاغا کوڕی هەباس ئاغای دێبۆکری یە و لەقەبی شوجاعولمولک بووە. هەباس ئاغای دێبۆکری لە ساڵی ١٢٥٦ی کۆچیی مانگی بەدەست عەبدوڵا خانی موکری کوژراوە.

کانزای دی تێکەڵ کردووە، بەڵام قەت لەوەدا سەرنەکەوتووە کانزاکان بکاتە زێڕ.

حاجی خەلیل، بابی میرزا ڕەسووڵ و باپیری ئەم نووسەرە بووە. میرزا عەزیز، کوڕێکی هەبووە بەناوی میرزا حوسێن. میرزا محەمەدی فەیرووزی کە ئەولادی نەبووە کوڕی ئەو میرزا حوسێنە بووە.

لێرەدا باسی کوڕانی میرزا قاسمی قازی (برا گەورەی میرزا عەبدوڵای قازی) کوڕی میرزا مەحموودی خۆشنووسی سابڵاغی دەکەین.

میرزا قاسمی قازی کوڕێکی بووە بەناوی میرزا ئەحمەدی قازی، لە کتێبی "کتاب المآثر والآثار" لە نووسینی محەمەد حەسەن خانی ئیعتیمادوسەلتەنە (چاپ سنگی، باب دهم، ص ۲۲۲، ستون دوم)دا هاتووە: " میرزا ئەحمەدی قازی (لە ساوجبولاغی موکری) لە گەورەگەورانی فەزل و خاوەن کەماڵ بوو، لە خەت و ئینشادا لە ناو عالماندا ئیمتیازی مەزنی هەبوو".(١)

میرزا ئەحمەدی قازی هەشت کوڕی هەبووە، بە ڕیزە بریتی بوون لە:

١- میرزا قاسمی قازی

٢- حاجی شێخ جەلال(٢)

٣- میرزا فەتتاحی قازی

٤- قازی وەهاب

٥- میرزا ڕەزاقی قازی

٦- قازی لەتیف

٧- میرزا مەجید

٨- میرزا ئەحمەد (کە دوای مردنی بابی لە دایک بووە)

میرزا قاسمی قازی کەسایەتییەکی گەورە و لە مهاباد پلەی قەزاوەتی هەبووە و لەبەر هەبوونی چەندین برای ئازا و عالم و گوێڕایەڵ ڕۆژ بەڕۆژ هێز و حورمەتی ڕووی لە زیاد بوون کردووە. خوداڵێخۆشبوو میرزا قاسم، یەکێک لە موریدان و مەنسووبانی

---

١- ئەو باسەی لەمەڕ المآثر و الآثار بژارکار (قادری فەتاحی قازی) هێناویەتە ئێرە و لێی زیاد دەکەم: ئەو شێخولەشایخەی کە لە کتێبەکەی کریس کۆچێرا بە نێوی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، وەرگێرانی ئیبراهیمی یۆنسی، لاپەڕەی ١٩٤، باسی لێوە کراوە، هەر ئەو میرزا ئەحمەدی- قازی یەیە.

٢- بڕواننە: شیکردنەوەکانی کۆتاییی ئەم کتێبە، ژمارەی ٦

خوداڵێخۆشبوو شێخ یووسف بەناوبانگ بەشەمسەدینی بورهانی بووە.[1] بۆیە لە کاتی ئاویلکەداندا تکا لە خوداڵێخۆشبوو شێخی بورهان دەکا - یەکێک لە نزیکانی خۆی بنێرێتە ژوور سەری.

خوداڵێخۆشبوو مەلا یووسفی شەمسەدینی بورهانی بەندی نێوکی خۆشەویستی پیرۆز بێ یەک لە شێخە گەورەکانی کورد و خەلیفەی حەزرەتی سیراجەدین (کە لەساڵی ١٢٨٣ی کۆچی مانگی سەری ناوەتەوە) بووە و لە بەشی هەرە زۆری کوردستانی موکریدا تا دەگاتە نزیک ئاگری و کەلا خوێ و سەڵماس و تاڵش لە پێڕۆیانی ئەون و خزمەتی زۆر گرانبایی کردووە لە ڕێنوێنیی خەڵک بەرەو ڕێگای ڕاست و بانگەشەکردن بۆ شەریعەتی ڕەسووڵی ئەکرەم (دروودی خودای لێ بێ) و لە زانستی کشتوکاڵ و دنەدانی خەڵک بۆ کاری چاک، سەرمەشقی کەسانی دی بووە و ئێستاش تەکیە و خانەقای لە دێی شەرەفکەندە و هەمیشە کەسانێکی زۆر لە هەموو ناوچەکانی کوردستانەوە دەچن بۆ زیارەتی گۆڕەکەی کە لە سەر تەپۆڵکەیەکی پڕدار و زەنوێر[2] هەڵکەوتووە کە دەڕوانێتە ئاوایی شەرەفکەند.

بەبۆچوونی ئەم نووسەرە کە یەکێکم لە مەنسووبانی وی و زۆربەی تاکوتەرای بنەماڵەی منیش لە پێڕۆیانی ئەو بوون و هەن، شێخ پیاوی خودا بووە، چونکو زۆربەی مریدەکانی لە کەسانی عالم و تێگەیشتوو و کەسانی ژیر بوون، دیارە چینی ڕووحانی و کەسانی ژیر زۆر بەپرسیارن و زۆر کەم وایە بەدوای مەبەستگەل و کاری ئەوتۆدا بچن کە ڕاستییان نەبێ یانی ئەگەر ئەو کەسە پیاوی خودا نەبوویایە بەلێبڕاوی ئەو هەموو موریدەی دەناو فازل و عالماندا نەدەبوو. شێخ پیاوی تێکۆشان و کردەوە بووە و موریدەکانی خۆی ئامۆژگاری کردووە و دنەی داون بۆ کاروکاسبیی ڕەوا و بەتایبەتی کشتوکاڵ و بەهیچ جۆر چاوی لە دەست یارمەتیی ماڵی خەڵک و موریدانی خۆی نەبووە و ئەگەر کەسێک دیارییەکی لەگەڵ خۆی بردووە دراوەتە دەست خانەقا. لە دەستگای خانەقای ئەو پیاوەدا هەمیشە ژمارەیەک سالیک هەبوون بەکاری دەرس دادانی دینی و قورئان خوێندنەوە و کشتوکاڵەوە خەریک بوون. خواردن و جێی حاوانەوەی زیارەتکاران لە لایەن دەستگای شێخ و مەوقووفەکانی خانەقا و لەوانە دێی ئاتابولاغی بەخۆڕایی و بێ بەرانبەر دابین کراوە.

---

١- سەبارەت بەکەسایەتی و ژیانی شێخی بورهان، کتێبێک بە نێوی " زندگی نامەء عارف ربانی حضرت شیخ یوسف ملقب به شمس الدین برهانی" لە لایەن کاک ئەبوبەکری خوانچە سپێهرەدینەوە نووسراوە و لە لایەن ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی لە ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی لە ورمێ بڵاو بووەتەوە.

٢- هەژار گوتوویە: " بێرەدا چوونە بەهەشت هاسانە" بۆ کوردستان، لاپەڕەی ١٢٩

شتێکی که لەدەستگای شێخ لە زەمانی ژیانیدا یەکجار زۆر جێی سرنج و ئەوپەڕی عادەت بووە، فەرق و جیاوازی لەگەڵ نەکردن و جووڵانەوەی یەکسان لەگەڵ زیارەتکاران بووە، بەو مانایە، ئەگەر شا یان گەدا میوانی ئەو بووبن، تەنێ جۆرێک خواردنی سادەیان دراوەتێ کە بەئاسایی نانی گەنم و دۆ یا ئاوگۆشت یان برێش بووە. هەروەها شوێنی حەسانەوە و نوێن و بانی ئەوانیش وەک یەک وابووە. شێخ هیچ رووی نەداوە بەکاربەدەستانی دەوڵەتی و پیاوە ناوچەییەکانیان و خۆی لە هەستان و دانیشتن لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت پاراستووە. جگە لە بانگەشە بۆ دینی موبینی ئیسلام و ڕێنوێنیی هەرەمەی خەڵک بەرەو ڕێگای ڕاست و هاندانی خەڵک بۆ کارو هەڵسووڕانی ڕەوا و پاڕانەوە لە خوای یەکتەن نەبێ، هیچ ئامانجێکی دیکەی نەبووە. شێخ هیچ کام لە کورەکانی خۆی نەکردووتە جێنشینی خۆی و تەنانەت زۆر جار لەلای خەڵک بەئاشکرا گوتوویەتی کورەکانی من شیاوی ئیرشاد و ڕێنوێنیی خەڵک نین. هەر ئەمە بۆخۆی باشترین بەڵگەیە بۆ گەورەیی و مەزنیی پلەی ئەم کەسە، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەرچی زۆربەی موریدانی شێخ لە فەرمایشی حەزرەتی شێخ سەبارەت بەکوڕەکانی ئاگادارن، منداڵەکانی شێخ لە لای موریدان و خەڵکی دیکە هەتا بڵێی جێی ڕێز و ئیحتیرامن.

پێشتر گوتم خوداڵێخۆشبوو میرزا قاسمی قازی تکا لە شێخی بورهان دەکا لە کاتی ئاویلکەدانیدا یەکێک لە نزیکانی خۆی بنێرێتە ژوور سەری. خوداڵێخۆشبوو شێخی بورهان، مەلای[1] ڕەوانی دەنێرێتە ژوور سەری میرزا قاسم بۆ سابڵاغێ. مەلای ڕەوانی هەم زاوای شێخ و هەم یەکێک لە موریدە هەرە بەرچاوەکانی شێخ بووە. مەلای ڕەوانی لە کاتی ئاویلکەدانی میرزا قاسم، لە عالەمی باتینیدا دەبینێ سەید سەعیدی نوورانی[2]

---

١- بۆ ئاگاداری لە ئەحواڵی مەلای ڕەوانی، بڕوانە: زندگی نامەء عارف ربانی حضرت شیخ یوسف ملقب به شمس الدین برهانی، لاپەڕەی ٢٤٣. لەو کتێبەدا پاشناوی ئەو کەسە، هەم بە ڕەوانی و هەم بە ڕەبانی ئاستە کراوە، بەڵام بابم تەنیا نووسیویە ڕەوانی.

٢- بابم بە دووی ئەو ڕستەیەدا لێی زیاد کردووە: سەید سەعیدی نوورانی لە سەیدەکانی کولیجە و پیاوێکی زۆر عالم و بە تەقوا و لە موریدانی زۆر نزیکی حەزرەتی شێخی بورهان بووە. ئارامگەی سەید سەعید تەقریبەن لە دوو میتریی سەرووی ئارامگەی شێخی بورهان هەڵکەوتووە. بژارکار (قادری فەتاحی= قازی) لێی زیاد دەکا: شەرحی حاڵی بە وردەپیشاڵی خوالێخۆشبوو حاجی سەید محەمەد سەعیدی نوورانی لە کتێبی " زندگی نامەء عارف ربانی حضرت شیخ یوسف ملقب به شمس الدین برهانی"، لاپەرەی ٢٧١ دا، هاتووە. بەپێی نووسینی ئەو کتێبە ڕێکەوتی کۆچی دوایی سەیدی نوورانی، ساڵی ١٣٠٦ی کۆچی مانگی بووە.

هاتووهته ژووڕ سەری میرزا قاسم و پێی دەڵێ: لەبەرئەوەی ئێوە بە زۆری دێی (پیرۆڵی باخی) تان لە وەرەسەی من ئەستاندووە، بەتۆڵەی ئەو تەعەدایا، شتێکم ناوێ جگە لە ئیمانی تۆ نەبێ، ئێستا کە ئەوە دەمری ئیمانەکەت لێ دەستێنم. مەلای ڕەوانی هەرچەندی حەول دەدا لە عالەمی باتیندا میرزا قاسم لە چنگ ئەو سەیدە شەڕانی و دەمارگرژە ڕزگار بکا، سەرناکەوێ. بەناچار لە عالەمی باتیندا بیر لە مامۆستای پایەبەرزی خۆی حەزرەتی شێخی بورهان دەکاتەوە و داوای یارمەتیی لێ دەکا. ڕوحانییەتی شێخ دەستبەجێ ئامادە دەبێ و بەڕێگای عارفانەدا سەیدی نوورانی دەغافڵێنێ، لە ئاکامدا سەید لەوەدا سەرناکەوێ ئیمانی میرزا قاسم بستێنێ.

بێ جێ نییە لێرەدا کورتەیەکیش سەبارەت بەحاڵ و ئەحواڵی مەلای ڕەوانی بنووسرێ. مەلای ڕەوانی یەکێک لە موریدەکانی بەتەقوای شێخ بووە و ڕێز و خۆشەویستیی لای شێخ ئەوەندە دەبێ کە کچێکی خۆی بەناوی فاتمە لێ مارە دەکا. ئەو کچەی شێخی لای بابی زۆر بەڕێز و خۆشەویست بووە، بەجۆرێک ڕۆژێک شێخ پێی دەڵێ، ئەی فاتمە ئەمن لە دووریی تۆ زۆر لە زەحمەتدام و پێم خۆشە هەمیشە لە لای من بی. کچەکە عەرزی دەکا منیش پێم خۆشە هەمیشە لە لای ئێوە بم و ئەگەر مەلای ڕەوانیم وەک مێردی خۆم قبووڵ کردووە، ئەو کارە بەپێی فەرمان و ئەمری شێخ کراوە. بەدوای ئەو قسانەدا شێخ داوا لە مەلای ڕەوانی دەکا فاتم تەڵاق بدا!

مەلای ڕەوانی ئەو فەرمانە پێک ناهێنێ، و ئاخرەکەی کار دەگاتە جێی باریک و شێخ پێی دەڵێ ئەگەر کچەکەم تەڵاق نەدەی ئیمانت لێ دەستێنم. مەلای ڕەوانی لە وەڵامدا دەڵێ: خودا لە شێخ گەورەترە. دوای ئەو ڕووداوە شێخ مەلای ڕەوانی دەردەکا و لە خۆی دوور دەکاتەوە. مەلا بەهیچ جۆر ئامادە نابێ ژنەکەی تەڵاق بدا. بەڵام فاتمە دوای ماوەیەک وەفات دەکا و دوای وی، خودا لە مەلای ڕەوانیش خۆش دەبێ.

سەید ڕەشید (کە لەساڵی ١٣١٥ی کۆچی مانگیدا خودا لێی خۆش بووە)(١) یەکێک لە سالیکان و موریدانی خوداڵێخۆشبوو شێخی بورهان بووە گێڕاویەتەوە و گوتوویە ئەمن لە تەواوی تەمەنمدا تەنێ جارێک کەشفم بۆ پەیدا بووە، بەم شێوەیە: لە عالەمی ڕووحانیدا دیتم تەواوی دنیا تەخت بووبوو، چەند مەلایەکەتی ئازاردەر دەورەبەری (مەلای ڕەوانی)یان گرتبوو و دەیانەویست ئازاری بدەن. مەلای ڕەوانی هەڵی دەکوتا سەریان و تا ئەوسەری

---

١- زندگی نامەء عارف ربانی، شیخ شمس الدین برهانی، لاپەڕەی ٢٨٦

دنیـای دەڕەتاندن و دەیگوت: خـودا ئێـوە نانێـرێ بۆ ئازاردانی من شـێـخی بورهـان ئێوەی ناردووە.

ئەو کێشەیە ماوەیەک درێژەی هەبوو، ئاخرەکەی مەلاییەکە لەوەدا سەرنەکەوتن مەلای ڕەوانی ئازار بدەن. شـیـخی بورهـان لەو بارەیەوە گـوتبـووی. ئەو سـەگـبـابـە لە عـالـەمی مەرگیشدا ئازا و بوێرە.

ئەو ڕیوایەتەم سـەبارەت بەمردنی میرزا قـاسـمی قازی لە جەنابی کاک سـەید حەسـەنی شێخەلئیسلام[1] خاوەن مـوڵک و دانیشـتووی دێی شـیلاناوێ کە مێردی یای زێنـەب کچی خـوداڵێخـۆشـبوو شێـخی بورهانە، لە مـانگی خـەرمـانانـی ١٣٣٢ی کـۆچی هەتاوی بیست. بەڕێزیان ئەوەی لە هاوسەری واتە کچی شێخ بیستبوو.

---

١- سەید حەسەنی شیخەلئیسلام بابی شاعیری بەنێوبانگ مامۆستا (هێمن)ە.

## میرزا مەجیدی قازی

خودا لێخۆشبوو میرزا مەجیدی قازی ناسراو بەسەعدولقوزات، بەپێچەوانەی تاکوتەرای دیکەی بنەماڵەی قازی کە زۆربەیان ئەهلی قەڵەم یان شیر یان وەرزێر بوون، ئەهلی ئەو جۆرە کارانە نەبووە، بەڵکو خاوەن زەوقی موسیقی بووە و بەوپەڕی تەردەستییەوە تاریشی ژەنیوە و دەنگیشی زۆر خۆش بووە. لە ئاخروئۆخری تەمەنیدا کە پیر بووبوو دیتبووم. پیاوێکی خوێرکاوی بوو دەستی لە تارلێدان و گۆرانی هەڵگرتبوو، زیاتر خەریکی پاڕانەوە و تاعەت و ئەوراد کوتن بوو. زۆر جار نەخۆش بوو و دوای نانخواردن ژانە زگێکی سەختی دەگرت. جارێکیان خودالێخۆشبوو قازی محەمەد کوڕی قازی عەلی نەخۆش بوو، ئەمن چووبووم بۆ سەردانی. بەهەڵکەوت میرزا مەجیدی قازییش لەوێ بوو. خودالێخۆشبوو قازی محەمەد ئەودەمی گەنج بوو و بابی مابوو، داوای لێ کرد چەند شێعری مەسنەوی مەولەوی بۆ بخوێنێتەوە. ناوبراو چەند شێعری لە مەسنەوی بەئاهەنگی تایبەتی خۆیەوە خوێندەوە بەڕاستی زۆر بەرز و دڵگیر بوو. بنەماڵەی میرزا مەجید بۆ ماوەیەکی درێژ لەبەر بێ موڵکی و بێدەرەتانی لەوپەڕی پەرێشانی و داماویدا دەژیان، بەڵام دواجار توانییان گوندەکانی بادام و ئەمیراباد بکڕن.

کوڕانی میرزا مەجید بەپێی تەمەن بریتین لە:

١- کاک برایم. ٢- کاک ئەحمەد. ٣- کاک عەزیز. ٤- کاک قاسم. ٥- کاک قادر

کە هەموویان لە گوندی بادام دەژین. کاک عەزیز دوو سێ ساڵ لەمەو بەر خودا لێی خۆش بووە.

لەگەڵ ئەوەشدا گوندەکانی بادام و ئەمیراباد کەم ئاو و دێمەکارن، بەڵام لەبەر ئەو کار و کۆششت و چالاکییەی کوڕانی خودالێخۆشبوو مام مەجید لە کاسبی و کشتوکاڵدا دەیکەن، شوکری خودای لەگەڵ بێ، ژیانێکی ڕاحەت و ئاسوودەیان هەیە. خودالێخۆشبوو میرزا مەجیدی قازی کوڕێکی دیکەی بووە بەناوی عەبدوڵا کە بەلاوەتی لە کۆنە دێ لە محاڵی شاروێران لە تاریکی شەودا کوژراوە و بکوژەکەی دیار نییە، کێیە.

کاک ئەحمەد ئینسانێکی سوعبەتچی و قسەخۆشە، لە ساڵانی پێشوودا کە باران کەم دەباری و وەزعی ماڵیی پەرێشان بوو، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەبەر خوڵای دەپاڕێتەوە بارانێک بنێرێ و ئەو دانەوێڵەیەی لە زەوی دێم چاندوویەتی تێرئاو بکا، بەڵام هەور هەمیشە بەسەر مەزراکەی ویدا تێ دەپەڕن و دەگەنە سەر مەزراکانی گوندەکانی شاروێران

کە ئی خاوەن موڵک و دەوڵەمەندان بوون و لەوێ باران وەک گوزەی سەربەرەو ژێر دای دەکاتێ. ئەو وەزعە لە ساڵێدا چەندین جار دووپاتە دەبێتەوە بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەوانە دەبێ ئەو گەنم و جۆیەی دای چاندووە ویشک هەڵێن، ڕۆژێک پەڵە هەورێکی ڕەش بەهەورەتریشقە و گاڵە گاڵ لە سەر ئاسمانی بادام پەیدا دەبێ. کاک ئەحمەد هەر کە چاوی پێی دەکەوێ، ڕووەو هەورەکە دەڵێ: ئەتۆ بەسەر زەوی و مەزرای هەژاراندا ناباری، لە خۆڕا بۆچی هاتوویە سەر ئاسمانی ئاوەدانییەکەی من ؟ ئێستا دەزانم چت بەسەر بێنم. ناوبراو دەستبەجێ هەرای ژنەکەی دەکا و دەڵێ دادەی ئەو تفەنگ و فیشەکدانەم بۆ بێنە. خانمەکەی لە ترسان و بەهەراسانی وەدەزانێ، دوژمن هێرشی کردووەتە سەری، تفەنگ و فیشەکدانەکەی بۆ دەبا، کاک ئەحمەد دەستبەجێ دەست دەکا بەتەقەکردن لە پەڵە هەورەکە دە دوازدە گوللەی تێ هەڵ دەکا. هەر ئەو جۆرەی کە کاک ئەحمەد پێشبینیی کردبوو، پەڵە هەورەکە بەرەو شارویران دەچێ و دیسان لەوێ بارانێکی بەخوڕەم دەبارێنێ. بۆ سبەینێ ڕا بەهەڵکەوت پەڵە هەوری دیکە پەیدا دەبن و دەست دەکەن بەبەبارین و مەزراکانی تێرئاو دەکەن، لە ئاکامدا بەروبووی ئەو ساڵە هەتا بڵێی باش دەبێ و ئیدی لەو دەمییەوە بەفر و باران بەکاتی خۆی دەگەنە جێ و کاک ئەحمەدیش دەست لە تەقە لێکردنیان دەپارێزێ و ناوێرێ توخونیان کەوێ.

کاک برایم زۆر ڕاوە مراویی بەتفەنگی پێخۆشە و ئیددیعا دەکا ڕاوکەرێکی زۆر تەڕدەستە بەڵام بەکردەوە پێچەاونەکەی دەبیندرێ، هەموو ساڵێ بۆ ڕاو دەچێتە دێی دارەلەک موڵکی ئاغایانی کاک ڕەحمان و کاک حەسەن و کاک عەبدوڵا کە کوڕانی خودالێخۆشبوو ئاغا فەتاحی دێبۆکرین کە دایکیان سوڵتان خانم کچی خودالێخۆشبوو حاجی قازی لەتیفە. (باپیری نووسەر لە لای دایکەوە) جارجار مانگێک لەوێ دەمێنێتەوە و هەموو ڕۆژێ دەچێتە ڕاوێ. ڕاوکەرەکانی دی، هەریەکەی چەند مراوی و قاز ڕاو دەکەن، بەڵام کاک برایم تەنانەت دەنکێکیشی پێ ڕاو ناکرێ و لەبەرئەوەی ڕاوچییان سەبارەت بەو شتە قسە دەکەن زۆری لە دڵی گران دێ.

کوڕەکەی دیکەی خودالێخۆشبوو میرزا مەجید، میرزا عەزیز بوو. ناوبراو نێوانێکی وای لەگەڵ کاروکاسبی و کشتوکاڵ نەبوو، جار جار تاری لێ دەدا و گۆرانیی دەگوت، بەڵام لەو ڕشتەیەدا مامنێونجی بوو.

کوڕی دیکەی خودا لێخۆشبوو میرزا مەجیدی قازی، کاک قاسمی مەجیدی، یەکێک لە وردە مالیکەکانی بادامە. ناوبراو زۆر تێگەیشتوو و میوان بەخێرهێنەر و قسە خۆش و

خزم له کن خۆشەویستە. خوێندەواریی فارسی هەیە و لەبەرئەوەی یەکێک لە خانمەکانی تورکی شاسەیوانە، زمانی تورکیش باش دەزانێ. میرزا قاسم دەنگی زۆر خۆشە و گۆرانییە کوردییە ڕەسەنەکان دەڵێ[1]، تاریش باش دەژەنێ، زۆر شەو و ڕۆژان لەگەڵی بووم و زۆر بیرەوەریی خۆش و بەچێژمان بەیەکەوە هەیە. یەکێک لە عادەتەکانی کاک قاسم ئەوەیە لەکۆڕ و مەجلیسی بیگانەدا گۆرانی ناڵێ و ئەوە بەکەسری شانی بنەماڵە دادەنێ و ئەگەر لە مەجلیسی ناو خزمان و بنەماڵەشدا کەسێکی غەریبەی لێ بێ، دیسان بەزەحمەت گۆرانی دەڵێ و لەو دوایانەدا لەتاو ئەو داخ و کەسەرەی لەبەر شەهادەتی سێ کەس لە مەزنانی بنەماڵە خودالێخۆشبووان قازی محەمەد، سەدری قازی، محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی تووشی بووە، دەستی لە گۆرانی گوتن هەڵگرتووە. هەزار داخ و ئەفسووس دەستی جەفاکاری ڕۆژگار ئێمەی لە یەکدی جوێ کردەوە، بەو مانایەی من مووچەخۆری دوخانیاتم و لە ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی ڕاگوێزرام بۆ تەورێزو لە کۆتاییەکانی خەرمانانی ئەو ساڵەشدا خاو و خێزانم لە مهابادەوە هێنا تەورێز و ئیدی کاک قاسم مەگەر جار و بار لە سەفەری مهاباددا نەبێ، ئەویش بۆ ماوەیەکی کورت - نابینم، جارێکیش هاتە تەورێز و میوانی من بوو بەڵام ئیدی ئەو شەوق و زەوق و خۆشحاڵی ڕابردووی نەمابوو[2] ئێستا باسێکی کورت دەکەین لە ژیانی کوڕانی میرزا قاسمی قازی[3] کوڕی میرزا ئەحمەدی قازی.

کوڕانی ئەو خوداڵێخۆشبووە بریتی بوون لە:

١- میرزا عەلی قازی

٢- ئەبولحەسەن بەناوبانگ بە سەیفولقوزات

٣- میرزا عەبدوڵڵا مەشهوور بە قازی عەسکەر

---

١- کاک محەمەدی ماملێ دەنگخۆشی بەنێوبانگی مهابادی لە پێشوودا (بەر لەوەی تووشی نەخۆشیی فەرامۆشی بێ) چەندین جار لە لای نووسەر باسی کردووە، چەندین گۆرانیی ڕەسەنی کوردیی لە میرزا قاسمی مەجیدی فێر بووە و لە لای ئەو ڕاهێنانی کردووە. (کاک محەمەدی ماملێ ڕۆژی سێشەمۆ سێیەمی ڕێبەندانی ١٣٧٧ی هەتاوی، لە نزیک سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ لە ماڵی خۆی لە مهاباد ماڵاوایی لە ژیان کردووە).

٢- خوالێخۆشبوو میرزا قاسمی مەجیدی لە مانگی بانەمەڕی ساڵی ١٣٤٧ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: کتێبی منظومەء کردی بهرام و گلندام، لاپەڕەی ١٥

٣- مەبەست لە باپیری پێشەوا قازی محەمەدە.

٤- میرزا عەبدوڕەحیم (میرزا ڕەحیم بەجوانی لە شەڕی مەشهوور بەشەڕی کۆنەمەڵاڵەر لە لایەن مەجید بەگی کولیجە لەبەر دووبەرەکی لە سەر موڵک کوژراوە و باسی ئەو بەسەرهاتە لەگەڵ شەرحی حاڵی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازیدا دەنووسین.)[١]

قازی میرزا عەلی کەسێکی هەتا بڵێی عالم و زانا بووە و خەتی عەرەبی و فارسیی لەوپەڕی جوانیدا نووسیوە و لە زانستەکانی دینیدا (فەقێتی و تەفسیر) و سەرف و نەحو و زانستەکانی باوی زەماندا کەم وێنە بووە و بنەماڵەی قازی لەو دوایانەدا کەسێکی ئاوا بەمەعلوومات و زانای لێ هەڵنەکەوتووە. هەر وەک پێشتریش باس کرا، خوداڵێخۆشبوو میرزا قاسم هەتا بڵێی لە غەمی پەروەردەکردن و خوێندنیدا بووە. دەگێڕنەوە ڕۆژێک میرزا قاسم کتێبی ئەلفییە (الفیە)ی کوڕی مالیک کە کتێبێکە سەبارەت بەزانستی نەحو و بریتییە لە هەزار بەیت شێعر، لە میرزا عەلی دەپرسێتەوە و داوای لێ دەکا لەبەر بیڵێتەوە. میرزا عەلی هەموو کتێبەکەی لەبەر نەبووە، بابی لە مەحکەمەی خۆیان زیندانیی دەکا و پێی دەڵێ هەتا (الفیە) بەتەواوی لەبەر نەکەی، حەقت نییە لە مەحکەمە بچییە دەرێ. میرزا عەلی لە ماوەی حەوتوویەکدا کتێبەکە بەتەواوی لەبەر دەکا و تاقی دەکرێتەوە، دوایە لە زیندان بەر دەدرێ.

حەسەنعەلی خانی ئەمیر نیزامی گەڕووسی کە لە پیاوە بەناوبانگەکانی سەروبەندی قاجارە، لە کاتی خوێندنی میرزا عەلی قازی لە مهاباد حاکم بووە. ئەمیر نیزام کە بۆ خۆی ئەهلی فەزل بووە و بەتایبەتی خەتی یەکجار خۆش بووە، خوداڵێخۆشبوو قازی عەلیی هان داوە بۆ وەدەستهێنانی زانست و دڵگەرمی داوەتێ بۆ خوێندن.

زۆربەی خوێندنی خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی لە لای مەلا عەبدوڵای ناسراو بەپیرەباب بووە. مەلای پیرە باب زۆر عالم و زانا بووە و خاوەنی پەراوێز نووسین و شیکردنەوەیە لە بواری مژاری ئاڵۆزی سەرف و نەحو و تەفسیر و فێقه و ڕیازیدا.

سەبارەت بەئاستی تەقوای مەلا عەبدوڵای پیرەباب گوتراوە، ناوبراو ئەودەمەی لە دەزگای شێخ عوبەیدیلادا خەریکی کاری دەرس دادان بووە. شێخ کە لە زەمانی خۆیدا کەسی یەکەمی کوردستان و خاوەن دەسەڵات و هێزێکی زۆر بووە، ڕۆژێک بەمەلای پیرەباب دەڵێ: ئەگەر جەنابی مەلا ڕێگام بدا، بۆ ڕاپەڕاندنی کێشەیەکی شەرعی کە لەگەڵ کەسێکدا هەمە، لە مەحزەرتاندا ئامادە بم. مەلای پیرەباب دەڵێ ئەمن بۆ قەزاوەت

---

١- ژیاننامەی خوالێخۆشبوو میرزا فەتاح لەم کتێبەدا دواتر ئاماژەی پێ دەکرێ.

نەهاتوومەتە لای ئێوە کە ناڕاستەخۆ بەمانای لایەنگری لە ئێوەیە، بەڵکو بۆ دەرس دادانی زانستە دینییەکان هاتوومەتە ئێرەکانێ و لەبەرئەوەی چاوەڕوانی قەزاوەتکردن لە من دەکەن و لە دڵی خۆتاندا چاوەڕێ دەکەن بەقازانجی ئێوە بڕیار بدەم و ئەو کارەش لە دەست من نایە، بۆیە ئیدی لە موڵکی ئێوەدا نامێنمەوە. هەرچەندی شێخ عوبەیدیلا پێی دەڵێ باشە داوەریکردن و قەزاوەتی ئێوەم ناوێ و هەر وەک پێشوو خەریکی دەرس گوتنەوەی خۆتان بن و داوای لێبووردنی لێ دەکا، مەلای پیرەباب قۆڵی لەسەر ناکێشێ و سەرەڕای ئەو هەموو تکا و ڕەجا و پێکێشییەی شێخ عوبەیدیلا بۆ مانەوەی لە موڵکی ویدا، ماڵی بار دەکا. خوداڵێخۆشبوو مەلا عەبدوڵای پیرەباب لە مهاباد خودا لێی خۆش بووە و لە گۆڕستانی مەلا جامی نێژراوە.

میرزا عەلی قازی لە دوای کۆچی دوایی بابی، پلەی قەزاوەتی مهابادی بەدەستەوە گرتووە، مەحکەمەکەی بۆ هەژاران و داماوان و ئەو کەسانەی کە گێرە و کێشەی ئیدارییان هەبوو دالْدە و پەناگە بوو. بەڕێزیان هەرچۆنێک بایە گیروگرفتی خەڵکی جێبەجێ دەکرد. خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی کەسێکی زۆر خۆ بەکەمگرو میهرەوان و لەسەرەخۆ و بەحەوسەڵە بوو، کاتێک بەکۆڵان و شەقامدا تێ دەپەڕی، سڵاوی لەهەموو کەس تەنانەت لە منداڵانیش دەکرد، مەحکەمەکەی شوێنی ڕاپەڕاندنی داوخواز و جێبەجێکردنی گێرەوکێشە بوو. کاری زۆر گرینگ و کێشەی گەورە لە ماوەیەکی کەم لە حەوزووری ویدا بەلایەکدا دەخرا، لە مەحکەمەی ویدا هەمیشە ژمارەیەکی زۆر میوان لە هەر توێژێک بڵێی، دەبیندران و بەوپەڕی ڕێزەوە میواندارییان لێ دەکرا.

پێشکەوتی دارایی خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی و براکانی بەپەیدابوونی قاتوقڕی دوای شەڕی یەکەمی جیهانی کەوتە بەرچاو. قازی عەلی و براکانی قازی عەسکەر و ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات لە دێی پیرۆلی باخی دانەوێڵەی پاشەکەوتکراوی چەندین ساڵەیان هەبوو. لە دوای ئەوەی نرخی دانەوێڵە بەڕادەیەکی سەرسوورهێنەر گران بوو (کیلۆیەک گەنم ئەودەمی نرخی گەیشتبووە ٧/٥ ڕیاڵ) زۆربەی دانەوێڵەی ناو ئەنبارەکانی خۆیان بەبایی زۆر فرۆشت و لەو ڕێگایەوە سەروەت و سامانێکی زۆریان دەست کەوت. دەبێ ئەم خاڵەش بگوترێ: ئەگەر ئەوان دانەوێڵەیان بەبایی گران، بەپێی نرخی ڕۆژ فرۆشت، دانەوێڵەیەکی زۆریشیان بەمەبەستی ئیحسان و لە ڕێگای خولایدا بەخۆڕایی دا بەهەژاران. خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی، فەرمانی دابوو هەموو ڕۆژێ نانێکی زۆر بپێژن و وەک ئیحسان بیدەن بەنەداران و ئەو کارە چەندین مانگی یەک لە دوای یەک بەردەوام بوو.

هەرچۆنێک بێ ئەوان بەو دراوانە گوندەکانی دەلە، گوێگجەلی، موشیرابات، کانی کووزەڵە، عەبدولاباتیان کڕی. ئەو دێیانە ئەو دەمەی خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات کڕینی، لەبەردەستەوەستانی و ڕابواردنی بێ لغاوی خاوەنەکانی پێشوویان (وەرەسەی حوسێن بەگی سنجاغ) وێران بووبوون و چۆڵ کرابوون. خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات بەباییەکی کەم ئەو دێیانەی کڕی و لەبەر لێوەشاوەیی و کارزانی و تێگەیشتوویی لە کاری کشتوکاڵدا، ئەو دێیە ناوبراوانەی لەماوەیەکی کورتدا نەک هەر ئاوەدان کردەوە، بەڵکو وەک بەهەشتی بەرینی لێ کردن.

خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی لەبەرئەوەی دژایەتی سمایل ئاغای شکاکی دەکرد، کاتێک سمایل ئاغا لە ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی مانگی (ئۆکتۆبری ١٩٢١)دا هێرشی کردە سەر مهاباد، فەرمانی دابوو بەلەشکرەکەی قازی عەلی بکوژن. لەشکری ناوبراو دوای داگیرکردنی مهاباد و قەتڵوبڕی ژاندارمەکان و تالانکردنی شاری، بەهەڵە لەجیات قازیی عەلی، مامی وی قازی عەبدوللەتیف (باپیری نووسەر لە دایکەوە)یان کە ماڵیان لە یەکتری نزیک بوو و دراوسێ بوون کوشت، شکاکەکان خوداڵێخۆشبوو (قازی عەلی)یان قۆڵبەست کردبوو و بە قۆنداغی تفەنگ لە سەریان دابوو و لە ئاکامی ئەو زەربەدا تا ڕادەیەک تووشی لەبیرچوونەوە و فەرامۆشی هاتبوو و گوێی گران بووبوو و لە هەمان کاتدا سمایل ئاغا دەستی لە کوشتنی وی پاراست.

هەرلە هەمان ڕۆژدا کاتێک - خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی، سەرەڕای ئەو لێدان و کوتانەی وەبەری کەوتبوو، بۆ شەفاعەت و بەمەبەستی وەرگرتنەوەی کەلوپەل و ماڵی تالانکراوی خەڵکی شاری و بۆ پێشگیری لە کوشتوبڕ چووبووە لای سمایل ئاغا، یەکێک لەوانەی ڕاسپێردرابوو قازی عەلی بکوژێ، لە شاریڕا دەگەڕێتەوە و بێ خەبەر لەوەی خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی لە لای سمایل ئاغا دانیشتووە، بەسمایل ئاغا دەڵێ قازی عەلیم کوشت. سمایل ئاغا بەو کابرایە دەڵێ: "سە باب" قازی عەلی نەکوژراوە و ئەمەتا زەق و زیندوو لە لای من دانیشتووە، خودا دەزانێ چ بێچارەیەکتان لە جیات وی کوشتووە؟

قازی عەلی لە شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا، وەکو مامی میرزا فەتاحی قازی، لەبەر دەمارگرژیی مەزهەبی، لایەنگریی لە ترکانی عوسمانی دەکرد و بەقازانجی ئەوان بانگەشەی دەکرد و خەڵکی هان دەدا بۆ جیهاد و دانی باربوو و یارمەتی بەعەسکەرە عوسمانییەکان، هەرلەبەر ئەوەش بوو کاتێک - ترکەکان شکان، ڕووسە قەیسەرییەکان ماڵی وی و ماڵی مامی قازی فەتاح یان ئاور تێ بەردا و (قازی عەلی)یان دووجار گرت و خستیانە

بەندیخانەوە، جارێکیان تا (ورمێ) یان برد دوایە بەریان دا و جارێکی تریش تا حەیدەرابادیان برد، پاشان ئازادیان کرد.

قازی عەلی – لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا سست و بێ تاقەت بووبوو، کورەکانی خوالێخۆشبوو قازی محەمەد و ئەبولقاسمی سەدری قازی، کاری قەزاوەتی ئەویان بەتوندی بەرتەنگ کردبوو و خستبوویانە ژێر چاودێرییەوە، چونکو نیگەران بوون لەوەی نەکا بابیان لە کێشە و مەسەلەی شەرعیدا تووشی هەڵە و ناسخ و مەنسووخ بێ. خوالێخۆشبوو قازی محەمەد مۆری باوکی کە ڕستەی آن الحق مع علي و علي مع الحق (حەق بەعەلییە و عەلی لەگەڵ حەقە)ی لە سەر هەڵکۆڵدرابوو، لە لای خۆی ڕادەگرت، حوکمەکانی بابی دەخوێندەوە، ئەگەر جێی پەسند بان، مۆری پێوە دەنان. ئەو پنکتەشمان لە بیر نەچێ، بەر لە پێکهاتنی ئیدارەی عەدلییە، حوکمی قەزاوەت لە لایەن شاوە بۆ قازییەکان دەردەچوو.

خوالێخۆشبوو قازی عەلی لە تەمەنی نزیک بەحەفتا ساڵی – دوای چەند ڕۆژ لە جێدا کەوتن بەنەخۆشیی قانقاریا لە ساڵی...(١) کۆچی دوایی کرد. خوالێخۆشبوو قازی عەلی دوو کوڕی هەبوو:

١– خوالێخۆشبوو قازی محەمەد

٢– خوالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی

کوڕێکی دیکەی میرزا قاسمی قازی میرزا عەبدوڵا بوو کە بەقازی عەسکەر بەناوبانگ بوو، ناوبراو خوێندەوارییەکی ئەوتۆی نەبوو و زیاتر لە دێی پیرۆلی باخی دەژیا، لە کار و کاسبی و کشتوکاڵدا مشوور و شارەزاییی کافیی هەبوو. پیرۆلی باخی دێیەکی بێ ئاو و دێمەکارە، بەڵام لە سایەی وردبینی و کۆششی ناوبراو لە کاروباری زەرعات و کشتوکاڵدا، هەموو ساڵێ بەهرەیەکی زۆری لێ دەکەوتەوە. هەر ئەو دانەوێڵەی لە سەریەک کۆوەبووەی پیرۆلی باخی بوو سەیفولقوزات بەدراوی ئەو دێیەکانی دەملە و گوێگجەلی و... هتد.ی کڕی. میرزا عەبدوڵای قازی، هیچ منداڵی نەبوو، دوای مردنی دارایی و کەلوپەلی زۆری وی بەبرازاکانی خوالێخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی گەیشت.

---

١– بابم ساڵی کۆچی دوایی قازی عەلی نەنووسیوە. قازی عەلی لە ساڵی ١٣٥٠ی کۆچیی مانگی کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: گۆڕستانی مەلا جامی، پەراوێزی لاپەڕەی ١١

## ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات

خودالێخۆشبوو ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات برای بچووکی قازی عەلی بوو، بەقەدەر قازی عەلی مەعلووماتی نەبوو، بەڵام مونشی و ئەدیب و شاعیرێکی بەتوانا بوو.[١] خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات لە هەرەتی لاوێتیدا لەگەڵ کاروباری سیاسییش سەروکاری هەبوو، لە سەردەمی شێخ محەمەدی خیابانی ئازادیخوازی بەناوبانگی تەورێزی چالاکیی سیاسی دەکرد و سەرۆکی کۆمیتەی مهاباد بوو. مەلا سەعیدی حاجی سەدرولعولەما و حاجی بایزئاغا و براکەی عەلی ئاغای ئێلخانیزادە لەگەڵ هەندێک لە تاجرەکانی مهاباد دژی وی هەندێک دەستەبەندییان ساز کردبوو و بەردەوام لە کێشە و کێشمەکێشی نهێنیدا بوون. سەیفولقوزات ماوەیەکیش نوێنەری فەرهەنگی مهاباد (دەزگای پەروەردە) بوو[٢] و بۆ پەرەپێدان و بووژاندنەوەی فەرهەنگی مهاباد خزمەتی شیاو و جێی سرنجی ئەنجامدا. دامەزراندنی خوێندنگەی مۆدێرن لە مهاباد بەرووبووی چالاکی و تێکۆشانەکانی ماندوویی نەناسانەی بەڕێزیان بوو و لەبەرئەوەی زۆر جار سەفەری تاران و تەورێزی کردبوو و دامەزراوە فەرهەنگییەکانی مۆدێرنی لەو شارانەدا دیتبوو، ئاواتی ئەوە بوو لە مهابادیش نموونەی ئەو جۆرە خوێندنگەیانە ساز بکا، سەیف دواتر لە ئیدارەی فەرهەنگ کشاوە، لە دوای وی نوێنەرایەتیی فەرهەنگی مهاباد کەوتە سەر شانی برازاکەی میرزا محەمەدی قازی (قازی محەمەدی بەناوبانگ).

سەیف لە کاتی سەڵتەنەت ئەستاندن لە بنەماڵەی قاجار، لەبەر دنە و هاندانی لێپرسراوانی ناوچەیی تەبلیغات و نوتقی زۆر دوورودرێژی بە قازانجی ڕەزا شای پەهلەوی کرد کە ئەودەمی سەرۆک وەزیر و فەرماندەری گشتیی هێزەکانی ئێران بوو، و لەو سەروبەندەوە چالاکییە سیاسییەکانی زیادی کرد و خەیاڵی نوێنەرایەتیی مەجلیسی

١- دیوانی شێعرەکانی سەیفولقوزات لە مانگی بەفرانباری ١٣٦١ (ی هەتاوی) بە کۆششتی کاک ئەحمەدی قازی لە تاران چاپ بووە.

(کتێبێکی هەمەلایەنە بەناوی" ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی/ داوا بکەن بەزار و زمان و ددان لێو" سەبارەت بەژیان و شێعرە کوردییەکانی سەیفولقوزات لە لایەن مامۆستا ئەنوەری سوڵتانی و حەسەنی قازی یەوە ئامادە کراوە و لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٨ لە سلێمانی لە لایەن بنکەی ژین چاپ و بڵاوکراوەتەوە – تێبینی وەرگێڕ)

٢- بەدوای ئەو ڕستەیە دا بابم لێی زیاد کردووە: هەوڵ کەسێک لە مهاباد پلەی نوێنەرایەتی فەرهەنگی مهابادی هەبوو بەڕێزیان (سەیفولقوزات) بوو. (بژارکار، قادری فەتاحی قازی)

شووړای میللی کەوتە مێشکییەوە و پشتێنەی ناوچەیی لە هەموو بارێکەوە ئامادە کردبوو و سەرەڕای کارشکێنی و چەت و قورتی زۆر لە لایەن دژبەرانییەوە کە دەهاتە سەر ڕێی، زۆربەی دەنگی ئاسایی وەدەست هێنا. بەڵام دواجار دەنگەکان یان سندووقی نوێنەرایەتیی ئەویان گۆڕی و دەنگی زۆربەیان بەناوی عەلی خانی حەیدەری خاوەن موڵکی حاجیاڵیکەند ڕاگەیاند. بەو پێیە عەلی خانی حەیدەری، پێنج شەش خول کورسیی نوێنەرایەتیی مهابادی کردبووە تەرخانی خۆی، بەبێ ئەوەی بتوانێ کارێکی باش بۆ مهاباد و دەوروبەری بکا یان لە جێدا لە ناو مەجلیسدا خۆیەک نیشان بدا یان متەقی لێوە بێ.

ئەو شکانە سیاسییە سەیفی لە چالاکیی سیاسی نائومێد کرد و خۆی کشاندەوە، لە جیاتیان چووە دێ و ژیانی لادێی بەسەر شارنشینیدا بەپەسندتر زانی. گوندەکانی گوێگجەلی، موشیرابات، عەبدوڵابات، کانی کووزەڵە کە لە کاتی وێرانبوون و چۆلکردنیاندا بەبرێکی کەم لە بەجێماوانی حوسێن بەگی سنجاغ کڕیبوونی، لە ماوەیەکی کورتدا بەتەواوی ئاوەدان کردەوە. دەستێک خانووبەرەی یەکجار زۆرچاکی، خالیس لەبەردی کانگا – ئەندەروون و بیروونی – لە دێی گوێگجەلی دروست کرد.

خوالێخۆشبوو سەیف بەعیشق و مرخێکی هەرە زۆرەوە دەستی کرد بەدروستکردنی باخ و قەڵەمە لێدان بەشێوەیەکی ئاوا لە ماوەیەکی کورتدا باخی جۆر بەجۆری ساز کرد کە داری ئەو باخانە لە ژمارە نەدەهاتن. باخێک بەڕووبەری چەند هێکتار تەنێ باخی ترێ و باخێکی دیکە خالیس سێو بوو و بەو جۆرە بۆ هەر چەشنە میوەیەک باخێکی چڕی ساز کردبوو. قەڵەمەکانی ئەوێ (ئی گوێگجەلی) ڕەنگە لە میلیۆنێکیش زیاتر بووبن. هەر کام لەو باخانە ناوی تایبەتییان هەبوو کە سەیفولقوزات بۆخۆی ناوی لێ نابوون. ئەو باخانە بەتەواوی لە ڕووی پرێنسیپەکانی موهەندیسی و لەلایەن ئەو پسپۆڕانەی لە شارەکانی تەورێز و ورمێوە هێنابوونی ساز کرابوون و خەڵقی ئەوانی لە چەشنی هەرە باش و لە شوێنی دوورەدەستەوە ئامادە کردبوو. هەرباخەی بەڕادەی کافی باخەوانی بەمشووری هەبوو، ئەوانیشی لە مەراغە و تەورێز و ورمێوە هێنابوو. لەو باخانەدا دار میوەی جۆراوجۆر بەشێوەیەکی جوان سرنجی مرۆیان ڕادەکێشا.

خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات نموونەی خۆش سەلیقەیی و وردی بوو.[1] لە ماڵی ئەو

---

١- تەقریبەن هەر قسەیەکی ئەوتۆشم لە خوالێخۆشبوو مامۆستا سەید حەسەنی قازیی تەباتەبایی مامۆستای زمان و ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی زانکۆی تەورێز بیستبوو. ئەو خوالێخۆشبووە لەگەڵ سەیفولقوزات لە نزیکەوە ناسیاوی هەبوو

خودالێخۆشبووەدا دەستە دەستە باشترین مافوورە چنی تەورێز و ورمێ لە تەواوی ماوەی ساڵدا ئامادە بوون و لە باشترین چەشنی خوریی کوردستان مافوورەیان دەچنی. مرۆ کاتێک دەچووە ناو ژوورە ڕەنگین و ڕازاوەکانی ئەو خودالێخۆشبووە، باشترین فەرش و قالیچەی ئێرانیی وەبەرچاو دەکەوت، بەتایبەتی ئەو مافوورانەی نەخشەکانیان بەپێی قسەی ئەو خودالێخۆشبووە شا سەفی بوو. ئەوان ئینسانیان وەبیر سنعاتی مافوورەچنینی بەرزی دەورەی شایانی سەفەوی دەخستەوە و مرۆ بێ ئیختیار ئافەرینی دەکرد لە خۆش سەلیقەیی و مرخی تایبەتی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات بۆ زیندووکردنەوەی ئاسەواری سنعاتی دەستیی ئێران.

ئەم نووسەرە چەندین جار لە کات و سات و هەلومەرج و بارودۆخی جیاوازدا ماڵی سەیفولقوزاتم لە دێی گوێگجەلی دیتووە، جارێکیان لە خزمەت بابمدا لە وەرزی هاوینێ ئەوکاتەی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات هێشتا هەر مابوو چووم. گوندی ناوبراو بەڕاستیش نموونەیەک بوو لە بەهەشت: لایەک مەزرای سەوز و زەنوێر، لایەکی دی چۆمی جەغەتوو، بەتەنیشتییەوە باخی بەسەفا و زەنوێر و داری چنار و نارەوەن سەریان لە ئاسمان دەخشا و مێشەی خۆرسکی تا چاو هەتەری دەکرد درێژ دەبووەوە. ژووری خاوێنی سپیکاری کراوی تەیار و مافوورەی پڕ قیمەت و ناسک لێ ڕاخراو، لە ژووری بێروونی ئەو خودالێخۆشبووەدا دەور تا دەور خانان و خاوەن موڵکان دادەنیشتن، خودالێخۆشبوو ئاغای سەیف بەو پەڕی ئەدەب و ویقارەوە دادەنیشت و خەریکی باس و خواسی دینی، ئەدەبی، عیرفانی، کشتوکاڵ و قسەی پەراگەندە دەبوون، جارجاریش گاڵتەوگەپ دەکرا و پێکەنین و خۆشحاڵی وەبەر هەمووان دەکەوت. شیو و نانی نیوەڕۆی ڕێکوپێک و هەموو چەشنە لە سەر مجۆعمەی مسیی خاوێن لە سەر شانی نۆکەرانەوە دەهێندرا مەجلیس.

بەیانیان، دوای بەرچایی و چا خواردنەوە، بەرنامەی گەڕان بەباخەکاندا دەستی پێ دەکرد. دەستە دەستە کەسانی هاوتەمەن بەیەکەوە لە باخە بەسەفا و زەنوێرەکاندا لەگەڵ خانەخوێی ڕووخۆشی خۆیان دەگەڕان و جار جار بۆ ماندوو حەسانەوە لە بن سێبەری فێنکی دارەکان لە سەر گیاوگژ یان لە سەر مافوورە دادەنیشتن و لە میوەی تازەی باخیان دەخوارد. لاوەکان لە چۆمی خاوێن و ڕوونی جەغەتوودا مەلەیان دەکرد یان لە باخەکاندا خەریکی ڕاوی کۆتر دەبوون. ئەو چەند ڕۆژەی لەوێ بووم بەهیچ جۆر هەستم بەدڵتەنگی نەکرد، باخەکانی ئەوێ (ئی گوێگجەلی) ئەوەندە دیدەنی و دڵکێش بوون دەرفەتی خوێندنەوە نەبوو و کاتم نەبوو لەو هەموو کتێبە باشە ئەدەبی و مێژووییانەی لە سەر

تاقەکان بۆ خوێندنەوەی میوانان داندرابوون، کەڵک وەربگرم. دوای چەند ڕۆژ بەدنیایەک چێژ و شادییەوە لە مەحزەری ئەو خوداڵێخۆشبووەرا گەڕاینەوە. باشم لە بیرە لەو سەفەرەدا کتێبی عالەم ئارای عەبباسی لە نووسینی ئەسکەندەربەگی تورکمانم بینی کە بەخەتێکی زۆر جوان نووسرابووەوە، بەو جۆرەی کە خوداڵێخۆشبوو سەیف دەیگوت ئەوە خەتی نووسەر خۆی بوو.

جاری دووەم، بەبۆنەی کۆچی دوایی[1] سەیفولقوزات چوومە گوێگجەلی. دیارە لە کاتی ئاوادا لە هەموو لایەکەوە غەم و پەژارە دەبارێ. دوای دوو شەو و ڕۆژ لەوپەڕی داخ و حەسرەتدا گەڕامەوە مهاباد. تازیە و پرسەی بەڕێزیان بەو پەڕی ڕێزلێنان و حورمەتەوە بەڕێوەچوو. بەو بۆنەیەوە لە شاری میاندواو ڕۆژێک دووکان و بازاڕ داخران.

جاری سێیەم لە کاتی شاییی ڕەحیم ئاغا کوڕی سەیفولقوزات لەگەڵ خاتوون گەوهەرتاجی سەدری قازی چوومە ماڵی خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوازت لە دێی گوێگجەلی. ڕەحیم ئاغا و برای گەورەی خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی لە زۆرکەس لە دۆستان و ئاسیاوان و تاکوتەرای بنەماڵەیان گێڕابووەوە و بانگهێشتنامەیان بۆ ناردبوون، لەوانە ئەمنیش و خەریکی ئامادەکردنی وەسیلەی سەفەر بووم (بەماشین، یان سواریی ئەسپ) دیتم کەسێک هات و گوتی: جەنابی قازیی محەمەد دەفەرموون، ئەگەر فڵانکەس دەچێ بۆ دێی گوێگجەلی، ئەمنیش بەرەو ئەوێ دەچم و لە ماشێنەکەمدا جێ هەیە، زوو خۆی ئامادە بکا با بەیەکەوە بچین. ئەو هەڵکەوتە باشەم زۆر پێ خۆش بوو، دەستبەجێ تایەک برینجی سەدری و چەند پرێسکە چام بەڕەسمی دیاری بۆ ماڵی زاوا کڕی و جلوبەرگی کوردیم دەبەرکرد و تفەنگ و دەمانچەم هەڵگرت کە ئەو دەمی هەڵگرتنی تفەنگ بۆ هەموو کەس ئازاد بوو و وەڕێ کەوتم. ماشێنی جیپی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لەبەر دەرگای شارەبانی (پۆلیس) ڕاگیرابوو، قازی ئەو دەمی پلەی سەرۆک کۆماری کوردستانی هەبوو[2]، چووە سەر پلیکانان و قسەی بۆ خەڵک کرد. لە نەبوونی خۆیدا، داوای لە خەڵک دەکرد هێوری و لە سەرەخۆیی و یەکێتی و ڕێکیی خۆیان بپارێزن و

---

١- خوالێخۆشبوو سەیفولقوزات لە ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و لە خانەقای شەمسی بورهان نێژراوە. کتێبی: زندگی نامەء عارف ربانی... لاپەڕەی ٣٩٥ (تێبینی وەرگێڕ سەیف لە ئێوارەی ٧ی ڕێبەندانی ١٣٢٣ی هەتاوی بەرانبەر بە ٢٧ ی ژانویەی ١٩٤٥ کۆچی دوایی کردووە)

٢- شاییی ڕەحیم ئاغا لە دە ڕۆژی کۆتایی خەرمانانی ١٣٢٤ی هەتاوی (بەر لە ڕاگەیاندنی کۆماری مهاباد) کراوە. کەوابوو لەو بەروارە دا خوالێخۆشبوو قازی محەمەد پلەی سەرۆک کۆماری کوردستانی نەبووە (بژارکار قادری فەتاحی قازی)

هەروەها بە سەربەستراویش گوتی سەفەرێکی لە پێشە، لە نەبوونی خۆیدا پێویستە زیاتر لە جاران بۆ پاراستنی هێمنی و ئارامی تێ بکۆشن. قسەکانی بەڕێزیان لەگەڵ دەربڕینی هەست و بژی بژی گوتنی خەڵک کۆتایی هات. ئەوکەسانەی لەگەڵ بەڕێزیان بوون بریتی بوون لە ئاغای میرزا مەنافی کەریمی کە لە حکوومەتی قازیدا وەزیری فەرهەنگ بوو و میرزا عەلیی ڕیحانی و یەک دوو کەسی تر کە ناویانم لە بیر نەماوە و ئەم نووسەرە. سواری ماشێن بووین و وەڕێ کەوتین. لە ڕێیە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە میرزا مەنافی کەریمی کە لە تەنیشت بەڕێزیان دانیشتبوو پرسی: قسەکانمت پێ چۆن بوو؟ میرزا مەنافی کەریمی دەستبەجێ دەستی کرد بەپێداهەڵگوتن و گەورەکردنەوە و گوتی پێم وانییە هیچکەس بتوانێ ئاوا ڕەوان و بێ گرێ قسە بکا. پاشان خوداڵێخۆشبوو ڕووی لە من کرد کە لە ریزی دواوەوەی ماشێنەکەدا دانیشتبووم و گوتی: فلانکەس بۆچوونی ئێوە لەو بارەیەوە چییە؟ گوتم ئەگەر ئیزن بفەرمووی بۆچوونی خۆم بێ لامەکردن و مەرایی عەرز دەکەم. گوتی: بیڵێ. عەرزم کرد: حەزرەتی پێشەوا[1] وشان زۆر دووپاتە دەکەنەوە و بێ پەردە و ڕەپ و ڕوو و بەڕاوێژی هەڕەمەی خەڵک قسە دەکەن. خوداڵێخۆشبوو قازی لە وڵامدا فەرموویان. لەسەر ڕەخنەیەی یەکەم تێ دەکۆشم دووپاتەکردنەوەم زۆر نەبێ و لە بەشی دووەمدا کە گوتت بابەت بێ پەردە و بەزمانی هەڕەمەی خەڵک دەردەبڕم، مەبەستم ئەوەیە ئەو قسانەی دەیکەم، خەڵکی ئاسایی و کەسانی نەخوێندەواریش تێیان بگەن و هەرچۆنێک بێ تێ دەکۆشم لە نوتقەکانی دواتردا بۆچوونی ئێوە لە بەرچاو بگرم.

هەرچۆنێک بێ سەعاتێک لە شەو تێپەڕیبوو لەبەر خانووی ئەربابیی دێی گوێگجەلی ماشێنەکە ڕای گرت. بەدەنگی سیگناڵی ماشێنەکە ژمارەیەک لە نۆکەرەکانی ماڵی حەمەحوسێن خان هاتنە دەرێ. هەر کە میوانان لە هاتنی قازی محەمەد ئاگادار بوون، حەمەحوسێن خان و ڕەحیم ئاغا و هەموو میوانەکان هاتنە دەرێ و بەرەوپیلی قازی محەمەد و میوانە تازەکان هاتن و بەخێرهاتنیان کردن. دەستەیەک موتریب کە لە تەورێزەوە هێنابوویانن، ئەوانیش بەخەیاڵی وەرگرتنی شاباش هاتنە پێشواز بەڵام کاتێک مەندیلی سپیی قازی محەمەدیان بینی لەوپەڕی ئەدەبدا ڕاوەستان، کڕنۆشیان برد و حورمەتیان بەجێ هێنا. قازی چاکوچۆنیی لەگەڵ کردن و فەرمووی ئەنعامیان بدرێتێ. ئەو شەوە مەجلیسەکە بۆ ڕێزلێنان لە قازی محەمەد بێ تەقە و ڕەقە، بەڵام بەشادی و خۆشحاڵییەوە تێ پەڕی.

---

١- بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ٧

سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لەگەڵ خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و میرزا عەلی ڕیحانی بەرەو بادکووبە چوون، لە کاتی ڕۆیشتنیان، خودالێخۆشبوو محەمە حوسێن خان ڕووی لە من کرد و پێی گوتم ئەمن ناچارم بچم بۆ سەفەرێکی درێژ ئێستا کە ئەمە ڕێوڕەسمی شایی براکەم بەڕێوەیە و ئەمن لێرە نابم، ئێوە خاوەن ماڵن و دەبێ ئەرکی خانەخوێیی بەجێ بهێنی و بەشێوەیەکی شیاو میوانداری لە میوانان بکەی و هەرچییەک پێویستە فەرمان بدە ئامادەی بکەن بۆ ئەوەی چ خەوش و کەموکوورییەک نەیەتە گۆڕێ.

خودالێخۆشبوو قازی محەمەد و هاوڕێیانی بێ ئەوەی باسی مەقسەدی سەفەری خۆیان بکەن وەڕێ کەوتن. هەر دەستبەجێ دوای ڕۆیشتنی ئەوان بەزم و هەڵپەڕکێ دەستی پێ کرد، دەنگی گۆرانیبێژان و ناڵەی باڵەبان و تەقەی دەهۆڵ و زوڕنا گوێی فەلەکی کەڕ دەکرد. دەستە دەستە کەسانی هاوڕەنگ لە دەوری یەکدی کۆ دەبوونەوە. میوانی بانگکراو و بانگنەکراو ئەوەندە زۆر بوو زوربەی ماڵەکانی ئاوەدانییەکە و خانووبەرەکانی ئەندەروونی و بێروونی لە میوانی ژن و پیاو جمەی دەهات و لەبەرئەوەی هەموو کەلێن و کەلەبەرێک لە حەشیمەتی ژن و پیاو پڕ بووبوو و ئیدی شوێنێک نەمابوو، بۆ ژمارەیەک لە میوانان لە ڕووبەڕووی خانووبەرەی ئەربابی لە سەر تەپۆڵکە چادریان لێ دابوو و هەندێکانیش لە باخیدا دامەزرابوون. خەڵکێکی زۆرلە پێش خانووی ئەربابی خەریکی هەڵپەڕکێی ئاسایی کوردی بوون. ژمارەیەکیش نیشانەیان داکردبوو و بەدەمانچە و تفەنگ خەریکی تەقەکردن بوون. دەستەیەکیش خەریکی قومار بوون بەوەرەق، هەندێکان لە خۆشی پارە بردنەوە زۆر شاد و دەم بەپێکەنین بوون و هەندێکانیش کە دۆڕاندبوویان لە داخان و لەبەر غەم و پەژارە ملیان بەلارەوە نابوو. بەساڵداچوو و ڕدێن سپی و سۆفی مەسلەکانیش لە چادردا بوون، بەقسەی عارفانە یان باسوخواس سەبارەت بە کاروکاسبی و کشتوکاڵ و ژماردنی دەستکەوتەکانی چەوەندەر و قەندی کارگەی میاندواوەوە خەریک بوون. هەرچییەکیان ویستبا هەبوو: سەرتاش، کەوشدروو، واکس، سەڕاج و ناڵبەند، سیغار و شەمچە فرۆش. فرۆشەران لە دەوروبەری خانووی ئەربابیدا دووکانێکی کاتییان دانابوو، خەریکی سەودابوون. لە ناو میوانانی ئەو شاییەیدا لە هەموو جۆرە تایفە و هەموو جۆرە کەسێک وەبەر چاو دەکەوت: تارانی، تەورێزی، خەڵکی ورمێ، میاندواوی، مەراغەیی، تاجر، خاوەن موڵک، عەشیرەت، خان و ئاغاوەت، ئیداری، ئەفسەر و هەموویان ئازادانە خەریکی تەفریح و شادی بوون.

ماوەی حەوتوویەک ئاوا دەرباز بوو. پاشان ڕاگەیێندرا، دەبێ سەفەری مهاباد بکرێ بۆ هێنانی بووک. نزیکەی چل دەستگا ئوتوبۆس و ماشینی سواری بۆ گوێستنەوەی بووک بەرەو مهاباد وەڕێ کەوتن. لای نیوەڕۆ گەیشتنە مهاباد. دوای دووسەعات خانمی بووک لەگەڵ چەند کەس لە خانمەکانی خزمی نزیک، سواری ماشین کرا کە بەگوڵی جۆراوجۆر و پارچە ڕازێندرابووەوە. کاروانی ماشێنەکان لەگەڵ ماشینی خانمی بووک لەگەڵ چەند ماشێنی دی کە لە مهاباد لەگەڵ ئەو کاروانە کەوتبوون، بەرەو ماڵی زاوا وەڕێ کەوتن. دەنگ و هەرای ماشێنەکان و دەنگی موسیقی و گۆرانیی گۆرانیبێژەکان، دەنگی تیر هاویشتن و تەقەکردن، مەحشەرێکی ساز کردبوو قەڵەم دەرەقەتی باسکردنی بەوردەریشاڵی، نایە، کاروانی ماشێنەکان بەناوەڕاست شەقامی میاندواودا تێ پەڕی و تەقریبەن سەعاتێکی بمێنێ بۆ تاویەڕان، ماشێنی هەڵگری بووک گەیشتە بەردەرگای خانووی ئەربابیی دێی گوێگجەلی و خانمی بووک دابەزی. دوای ئەوەی هەندێک ئەسکیناس و قەرە پووڵ و شیرنییان بەسەر بووکدا هەڵاویشت و بڵاو بووەوە، منداڵان بۆ کۆکردنەوەی ئەسکیناس و قەرەپووڵەکان سواری سەری یەکدیی بوون و خانمی بووک لەتەک ئەو خانمانەیدا لەگەڵی هاتبوون برانە ناو خانووبەرەکە. دوای یەک دوو ڕۆژ بەرە بەرە هەرکەسە چووەوە سەر ماڵ وحاڵی خۆی. بەو پێیە ڕێورەسمی شایی و بووک گوێستنەوە کۆتایی هات. وەک باسیان دەکرد لەو شاییەدا جگە لە خەرجی جلوبەرگ و زێڕ و خشڵی بووکێ و جگە لەو شتانەش کە بۆ خۆیان لە ماڵیدا هەیانبوو و خەرج کرابوو. تەنێ خەرجی میوانداری لە شەش سەد هەزار ڕیاڵی تێ پەڕاندبوو.

خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات بۆ خوازبێنیی هەر ئەو خانمە بووکە - کچی خودالێخۆشبوو ئاغای سەدری قازی - حەول و کۆششێکی زۆری دەکرد و زەحمەتێکی زۆری وەسەرە خۆی دەهێنا، چونکو خودالێخۆشبوو سەدری قازی و دایکی بووکێ ئەو پێوەندییەیان پێ خۆش نەبوو و هەر ڕۆژەی برو بیانوویەکیان دەهێناوە تا ئەو جێیەی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات لەو جووڵانەوەی ئەوان یەکجار زۆر دڵمەند بووبوو، بەڵام دواجار توانیی دڵی دایک و بابی بووکێ وەدەست بهێنێ، بەڵام هەزار حەیف و مخابن خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات تەمەنی وەفای نەکرد، بەرو بووی زەحمەتەکانی خۆی و شایی کوڕەکەی کە بەو جەلال و گەورەییەوە بەڕێوەچوو ببینێ، چونکو ئەودەمی ئاغای سەیف لە ژێر بەخەڵواران گڵی ڕەشدا، بۆ یەکجاری چاوی لە سەر یەک دانابوو. بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئەو دەمی زیندوو بایە، ئەو پیاوە ئەدیب و خاوەن زەوقە قەسیدەیەکی

پڕ ئاو وتاوی بەو بۆنەیەوە دەهۆندەوە و شاکارێک لە شاکارە هەرمانەکانی زیاد دەبوو.

جارێکی دیکە کە چوومە زێد و داڵدەی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات واتە دێی گوێگجەلی، کاتێک بوو لە ساڵی ١٣٢٨ی هەتاوی بۆ ڕاپەڕاندنی ڕاسپاردەیەکی ئیداری ڕێم دەوێ کەوتبوو. لای نیوەڕۆ بوو، نووسەر(ی ئەم دێڕانە) و چەند مەئمووری دوخانیات کە لەگەڵم بوون لە پێش هەمان خانووبەرەی پێشتر باسی چلۆنایەتی ویم کرد، لە ئەسپ دابەزین. بێدەنگییەکی خەفەتاوی و دڵپەشێو باڵی بەسەر کەشو هەوای خانووبەرەی ناوبراودا کێشا بوو کە هەندێک دوورتر لە دێیەکە هەڵکەوتووە. هیچکەس بەدەور و بەری خانووبەرەکەوە دیار نەبوو. ڕەحیم ئاغا کە باسی ڕێوڕەسمی شایی ئەوم بۆکردن، چوار ساڵ پێشتر بۆ خوێندن چووبووە بادکوبە. برای گەورەتری خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان و خەزووری سەدری قازی و ئامۆزای خودالێخۆشبوو قازی محەمەد سێ ساڵ پێشتر لە مهاباد لە لایەن دەوڵەتەوە ئیعدام کرابوون.[1] خانمەکەی چووبووە لای دایکی لە تاران

(هاوسەری خودالێخۆشبوو سەدری قازی). دایکی ڕەحیم ئاغا مێردی کردبووەوە بەبرای نووسەر سەرهەنگ حەسەنی فەتاحی قازی و لە تاران دەژیا، برای پچووکی عەبدوڵا کە منداڵێکی شەش حەوت ساڵان بوو لە تاران دەچووە مەدرەسە، لە بارو دۆخێکی ئاوادا بەهەڵکەوت ئەمن لەو دێیە ڕاسپاردەی ئیداریم هەبوو. لە پێش خانووبەرەی گەورەی ئەربابی کە دیوارەکانی بەتەواوی لە بەرد بوو و لە سەر تەپۆڵکەیەک هەڵکەوتبوو کە لای باکوری چۆمی جەغەتوو و باخ بوو و لای تریشی دێیەکە و مەزرا بوو، لەگەڵ هاوڕێکانم دابەزیبووین، تەقریبەن نزیکەی نیوسەعات لەوێ ڕاوەستاین، و لەو خانووبەرە گەورەیەدا کە پێشتر هەمیشە پڕ بوو لە میوان و نۆکەر و مافوورەچن و کەنیز و ئاشپێژ و باخەوان و هتد، زیرووحێک بەدیارەوە نەبوو.

بەبینینی ئەو بارودۆخە، حاڵەتێکی حەپەسانم بەسەردا هاتبوو، وردە وردە چوومە بەر دەروازەی خانووبەرەکە، دەرگاکە کە پێشتر شەو و ڕۆژ ئاواڵە بوو و شەوانە چەند کێشکچیی پڕچەک لەوێ ڕادەوەستان و پاسی خانووبەرەی ئەربابی و دێیەکەیان دەدا، داخرابوو، قفڵێکی گەورەیان لێ دابوو. قفڵەکە ژەنگی هێنابوو و دەردەکەوت دەبێ لەمێژ بێ خانووبەرەکە کەسی تێدا نەژیابێ و قفڵەکە نەکرابێتەوە. مەیدانی پێش خانووبەرەکە

---

١- ڕۆژی دووشەمۆ دەیەمی خاکەلێوەی ١٣٢٦ی هەتاوی.

بەپێچەوانەی ڕابردوو کە لەبەر خاوێنی و پاکیی هەموو بینەرێک شایی لە دڵیدا گەڕا، پڕ بوو لە خاکوخۆڵ و زبڵوزاڵ و ئیسکوپرووسکی ئاژەڵی مندارەوە بوو. چاوێکم لە دەر و دیوار کرد هەموو جێیەک وێران و خاپوور بوو و جاڵجاڵووکە تەونی لێ ڕایەڵ کردبوو، تا ئەو دەمی هێشتا کەس نەهاتبوو بپرسێ ئێوە چکارەن و چتان دەوێ و لە کوێوە هاتوون؟ بارودوخی زەمانی ڕابردوو بەتایبەتی ڕۆژانی شاییی ڕەحیم ئاغا هاتەوە بەر زەینم، کاتێک بارودۆخی پێشووم لەگەڵ ئەو وەزعە دڵتاوێنە بەراورد کرد، بێ ئیختییار فرمێسکی حەسرەت لە چاوم هاتنە خوارێ و بەزمانی حاڵ گوتم: تعز من تشاء و تذل من تشاء بيدك الخير انک علی کل شی ء قدير[1] تەنێ خودای بەتەنێ لە دۆخێکدا دەمێنێتەوە. خودایا گەلۆ من خەون دەبینم یان وشیارم ؟ چوارساڵ لەمەوپێش چم دی ؟ دیمەنێک لە بەهەشت. پڕ لە حۆری و غیلمان، هەموو شاد و دەم بەپێکەنین. ئێستا چ دەبینم ؟ هیچ، وێرانە، خاکوخۆڵ، تەونی جاڵجاڵووکە، بێدەنگیی ترسێنەر، دیمەنی خەفەتاوی و دڵکوڵ، خولایە جەلال و گەورەیی هەر بۆتۆ هەتاهەتاییە، نەک بۆ ئیدی.

لەو بیرە دوورو درێژەوە چوو بووم، ژنێکی لادێی خەڵکی ئاوەدانییەکە بەرەو جۆگە دەچوو و هەرکە نزیک بووەوە بەزمانی کوردی لێم پرسی: خوشکێ کێ لەم خانووبەرەیەدا دەژی ؟ کەیخودا و ڕدێن سپی ئەم گوندە کێیە؟

ژنەکە بەدەنگێکی بەسۆز و دەرداوی گوتی: خاوەن موڵکی ئەم گوندە و ئەم خانووبەرەیە محەمەد حوسێن خان بوو کە لە داریان دا، برای پچووکی ڕەحیم ئاغا لە رووسییە دەخوێنێ، دایکی ڕەحیم ئاغا ئەم گوندەی بەیەکێک لە خاوەن موڵکانی خەڵکی مەراغە بەئیجارە داوە. ئیجارەداری ناوبراو بۆ خۆی لە مەراغە دەژی، بەڵام لێرە نومایەندەیەکی هەیە کە بۆ وەرگرتنی دانەوێڵەی بەشی ئاغا چووتە سەر خەرمان. ئێرە چۆڵە، کەیخودا و ڕدێن سپیی ئەم گوندە میرزا خەلیلی قزلباشە کە ماڵی لە ناو دێیەکەدایە و بەدەست خانووی کەیخودای ناوبراوی نیشان دام. لەبەرئەوەی ئەم نووسەرە میرزا خەلیلی ناوبراوم لە دەستگای خودالێخۆشبوو سەیفولقوزاتدا پێشتر دیتبوو و، دەمناسی و ماندوو و برسییش بووم، بۆیە بۆ حەسانەوە و نانخواردن چوومە ماڵی میرزا خەلیل لە ماڵی میرزا خەلیل، ئێمەیان بردە دیوێکی چکۆڵە. میرزا خەلیل بۆ بەسەر ڕاگەیشتنی کاروبار چووبووە مەزرایێ، بەدوویدا چوون، دوای نیوسەعات هاتەوە ماڵ، دوای سڵاو و چاکوچۆنی و بەخێرهێنان لە لامان دانیشت. ناوبراو دوای چەند قسەیەک، بەیادی زەمانی ڕابردوو و

١– ئالی عیمران، ئایەی ٢٦

جێ و جەلالی خانەدانی خودالێخۆشبوو سەیف بێ ئیختیار لە پرمەی گریانی دا، ئەمنیش هەستی خزمایەتی بەسەرمدا زاڵ بوو و گریام و مەجلیسەکەمان لێ بوو بەعەزا. دوای دوو سەعات پشوودان و نانخواردن و لێکۆڵینەوە سەبارەت بەڕاسپاردەیەکی ئیداری کە لەوێ هەمبوو، بەدڵێکی پڕ لە دەرد و جەخارەوە گوندی ناوبراوم بەجێ هێشت.

خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات، هەروەک باس کرا، بەر لەوەی پیر و بێ تاقەت ببێ، زۆر جێ لە کن خۆش بوو و بۆ گەیشتن بەپلەی بەرز زۆر بەجیددی تێ دەکۆشا. پیاوێک بوو ئازادیخواز، نەوعدۆست و بێ ئازار، بیربەرز، مۆدێرن، بەشارستانی، بەدین، ئەدیب، شاعیر، خۆشخەت، قسەزان، تێکۆشەر، زۆربەی کاتی بەختی کاروبار بۆ بەرژەوەندیی گشتی و بۆ خزمەتی خەڵک دەکرد. ئەگەرچی حەوڵەکانی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات بۆ گەیشتن بەکورسیی نوێنەرایەتی مەجلیس نەگەیشتە هیچ کوێ و قۆڵیان لە سەر نوێنەرایەتی ئەو نەکێشا، لەگەڵ ئەوەشدا هەتابڵێی لە لای خەڵک و کاربەدەستانی دەوڵەتی جێی ڕێزبوو و حورمەتی ویان لەبەر بوو. لە سەردەمی ڕەزاشادا بەو کەسانەی کە مەئمووری ڕەسمیی دەوڵەتی نەبوون، مووچە و مەواجبیان نەدەدا، بەڵام خودالێخۆشبوو سەیف مووچە و مەواجبی دەوڵەتی هەبوو و مانگ بەمانگ ئەو مووچەیەی لە سندووقی دارایی مهاباد یان مەراغە وەردەگرت.

لە سەردەمی ئەمیر عەبدوڵاخانی تەهماسبی[1]دا کە فەرماندەی لەشکری ئازەربایجان بوو، لە دەوروبەری بانە حەمە ڕەشید خان ڕاپەڕینێکی ساز کرد. هێزی دەوڵەتی لەگەڵ عەشیرەتەکانی دەوروبەری مهاباد بۆ کوژاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینە بەرەو بانە چوون. دوای شکانی تاکوتەرای حەمەڕەشید خان، سەیفولقوزات و ژمارەیەک لە ئاغاوەتی مهاباد بۆ پێشوازی لە ئەمیرلەشکر تەهماسبی تا قاوەخانەی دێی دەرمان[2] چوون. ژمارەیەکی زۆر لە سوارەی مەنگوڕ، دێبۆکری، مامەش و عەشیرەتەکانی دیکە لەگەڵ ئەمیرلەشکر تەهماسبی بوون.

ئەمیر تەهماسبی دوای نوتقێک، پێوە دەبێ، بەبۆنەی سەرکەوتنی عەشیرەتەکانی

---

١– لە خاوەن مەنسەبان و پیاوانی بەڕایی سەردەمی پەهلەوییە. لە خاکەلێوەی ساڵی ١٣٠٧ بەرانبەر بە ساڵی ١٣٤٦ی کۆچیی مانگی لە سەر ڕێی برووجێرد ــ خورەماباد بە دوای تەقەیەکدا کە لێی کرا، کوژرا (سەرچاوە: اعلام معین)

٢– دەرمان دێیەکە لە ڕۆژهەڵاتی مهاباد، لە سەر ڕێی مهاباد بۆ بۆکان لە نیوکێلۆمیتریی باکووری ئەوێ هەڵکەوتووە.

دەوروبەری مهاباد بەسەر حەمەڕەشیدخانی بانەدا، ئالایەک بدا بەیەکێک لە عەشیرەتەکانی مهاباد. بەلام لەبەرئەوەی عەشیرەتەکانی مهاباد رقەبەرییان لە تەک یەکدیدا هەبوو (بەتایبەتی مەنگوڕەکان لەگەڵ دێبۆکرییەکان)، بەئەمیر تەهماسبی گوترابوو – مەسلەحەت نییە – ئالاکە بدا بەیەکێک لەوان، چونکو لەوانەیە ئەوە ببێتە هۆی شەڕ و پێکدادان و خوێنڕێژی لە نێوان عەشیرەتەکاندا. ئەمیر تەهماسبی گوتبووی ئێمە بۆ گشت عەشیرەتەکان ئالایەکمان تەرخان کردووە، کەوابێ ڕێگای چارەسەری ئەوە چییە؟ یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان گوتبووی: بنەماڵەی قازی لەلای هەموو عەشیرەتەکان بەڕێزە و ئەو بنەماڵەیە خۆی عەشیرەت نییە، ئەگەر ئالاکە بدرێ بەبنەماڵەی قازی، کەس ناڕازی نابێ و هەموو ئەو کارەیان پێ خۆش دەبێ. ئەمیر تەهماسبی ئەو تەگبیرە پەسند دەکا و ئالاکە تەسلیمی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات دەکا کە لەوێ ئامادە دەبێ. ئالای گۆڕین کە نیشانی شێروخورشید و ڕیشووی ئاوریشم و قوبەی زێرکفتی لەسەر بوو، بۆ ماوەی دوور و درێژ لە مەحکەمەی خودالێخۆشبوو قازی عەلی و کوڕەکەی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد سرنجی ڕادەکێشا.

خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات و برا گەورەکەی قازی عەلی لە ڕاپەڕینێکدا کە سمایل ئاغای شکاک کردبووی، هاوکاری و هاوڕێییان لەگەڵ نەکرد. بۆیە کاتێک سمایل ئاغا هێرشی کردە سەر مهاباد، فەرمانی دابوو بەسوارەی خۆی ئەوان بکوژن. تفەنگچییەکانی سمایل ئاغا کە نەیاندەناسین و نابەڵەد بوون، لە جیاتی قازی عەلی، قازی (لەتیف)یان کوشت کە ماڵەکانیان لەیەک نزیک بوون و لە قازیی (عەلی)یان دابوو و جلوبەرگی (مەلایەتی) یان لە بەر داکەندبوو. لەبەر ئەوەی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات لە کاتی هێرشی سمایل ئاغا بۆسەر مهاباد لەوێ نەبوو، شکاکەکان دەستیان وێ ڕانەگەیشت و سمایل ئاغا هەڕەشەی کردبوو و گوتبووی هەرکاتێک جالینووس(١) ببینێتەوە، دەستبەجێ لە کێوی ڕا جاڵەی دەکاتە خوارەوە و لەنێوی دەبا. لەبەرئەوەی دەستەلاتی سمایل ئاغا لە دەوروبەری ورمێ و مهاباد چەندین ساڵی خایاند و دەوڵەتی نێوەندی لەوپەڕی لاوازی و پەرێشانیدا بوو، خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات و بەگشتی بنەماڵەی قازی لە سەردەمی دەستەلاتی سمایل ئاغادا هەمیشە لە ژێر گوشار و دەمەترسیدا بوون، ئاغای سەیفولقوزات دوای دەستبەردان و نائومێدی لە دەوڵەتی نێوەندی، بۆ ڕزگاری لە گوشاری

١– بابم هەر لێرە لە نێو کەوانەدا لێی زیاد کردووە: سمایل ئاغا نێوی خوالێخۆشبوو سەیفولقوزاتی نابوو جالینووس.

سمایل ئاغا و ئەو بارودۆخە نالەبارە، خۆی دا دەست قەزا و قەدەر و بۆ دیداری سمایل ئاغا دەچێ بۆ دێی چاری و، هەر کە چاوی بەسمایل ئاغا دەکەوێ، پێی دەڵێ: بەپێی خۆم هاتووم بەتایبەتی بۆ ئەوەی فەرمانی ئێوە بۆ جاڵەکردنەوەم لە کێویرا جێبەجێ بکرێ. سمایل ئاغا – بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەڕێ دەکرا – سەیفولقوزات بەڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە بەخێرهاتن دەکا و لەو ئاکارەی لەگەڵ بنەماڵەی قازی کردبووی، داوای لێبووردن و پەشیوانی دەکا. دوای چەند ڕۆژ مانەوەی سەیفولقوزات لە لای سمایل ئاغا، لەبەر توانایی و کارتێکەرییەکی کە سەیفولقوزات لە قسەکردن و بەیاندا هەیبوو، سمایل ئاغا فرووسماوی دەبێ و ڕۆژ بەڕۆژ لە گەورەیی و ڕێزی سەیف لە لای ئەو زیاد دەبێ. دواجار سمایل ئاغا تکای لێ دەکا ڕابردوو لە بیر بەرێتەوە و بەنوێنەرایەتیی وی بچێتە نێو ئەو عەشیرەتانەی کە هاوسەنگی و هاوکارییان لەگەڵ سمایل ئاغا نەدەکرد و لە نێو ئەواندا بۆ ڕاپەڕینی سمایل ئاغا بانگەشە بکا. خوداڵێخۆشبوو سەیف بۆ جێبەجێکردنی ئەو مەبەستە دەچێتە لای عەشیرەتەکانی هەورامان و مەریوان و کارێکی وا دەکا تەواوی ئەو عەشیرەتانە گوێڕایەڵی و هاوکاری سمایل ئاغا بکەن، بەڵام بەدەم ئەو بارودۆخەوە هێزێکی زۆر بەسەرکردەیی سەرتیپ ئامانوڵا میرزای جەهانبانی نێردرا بۆ سەرکوتکردنی سمایل ئاغا، هێزی نێوبراو سمایل ئاغای شکاند و ناچاری کرد هەڵێ و ئێران بەجێ بهێڵێ. دوای ماوەیەک کاربەدەستان، سمایل ئاغایان بانگ کردەوە بۆ خاکی ئێران و گەلێک بەڵێنیان پێ دا، دواجار بەکەڵەک و دۆڵاب لە شنۆ لە بەرواری سێی گەلاوێژی ١٣٠٩ کوشتیان. ڕاپەڕینی سمایل ئاغای شکاک بەنێوبانگ بەسمیتکۆ یان سمیتقۆ[١] بەدرێژی لە کتێبی تاریخ سرزمین زردتشت (مێژووی سەرزەوینی زەردەشت) بە قەڵەمی ئاغای عەلی دێهقان نووسراوە، ئەوکەسانەی بیانەوێ سەبارەت بەوردەڕیشاڵی ئەو ڕاپەڕینە ئاگاداری پەیدا بکەن، دەکرێ ڕوو لە کتێبی نێوبراو بکەن.

خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات ماوەیەک لە سەردراباد لە لای خوداڵێخۆشبوو مەلا حەسەنی قزڵجی[٢] و ماوەیەک لە دێی ئەنبار لە لای خوداڵێخۆشبوو مەلا شەفیع[٣] خوێندوویە.

---

١– لە زمانی کوردی دا (سمکۆ) یە کە بەڕواڵەت گۆڕدراوی هەمان وشەی سمایلە.

٢– بڕوانە: سالنامەء فرهنگ مهاباد، ساڵی ١٣٣٥، وتاری ماموستا ئەحمەدی تورجانیزادە، لاپەڕەی ٥١

٣– شەرحی حاڵی خوالێخۆشبوو حاجی مەلا شەفیعی ئەنباری لە کتێبی "زندگی نامەء عارف ربانی، شمس الدین برهانی" نووسینی کاک ئەبوبەکری خوانچە سپێهرەدین دا هاتووە. لاپەڕەی ٤٠١

خوداليخۆشبوو مەلا شەفيع، مەلای حاجی برايم ئاغا، ئاغای دێی ئەنبار بووە.

حاجی برايم ئاغا بەسادەيی، تەبيعەتی شۆخ و هەندێک کاری سەير و جێی پێکەنين بەنێويانگە. قسەی زۆر خۆش سەبارەت بەکردار و هەستان و دانيشتنی ئەو دەگێڕنەوە. لێرەدا چەند نموونە لە کارە گاڵتەجارييەکانی بۆ ئاگاداريی خوێنەرەوانی بەڕێز (هەرچەند پێوەنديیان بەبابەتی ئەم يادداشتانەوە نييە) لە خوارەوە دەنووسم.

حاجی برايم ئاغا کە نەخوێندەوار بووە جار جار چەند ڕستەی بێ سەروبەری گوتووە و ئەوانی بەشێعر داناوە. لەوانە ڕۆژێک بەمەلا شەفيع دەڵێ ئەمن نيوە شێعرێکم گوتووە، نيوەکەی تريشی دەبێ ئەتۆ تەواوی کەی. مەلا شەفيع دەڵێ چت گوتووە؟ حاجی برايم ئاغا دەڵێ: مەلا ڕەحمان مەلا ڕەحمان پێنجوێن را. مەلا شەفيعيش دەستبەجێ دەڵێ: (زر بر سر پولاد نهی نرم شود را) برايم ئاغا دەڵێ: هەزار ئافەرين بەڕاستی ئيعجازت کرد، ئەمن ئەمشەو خەوم لێ نەکەوت و هەر لە بيری پەيداکردنی نيوەی دووەمی شێعرەکەدا بووم، بەڵام نەمتوانی بيدۆزمەوە، ئەتۆ بە هاسانی ئەو گرێيەت کردەوە.

بەدوای ئەوەدا حاجی برايم ئاغا عەبايەکی نوێ خەڵاتی مەلا شەفيع دەکا. دەڵێن ئەم " شێعرە"ش ئی حاجی برايم ئاغايە: خوش است خاک انبار و تەقتەقە بەردەکانەش بە شرط اينکه حاجی ملا شفيع درميان نباشد. (خۆشە خاکی ئەنبار و تەقتەقە بەردەکانی بەو شەرتەی حاجی مەلا شەفيعی لێ نەبێ).

ڕۆژێکی لە دێيەکانی دەورو بەرەوە مەلايەکی نەدار دەچێ بۆ لای خوداليخۆشبوو حاجی مەلا شەفيع و پێی دەڵێ، وەرزی پايز گەيشتووەتێ کوڵێکم خاو و خێزان هەيە لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی بەشەر پێی بژی نيمە، ئێستا هاتوومە لات بۆ ئەوەی چارەيەکم بۆ ببينييەوە، بۆ بەڕێچوونم. حاجی مەلا شەفيع برێک ڕادەمێنێ و لە وڵاميدا دەڵێ: چارەيەکم بەزەينيدادا دێ، پێم وايە، ئەگەر بەو پێيە بجووڵێيەوە قازانجی بۆت دەبێ. مەلای نەداريش دەڵێ: هەرچی ئەتۆ بفەرمووی وا دەکەم. خوداليخۆشبوو مەلا شەفيع دەڵێ: حاجی برايم ئاغا کوڕێکی بوو بەنێوی ڕەسووڵ ئاغا کە لەشەڕيدا[1] بزر بووە و ديار نييە و ئێستا کەس نازانێ لە کوێيە. هەندێکان دەڵێن ئەو کوڕە لە لای ڕووسان يەخسيرە و لەخاکی ڕووسيەيە و، هەندێک کەسی ديکەش دەڵێن لە شەڕدا کوژراوە. حاجی برايم ئاغا ئەو کوڕەی زۆر خۆش دەوێ و تائێستا خەڵک بەحاجی برايم ئاغايان گوتووە کوڕەکەت زيندووە و

---

١- مەبەست لە شەڕی دنياگرەوەی يەکەمە.

دەگەڕێتەوە. ئەتۆ هەر ئێستا بچووە لای برایم ئاغا و پێی بڵێ ڕەسووڵ ئاغام لە خەونمدا دیوە، ئیدی هیچی تر مەڵێ. حاجی برایم ئاغا وردەڕیشاڵی خەونەکەی تۆ بەپێی ویست و ئارەزووی خۆی لێک دەداتەوە و باسی دەکا و تۆ هەر بڵێ بەڵێ وایە، ئەو دەمی بەرووبووی خەونەکەت بۆ دەردەکەوێ.

مەلای بەستەزمان بەپێی ئامۆژگارییەکانی خودالێخۆشبوو حاجی مەلا شەفیع دەچێتە لای خودالێخۆشبوو حاجی برایم ئاغا. دەچێتە ژوورێ، سڵاو دەکا، حاجی برایم ئاغا سڵاوی دەداتەوە و ئیزنی دانیشتن دەدا بەمەلا. دوایە لێی دەپرسێ: چ کارێکت هەبوو؟ مەلا دەڵێ: قوربان خەونم بەکوڕەکەت ڕەسووڵ ئاغاوە بینی. حاجی برایم ئاغا دەڵێ: ئافەرین دیارە ئەتۆ زۆر پیاوی چاکی. ڕەنگە لە خەونتدا کوڕەکەمت دیبێ سواری ئەسپێکی سپی بووبوو، زین و بەرگی ئەسپەکەی لە زێو بوو، تاجی و تووڵە و چەند نۆکەری لەگەڵ بوو، لە گردە سپی خەریکی ڕاوە کەروێشک بوو! مەلا دەڵێ قوربان وەک ئەوە وایە بۆ خۆت تەشریفت لەوێ بووبێ. پاشان حاجی برایم ئاغا لێی زیاد دەکا و دەڵێ: کوڕەکەم تەماڵی دۆزیوە کە کەروێشکێکی تێدا بوو، ئەوجار هەرای کرد و گوتی: وەرن تەماڵە نۆکەری ڕاوچییانم پێ دەڵێن(1) و دوایە ئەو سوارانەی لەگەڵی بوون هاتنە دەوری و تاجی و تووڵەیان دە کەروێشکێ بەردا. تاجی ڕەکەروێشکی کەوتن و سوارانیش بەغار بەدوویدا چوون و ئاخرەکەی کەروێشکەکەیان گرت و کوڕەکەم لە ئەسپ دابەزی و بەو کێردەی پێی بوو سەری کەروێشکەکەی بڕی و کەروێشکی لە ڕەختی زینەکەی هەڵاوەسی. هەموو بەشادی و خۆشی ڕاویان بەتاڵ کرد و هاتنەوە ماڵێ. دەنا وانەبوو؟ قوربان بەدڵنیاییەوە بۆخۆشت تەشریفت لەوێ بووە، چونکو هەرچی فەرمووت هەمووی ڕاستە. ئەوجار حاجی برایم ئاغا وەکەیف دەکەوێ فەرمان دەدا دەستێک جلوبەرگی تازە بدەن بەمەلا و هەروەها بەمەلاژن و هەرکام لە منداڵەکانی، جگەلەوە فەرمان دەدا چەند بار ئارد و بەشی ئەوەندەی پێی بەرێ بچن دانەوێڵە و ڕۆن و برینج و پێداویستییەکانی دی بۆ بار کەن و لەگەڵ بڕێک دراوی نەغد بدەن بەمەلا. دوایە بەمەلا دەڵێ: هەتا ئەمن زیندوو بم دەبێ هەموو ساڵێ خەون ببینی و بێی و بۆم بگێڕییەوە. مەلا لەگەڵ سپاس بەڵێنی پێ دەدا هەموو ساڵێ خەون ببینێ و بێ بۆی وەگێڕێ. مەلا شتەکان وەردەگرێ و بۆ ماڵاوایی دەچێتە لای خودالێخۆشبوو مەلا شەفیع و بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. مەلا شەفیع زۆری پێ خۆش دەبێ و دەڵێ: خودای گەورە لەم ڕێیەوە ئەمساڵ ڕزق و ڕۆزی منداڵەکانی گەیاند، ساڵی

1- ڕاوچی ئەگەر تەماڵیان بدیباوە وایان دەگوت.

داهاتووش هەر وەک بەڵێنت پێ داوە وەرەوە و هەر ئەو خەونەی بۆ بگێڕەوە.

مەلای هەژار یەک دوو ساڵ هەر ئاوا دەکا و مووچەی خۆی لە حاجی برایم ئاغا وەردەگرێ. لە ساڵەکانی دواتردا باری ژیان و بەرێچوونی مەلا بەرەو باشتر دەچێ، بۆیە ئیدی ناچێ بۆ لای برایم ئاغا. بەهەڵکەوت رۆژێک حاجی برایم ئاغا لەگەڵ ژمارەیەک لە نۆکەرەکانی دەچێ بۆ سەردانی یەکێک لە ئاغایانی دراوسێی، لە رێگا تووشی مەلای نێوبراو دێ. حاجی برایم ئاغا دەڵێ: ئەتۆ هەر ئەو مەلایە نی بڕیار وابوو هەموو ساڵێ خەون ببینی و بێی و بۆم بگێڕییەوە؟ مەلا دەڵێ بەڵێ قوربان من هەر هەمان کەسم. حاجی برایم ئاغا دەڵێ: ئەی چما ئەوە دوو ساڵە بەڵێنی خۆت بەجێ ناهێنی؟ مەلای بێچارە لە ناعیلاجییان دەڵێ: قوربان دوو ساڵ بوو زۆر نەخۆش بووم، بۆیە نەمتوانی بێمە خزمەتت. حاجی برایم ئاغا دەڵێ ئەگەر وابێ قسەم نییە، بەڵام هەر ئێستا دەبێ لێرە بنووی و خەون ببینی و بۆم بگێڕییەوە. مەلا دەڵێ: قوربان ئێستا خەوم نایە و نوێن و بانیشم پێ نییە. حاجی برایم ئاغا دەڵێ: هیچ عوزر و بیانوویەکت لێ قبووڵ ناکەم، هەر ئەوەیە کە گوتم. مەلا لەو گاڵتەجارییە توورە دەبێ و لە نووستن لەبەر قرچەی تاوی هاوینێ ئەویش لەو سەحرایە دەست دەگێڕێتەوە. حاجی برایم ئاغا فەرمان دەدا بەسوارەکانی جلو پەڵاسی سەپانان کە لەو نزیکانە خەریکی دروێنە و کاری خەلە و خەرمان بوون، وەربگرن و لەوێ بۆ مەلای ڕاخەن و بەزۆر مەلای بنوێنن. دوای دە دەقیقە کە مەلا بەفێڵ خۆی دەخەو دەکا، لە ژێر جلوپەڵاسەکە دێتە دەرێ و دەڵێ: قوربان نوستم و خەونیشم دی. حاجی برایم ئاغا هەر وەک ڕابردوو شانۆی خەونەکە شی دەکاتەوە و مەلاش قۆڵی لە سەر دەکێشێ. دوایە ئەنعامێک دەدا بەمەلا و مەرەخەسی دەکا.

# میرزا فەتاحی قازی

خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی لە پیاوانی بەنێوبانگ و نێوبەدەرەوەی کوردستانی ئێران بووە. ئەو هەم خاوەن قەڵەم و هەم خاوەن شمشێر بووە و بەسەرهاتێکی پڕ لە هەوراز و نشێو و پڕ لە شانازیی هەیە. هەمیشە بەمەردی و پیاوەتی ژیاوە. بەهەبوونی ڕقەبەر و دژبەری سەرسەخت و بەهێز وەکو کۆنسوولی ڕووسیەی قەیسەری لە ساوجبولاغ، محەمەدئاغای ئێلخانیی دێبۆکری، بەشێکی سەرەکی لە عێلی مەنگوڕ، کاربەدەستانی ناوچەیی بەتایبەتی محەمەد حوسێن خانی موکری حاکمی ساوجبولاغ، هیچکات لە ئاست ئەوان سەری تەسلیم و سازشتی دانەنواندووە. هەندێک جار دوژمنانی خۆی شکاندووە و بەچۆکی داهێناون و جارجاریش لە بەرانبەر ڕقەبەری بەتواناداا شکاوە و سەدەمەی پێ گەیشتووە، بەڵام قەت مەیدانی چۆڵ نەکردووە و دەستی لە خەبات هەڵنەگرتووە.

ئەو پیاوە لەگەڵ ئەوەشدا – جلوبەرگی مەلایەتی لەبەر دابووە و ئەهلی عەبا و عەمامە بووە، بەڵام ڕوحی ئازایەتی و شەڕانێتیی تێیدا زۆر بەهێز بووە، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە خۆی و کوڕە زۆر و زەوەندەکانی و نۆکەرە هەمیشە پڕ چەکەکانی لەگەڵ دژبەرانیاندا هەمیشە لە شەڕ و کێشە دابوون و لە هەموو شەڕەکاندا ئازایەتی و قارەمانەتییان لە خۆوە نیشان داوە. لێرەدا بۆ وێنە باسی یەک دوویەک لە پێکهەڵپەڕژانەکانی وی و کوڕەکانی لەگەڵ دژبەرانیان، ئەو جۆرەی کە بیستوومە دەگێڕمەوە.

ساڵێکیان لە نێوان ئاغای دێی کۆنەمەلالەر واتە مەجید بەگ و ئاغاکانی دێی پیرۆلی باخی، واتە برازاکانی قازی فەتاح کە بریتی بوون لە: (قازی عەلی، قازی عەسکەر، سەیفولقوزات و میرزا ڕەحیم)، کێشەیەک لە سەر کەوشەنی مڵکی پەیدا دەبێ. میرزا ڕەحیم چەند گاجووت و گاسن لەگەڵ خۆی دەبا بۆ کێڵانی ئەو زەوییە دێمەی قرەی لە سەر بووە. مەجید بەگ و کەسانی نایەڵن پیاوەکانی میرزا ڕەحیم زەوییەکە بکێڵن. لە ئاکامدا لێکدان و تەقە دەست پێ دەکا و میرزا ڕەحیم لە لایەن کەسانی مەجید بەگەوە دەکوژرێ. ئەو خەبەرە بەگوێی کوڕانی میرزا فەتاحی قازی، ئاغایانی عەبدوڕەحمانی سالاری موکری، قازیی محەمەدی حاجی ئاباد، میرزا عەبدوڵای سیقەتولئیسلام، میرزا مەحموودی مەنسوورولسوڵتان و، میرزا ئەحمەد دەگاتەوە کە لە دێی قارنجە بوون. ئەوان دەستبەجێ سوار دەبن و دەگەنە مەیدانی شەڕەکە و شەڕ و پێکدادان دیسان دەست پێ دەکاتەوە، لە ئاکامدا مەجید بەگ بۆخۆی و برایەکەی و چەند کەس لە خزمانیان دەکوژرێن و

ژمارەیەکیان دەگیرێن و ئەوانی دیکەشیان هەڵدێن و کوڕانی قازی فەتاح تەرمی میرزا عەبدولرەحیم لەگەڵ خۆیان دەهێننەوە. برایان و کوڕانی مەجید بەگ ئەو سەروبەندی خاوەنی دێی کولیجە کە دێیەکی سەرەکی بووە و زۆر بەدەستەڵات و بەهێز بوون و ژمارەیەکی زۆر ڕەعیەت و نۆکەری چەکداریان هەبووە، بڕیار دەدەن ئەو کردەوەیەی کوڕانی قازی فەتاح لەیەکەم دەرفەتدا وڵام بدەنەوە و بەتوندترین شێوە تۆڵەی شەڕی کۆنە مەلالەریان لێ بستێننەوە.

بەهەڵکەوت لە گەرمەی ئەو بارودۆخەدا شێخ یووسف ناسراو بەشەمسەدینی بورهانی کۆچی دوایی دەکا[1]. میرزا فەتاح لەگەڵ ژمارەیەکی کەم (دە دوازدە سوار) بەمەبەستی بەشداری لە مەجلیسی سەرەخۆشی و فاتیحاخوێنی بۆ شێخی بورهان، دەچێ بۆ دێی شەرەفکەند. ڕێگای مهاباد بۆ شەرەفکەند بەمەزرای کولیجەدا تێ دەپەڕێ. خەبەر دەدەن بەکوڕ و برایانی مەجید بەگ کە میرزا فەتاح بەبۆنەی وەفاتی شێخ چووە بۆ خانەقا و چەند کەسێکی زیاتر لەگەڵ نییە و دوای دووسێ ڕۆژ بەڕێگای کولیجەدا دەگەڕێتەوە بۆ سابلاغ.

کوڕ و برایانی مەجید بەگ هەر کە ئەو خەبەرەیان پێ دەگا، دەستبەجێ ژمارەیەکی زۆر لە نۆکەری شەڕکەر و ڕەعیەتەکانی خۆیان لە دەوروبەری دۆڵێک نزیک بەکێوێک بەنێوی قۆتەر[2] لەمبەر ئەوبەری ڕێگاکە، لە شوێنی ئاوادا دوژمن بەتەواوی لە تیرئاوێژی ئەواندا بێ، دادەمەزرێنن و لێیان دەچن دە بۆسەوە و کابرایەکی کارامە و جێی باوەڕیش دەنێرن بۆ خانەقا هەرکاتێک میرزا فەتاح بەمەبەستی گەڕانەوە بۆ سابلاغ سوار بوو بەمەودایەکی کەم وەپێش سوارانی ئەو بکەوێ و بەوردی لە گەیشتنی ئەوان ئاگاداریان کا. ئەو کەسە بەپێی ئەو فەرمانەی پێیان دابوو دەجووڵێتەوە و، چاوەڕێی گەڕانەوەی میرزا فەتاح دەکا. کاتێک میرزا فەتاح سوار دەبێ و بەرەو کولیجە وەڕێ دەکەوێ، ئەویش سواری ئەسپەکەی دەبێ و بەپرتاو خۆی دەگەیێنێتە لای کوڕانی مەجید بەگ و خەبەریان پێ دەدا میرزا فەتاحی قازی بەزوویی دەگاتە مەزرای کولیجە.

کەسانی مەجید بەگ فەرمان دەدەن بەپیاوەکانی خۆیان و دەڵێن: پەلە مەکەن، کاتێک

---

1- شێخ شەوی یەکشەمۆ یازدەیەمی جمادی الثانی ساڵی ١٣٢٨ی کۆچیی مانگی کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: زندگی نامەء عارف ربانی، لاپەڕەی ١٧٨.

2- ئەم کێوە – لە ناوچە پێی دەڵێن قۆتەر ٢١٩٩ میتر بەرزە. بڕوانە: نقشەء شهرستان مهاباد، کارتوگراف: حوسێنی مەدەنی.

میرزا فەتاح و سوارەکانی بەتەواوی هاتنە نێو ئێوە، لە مەودای چل پەنجا میترییەوە تەقەیان لێ بکەن و هەموویان لە نێو بەرن.

میرزا فەتاح و سوارەکانی بێ خەبەر لەوەی داوێکی بەمەترسی بۆ لەنێوبردنیان نراوەتەوە، بێ خەبەر لە هەموو شت، وردە وردە ئەسپەکانیان بەڕێگای پڕ لە گەوە و پێچدا داژۆن و بەقسەکردن بەرەو پێشەوە دێن تا دەگەنە نێوەڕاستی دۆڵەکە، ئیدی لەوکاتەدا دەنگی خرمەی تفەنگان وەک هەورەتریشقەی بەهاران لە دۆڵ و چیای بەرز و سەرسەوزدا دەنگ دەداتەوە، گوللەی گیان بێز وەکو تەرزە بەسەر ئەو چەند سوارە بێ ئەنوایەدا دەبارێ و ئەوان لەو تۆزوخۆڵەیدا کە بەکەوتنی گوللەکان لە سەر زەوییەوە بەرز دەبێتەوە، بزر دەبن، بەڵام گوللەکان هیچکامیان ناپێکێ. کاتێک خودالێخۆشبوو قازی فەتاح و سوارەکانی دەبینن لەهەموو لایەکەوە دەورە دراون، بەرکێف لێدان لە ئەسپەکانی خۆیان دەخورن و لە ڕێگاکە لادەدەن و بەخێرایی بەخۆشاردنەوە لە تاکوتەرای دوژمن لە شوێنێکی کێوەکە، بەلای دەستی چەپدا، کە دەڕوانێتە سەر لەشکری دوژمن، خۆیان دادەمەزرێنن و ئەسپەکانیشیان لە پەناو پەسیوێک کە چاوی دوژمنی نەگاتێ دەبەستنەوە و بۆ خۆیان بەپێیان ڕوو بەدوژمن لەبن ڕەوەزە بەردانەوە دەست دەکەن، بەتەقەکردن. ژمارەی دوژمن یەکجار زۆر بووە. تاکوتەرای ئازا و بێباکی دوژمن بۆ کوشتن یان گرتنیان هێرش دەکەن و مەیدانیان لێ تەنگ دەکەنەوە، بەڵام میرزا فەتتاح و ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون وەک سەدی پۆڵایی بەرگری لەخۆیان دەکەن و تاکوتەرای پەلاماردەر دەکەنە سێرەی تفەنگەکانیان و یەک یەک بەرێیان دەکەن بۆ دیاری عەدەم. لەو شەڕەدا کوڕ یان برای مەجید بەگ و ژمارەیەک لە پیاوەکانی زۆر بەنێوبانگ و ئازای دەکوژرێن. ئەو شەڕە چەند سەعات لە دوای تاوهەڵات تا نزیکەی ڕۆژئاوا دەخایەنێ و وردە وردە پاشماوەی تاکوتەرا و کوڕانی مەجید بەگ ناچاردەبن، پاشەکشە بکەن. خەبەری ئەو شەڕە و دەنگی تەقوتۆق دەگاتە دێیەکانی دەوروبەر و تەنانەت مهابادیش کە ئەودەمی پێی گوتراوە ساوجبولاغی موکری. لەوکاتەدا عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد کوڕی حاجی محەمەد ئاغای ئێلخانی کە لە گوندی سەدراباد بووە لەگەڵ ژمارەیەک لە سوارەی خۆی دەگاتە شوێنی شەڕەکە و کەسانی مەجید بەگ چەک دەکا لەگەڵ خۆی دەیانبا. بەم پێیە ئاوری شەڕەکە دەکوژێتەوە.

دوایە لە خەڵکی سابلاغێ ژمارەیەک و هەروەها خاوەن موڵکانی دێیەکانی یالاوا (یالاوای سەرێ و خوارێ) و سیچان بولاغ کە سەر بەبنەماڵەی قازی بوون، بە فریای میرزا فەتاحەوە دێن و دوای ئاگاداری لە سلامەتیی قازی فەتاح و ئەو کەسانەی لەگەڵی بوون

هەڵدەشکاونە سەر کولیجە بۆ ئەوەی ئەو گوندە و ماڵی کوڕانی مەجید بەگ تاڵان بکەن. لەو دەمەدا سادات و باوەڵێی دانیشتووی کولیجە قورئان بەرەوپێلی تاکوتەرای لایەنگری قازی فەتاح دەبەن و تکایان لێ دەکەن نەیەنە نێو ئاوەدانییەکە. لەبەرئەوەی قورئان لە لای کوردان حورمەت و گەورەیی تایبەتی هەیە و لە لای ئەوان سادات هەتا بڵێی بەرێزن، لایەنگرانی قازی فەتاح ناچنە نێو ئاواییەکە و دەست لە تاڵانی ماڵی کوڕانی مەجید بەگ دەپارێزن بەڵام ڕانە مەڕ و گاڕانی ئاواییەکە لە مەزراوە لەگەڵ خۆیان دەبەن. پاشان خودالێخۆشبوو، گاڕان و ڕانە مەڕەکە دەداتەوە بەخاوەنەکانیان. ئەوجار میرزا فەتاح و سوارەکانی بەوپەڕی شادی و سەربەرزییەوە دەگەڕێنەوە مهاباد. خانەدانی مەجید بەگ دوای ئەو شکانە بەتەواوی بەلا داهات و لە شانۆدا نەما.

ئەوە دیار نییە لەو شەڕەدا عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد بۆچی بەقازانجی قازی فەتاح دەستی تێ وەرداوە و تفەنگچییەکانی مەجید بەگی چەک کردووە و لە مەیدانێی نەهێشتوون. ڕەنگە ئەو دەمی پێوەندیی دۆستانە لە نێوان خودالێخۆشبوو قازی فەتاح و خودالێخۆشبوو عەلی ئاغادا هەبووبێ یان ئەوەی - عەلی ئاغا بەکەسری شانی خۆی و شیاوی قبووڵکردنی نەزانیبێ - لە دراوسێیەتیی ویدا کەسێک ئاڵۆزی و شەڕ و هەرا بنێتەوە.

میرزا فەتاحی قازی لەبەر خووی ئازادیخوازی، هەمیشە لەگەڵ حکوومەتە سەرەڕۆیە ناوچەییەکاندا لە کێشە و قرەدا بووە، چونکو حاکمەکانی سەردەمی سەرەڕۆیی لە هیچ جۆرە زوڵم و دەستدرێژی و تەنانەت وەسەربەرینی نامووسی خەڵکیش دەستیان نەدەپاراست و خەڵک ناچار بوون بۆ ئەوەی لە هێمنیدا بژین لە چنگ حاکمەکانی سەرەڕۆ پەنا بەرنە بەر میرزا فەتاح کە لە ناوچەدا خاوەن دەستەڵات و بەتوانا بوو. بەرێزیشیان ناچاربوو لە سەر کەسانی بێدەرەتان بکاتەوە و بیانپارێزێ، بۆیە لە نێوان حاکمە سەرەڕۆیەکان و میرزا فەتاحی قازیدا زۆرجار کێشە و هەرا پەیدا دەبوو و دەگەیشتە لە یەک ڕاسان و دوژمنکاری. هەندێک جار بەفەرمانی میرزا فەتاحی قازی خەڵکی شاری دووکان و بازاڕیان دادەخست و کۆدەبوونەوە و حاکمی زۆرداریان لە شار وەدەر دەنا و داوایان لە وەلیعەهدی قاجار دەکرد کە بنکەی لە تەورێز بوو حاکمێکی دادپەروەر(!) یان بۆ بنێرێ. بەڵام شتێک کە لە سەردەمی سەرەڕۆییدا لە گۆڕێدا نەبوو، دادپەروەری و مەردمداری بوو، چونکو ئەگەر حاکمەکان بۆ جێیەک ناردرابان و ڕاسپاردەیان درابایە، دەبوو بۆ قەرەبووی ناردنیان بۆ ئەو شوێنە و ئەو ڕاسپاردە پێدرانە، هەموو مانگێک برە

دراوێک وەکو پێشکێشی یان دراوی کرێ بدەن و ئەو دراوەش بەڕێگای زۆرداری و بەشڵتاغ لە خەڵکیان دەستاند. بەو پێیە حاکمەکانی سەرەڕۆیی جگە لە تالان و چەپاندن و دەستدرێژی بۆ سەر گیان و ماڵی خەڵک کارێکی دیکەیان نەبوو. ئەوە بوو خوالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی نەیدەتوانی بەهیچ جۆر لەگەڵ حاکمە گەندەڵ و تالانکەرەکان بێتە رەدایێ و لەگەڵیان بسازێ. ئەو دژبەری و مل لێسوانانە ئاخرەکەی گەیشتە ئەوەی دەوڵەتی نێوەندی لە میرزا فەتاحی قازی دڕدۆنگ و نیگەران بێ. بۆیە لە کۆتاییەکانی سەڵتەنەتی ناسرەدین شادا بانگیان کرد بۆ تاران و ١٢ ساڵ لە سەردەمی ناسرەدین شا و موزەفەرەدین شا لە تاران زیندانی و لە ژێر چاودێرییدا بوو، پاشان ئازادیان کرد و ڕێگایان پێ دا بگەڕێتەوە زێدی خۆی مهاباد، لە کاتی گەڕانەوەیدا دۆستان و خزمانی تا شاری زەنگان بەرەوپیلی چوون و بەحورمەت و جەلالی هەرچی زیاترەوە هێنایانەوە مهاباد. دواتر ڕووداوەکانی مەشرووتە و ڕووبەڕووبوونەوەی محەمەد عەلیشا لەگەڵ مەشرووتەخوازان هاتە پێشێ. خوالێخۆشبوو میرزا فەتاح لەگەڵ ئەوەشدا دژی زۆرداری و سەرەڕۆیی بووە دیار نییە لە سەر چ بنەمایەک لەگەڵ دەستوپێوەندی محەمەد عەلی شای قاجار هاوکاریی کردووە و بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ سوارەکانی لە مەراغە و تەورێز لەگەڵ لەشکری حاجی سەمەدخانی شوجاعودەولە بووە. دواجار لەشکری ڕووسیەی قەیسەری دوای زنجیرەیەک شەڕ و پێکدادان لەگەڵ مەشرووتەخوازان دێنە نێو تەورێزەوە و شوجاعودەولە ئەوەی جینایەت و خوێنڕێژییە لە تەورێز کردوویەتی و ژمارەیەکی زۆر لە ئازادیخوازان لەوانە سیقەتولئیسلام و شێخ سەلیم و هەندێک کەسی دی لە سێدارە داوە، خوالێخۆشبوو قازی فەتاح جگە لەوەی لەگەڵ شێوە کاری شوجاعودەولە و جینایەت و پیاوکوژییەکانیدا نەبووە، هەمیشە بۆ ڕزگارکردنی ئازادیخوازان لە بەڵای شوجاعودەولە تێ کۆشاوە و ژمارەیەکی زۆری لە وان لە مردن ڕزگار کردووە.

لە سەردەمی شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا، میرزا فەتاحی قازی لەگەڵ ترکییە عوسمانییەکان ڕێک کەوت و دژی ڕووسە قەیسەرییەکان شەڕی کرد. لە ساڵی ١٣٣٤ی کۆچی مانگی[١] هێزێکی گەورەی ڕووسان بەسەرکردەیی بالاساخارۆف و چرنۆزوبێڤ[٢] هێرش دەکەنە سەر هێزێکی کەمی ترکییەکانی عوسمانی کە لە مهاباد دامەزرابوون. هێزە

١- بابم ڕەقەمەکەی نەنووسیوە و جێیەکەی بە خاڵی بەجێ هێشتووە. ئەو ڕەقەمەم لە پەراوێزی لاپەڕەی ٧ی بیرەوەرییەکانی وەرگرتووە.

٢- دیکتەی وشەکەم لە ڕووی " تاریخ هیجده ساله‌ء آذربایجان " نووسراوی ئەحمەدی کەسرەوی نووسیوەتەوە (چاپی چوارەم، لاپەڕەی ٦٠)

عوسمانییەکان لە وزەیاندا نابێ خۆڕاگری بکەن، دوای چەند سەعات پێکداداان تێک دەشکێن و شارەکە لە لایەن ڕووسانەوە داگیر دەکرێ.

خودالێخۆشبوو قازی فەتاح بۆ خۆی لەگەڵ چەند کەس لە پیاوەکان و کوڕەکانی لە خانوویەکدا کە ئێستا وێران بووە و بەمەدرەسەی عوسمانییان بەناوبانگ بوو و ئێستا بەشێکی لە لایەن شێر و خورشیدی مهابادەوە کراوە بەگەرماو، دژی ڕووسەکان شەڕ دەکەن. دوای ماوەیەک شەڕ و تەقە ئەستوونێکی سوارە نیزامی ڕووسی لە ڕێگای دێی کەرێزە و باخی مکایل و پردی سوورەوە هێرش دەهێنن و دەگەنە نزیک گۆمی قازی لە لێوارەی ڕۆژئاوای شاری مهاباد. لەوکاتەدا کوڕەکانی بەخودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی دەڵێن قوشوونی ڕووسەکان زۆر بەهێزە و ئێستا خۆی خزاندووەتە هەندێک لە شوێنەکانی شار و هێزەکانی عوسمانی هەڵاتوون و دوای چەند دەقیقەی تر شار دەشکێ و ڕووسەکان داگیری دەکەن، باشتر وایە ئێمەش لە شاری بچینە دەرێ. میرزا فەتاحی قازی لە وڵامدا دەڵێ: ئەمن ناتوانم زیندوو بم و ببیسم لەشکری ڕووس هاتوونەتە نێو سابڵاغێ. دوایە میرزا فەتاح داوای ئەسپەکەی دەکا کە سوار بێ، لە کاتێکدا پێ دە ڕکێفی زینی دەنێ چەند گولله لەو موسەلسەلانەی لە تەپەی قازی دایان مەزراندبوون، نێوچاوانی دەپێکێ و دەستبەجێ شەهید دەبێ. لەدوای شەهادەتی میرزا فەتاحی قازی نۆکەر و کوڕەکانی ناچار دەبن هەڵێن و تەرمەکەی هەر لەوێ بەجێ دەهێڵن. پاشان تەرمەکە ڕادەگوێزرێ بۆ مزگەوتی شادەرۆیشی و ڕووسەکان چەندین جار وێنەی لێ هەڵدەگرن. کەسێک بەنێوی کاکەڕەش کە پێشتر دارۆغەی حکوومەتی مهاباد بووە و خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی جارێکیان لەبەر جووڵانەوەی خراپی لەگەڵ خەڵک و ئازار دانیان سزای دابوو، نایەڵێ تەرمەکە بنێژرێ، دوا جار دوای چل ڕۆژ تەرمەکە لە لای ڕۆژهەڵاتی حەوشەی مزگەوتی شادەرۆیش بەخاک دەسپێردرێ.

کوڕانی میرزا فەتاحی قازی لەگەڵ لەشکری تێکشکاوی عوسمانی لە ژێر فەرماندەریی عومەر ناجی بەگ، بەڕێگای گردە بەردان، بەرەجۆ، توختە، قۆڵغەتەپە هاتنە گوندی باخچە کە بەشێکی ئی بابم خودالێخۆشبوو میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی بوو. زۆربەی عەسکەری عوسمانییەکان سەرما و بەفری ڕێیە لە نێوی بردبوون و ژمارەیەکی زۆریشیان دەست و لاقیان سەرما بردبووی. مزگەوتی دێی باخچەیان کرد بەنەخۆشخانەی عەسکەرە بریندارەکان. ئەو عەسکەرانە دوای یەک دوو شەو حەسانەوە بەرەو دێی قارەوا لە نزیک

بۆکان پاشەکشەیان کرد و دوای چەند ڕۆژان ئەفسەرێکی عوسمانی هاتەوە دێی باخچە و نەخۆش و بریندارەکانی بەسواری گوێدرێژ و ئێستر لە وەزعێکی زۆر دڵتاوێن و پەرێشاندا بەرەو نێوەندی ئۆردوو برد.

هێزەکانی ڕووسیەی قەیسەری کە بەتووڕەیی و زەبروزەنگەوە هاتبوونە نێو مەهاباد، ئەوپەڕی درندەیی، دڵڕەقی و خوێنخۆرییان دەکار هێنا و لە هیچ جۆرە کارەسات و کوشت و کوشتارێک لە مهاباد و دێیەکانی دەوروبەری دەستیان نەپاراست، بەتایبەتی لە دێیەکانی قونقەلا، ئیندرقاش، دریاز، کەرێزە. دەستە دەستە لە دانیشتوانی بێ ئەنوای لادێکان و شاری سابلاغیان بێ هیچ بەزەییەک بەقەدارە و شمشیر کوشت، کووچە و کۆلان و ماڵەکان و مزگەوتەکان پڕ بووبوون لە تەرمی پیر و لاو. بازاڕی مهاباد و هەندێک ماڵەکانیان ئاور تێ بەردا، لە وانە ماڵی میرزا فەتاحی قازی و ماڵی خوداڵێخۆشبوو قازیی عەلی و خەڵکیان بەزیندوویی سووتاند. بەکورتی ماوەی حەوت شەو و ڕۆژ، خەڵکی بێ ئەنوای مهاباد و دەوروبەریان دا دەم تێغی شمشیرەکانیان. تەنێ ژمارەیەکی کەم توانییان لە نێو ئەشکەوت و ژێرخانان خۆیان حەشار دەن و هەندێکیش داڵدەیان بردە بەر ماڵی سەرۆکی گومرگ و حاکم و یان ماڵی میرزا حاجی[1] حاجی غەفوور کە پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ڕووسەکان هەبوو و زمانی ڕووسیی باش دەزانی، هەندێکیش پەنایان بردبوو بۆ ماڵە جوولەکەکان، و یان کەسانێک کە توانیبوویان بەر لە هاتنی ڕووسەکان ڕاکەن، جگە لە ژنان و منداڵی شیرەخۆرە، پاشماوەی خەڵکی شاریان کوشت.

ئاغای محەمەدی ئیقباڵی کوڕی خوداڵێخۆشبوو حاجی ڕەحیم کە مەئمووری پاراستنی هێمنی و کۆکردنەوە و ناشتنی تەرمەکان بووە دەڵێ هەر لە نێو مهابادا هەشت هەزار و نۆسەد و هەشتا تەرمی دۆزیوەتەوە و ناشتوویە، دیارە ڕووسەکان ژمارەیەکی زۆریشیان لە دەوروبەری شاری و کێوەکان و باخەکان کوشتبوو کە لەو هەژمارەدا نین. دوای حەوتوویەک قەتڵی عام. خوداڵێخۆشبوو میرزا حاجی حاجی غەفوور لەگەڵ حاکمی ئەو کاتی سابلاغ و ئاغای محەمەدی ئیقباڵی دەچنە لای فەرماندەری ڕووسەکان بەنێوی بالا زاخارۆف کە لە خانووی پێشووی حاجی نازم ماڵی دانابوو و داوای لێ دەکەن دەست لە کوشت و کوشتار هەڵگرێ. فەرماندەری نێوبراو دوای پاڕانەوە و پێکێشی خوداڵێخۆشبوو میرزا حاجی و بەپێی ناسیاوی پێشووتر لەگەڵی بەتێلێگراف داوخوازی لێبوردنی گشتی

١- میرزا حاجی نێوی " عەبدولقادر" بووە، کوڕی گەورەی حاجی غەفووری قادری بووە. بڕوانە: سروە، ژمارەی ١٢٨ – ١٢٧ ڕێبەندان و ڕەشەمەی ١٣٧٥، لاپەڕەی ١٦، وتاری کامرانی قادری.

لە ئیمپراتۆری ڕووسییە دەکا، و داواکەیان دەپەژرێنێ.

ڕووسە قەیسەرییەکان لە ماوەی چەند ساڵی شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا (١٩١٤ – ١٩١٨ی زاینی) سەدەمەی گیانی و ماڵیی زۆریان لە کوردستان دا. خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی، کوڕی میرزا ئەحمەدی قازی و میرزا محەمەد عەلی گۆلێ، کوڕی حاجی ڕەحیمی قازی و میرزا سەعید کوڕی قازی قادریان کوشت و ماڵی قازی عەلی و میرزا فەتاحی قازی و قازیی مونعیم کوڕی قازی وەهابیان ئاور تێبەردا و دواجار چوار لە کوڕانی میرزا فەتاحی قازییان کە بە وەرگرتنی ئەمان لە ڕووسەکان، هاتبوونەوە شوێنی خۆیان (مەبەست ساوجبولاغی موکری یان مهابادی ئێستایە) و بریتی بوون لە عەبدوڕەحمانی سالاری موکری، مەلا محەمەد، میرزا مەحموودی مەنسوور، میرزا ئەحمەد و، هەروەها قازی لەتیف برای میرزا فەتاحی قازی و قازی عەلی و قازی مونعیم

(برازاکانی میرزا فەتاح) یان بۆ بەشداری لە جێژنێکدا بانگ دەکەن و لەوێ هەموویان دەگرن و هەموویان جگە لە قازی عەلی نەبێ دووردەخەنەوە بۆ ڕووسییە. قازی عەلی دوو یان سێ جار دەگرن، بەڵام هەر جارەی دوای چەند ڕۆژ بەری دەدەن.

کەسانی نێوبراو دوای گۆڕانی ڕێژیمی ڕووسییە لە ساڵی ١٩١٧ هەموویان بەسڵامەت هاتنەوە نیشتمان. ئەوان جگە لە ئاغای سالار و مەلا محەمەدی حاجی ئاباد، ئێستا هەموویان وەفاتیان کردووە. نووسەر حاڵی حازر دەستم بەئاغایانی نێوبراو (ئاغای سالار و مەلا محەمەدی حاجی ئاباد) ڕاناگا تا لە زانیارییەکانیان کەلک وەربگرم. چونکو ئێستا کە ئەو بیرەوەرییانە دەنووسمەوە، لە تەورێزم و ئەوانیش لە دێیەکانی خۆیان ساروقامیش و حاجی ئابادن و خەریکی کشتوکاڵن.

دوای ئەو هەموو کوشتوبڕ و کاولکاری و وێرانی و ئەتکی ناموسە کە ڕووسەکان لە کوردستاندا کردیان، بوونە هۆی سەدەمەیەکی دیکەش کە ئاسەواری زۆر لەو کوشتوکوشتار و تاڵانەی کردبوویان دڵتاوێنتر و ڕووخێنەرتر بوو. لە ماوەی چوار ساڵی شەڕی یەکەمی دنیاگرەوە دا، هەرێمی کوردستان هەمیشە مەیدانی شەڕ و پێکدادانی لەشکری ڕووس و عوسمانی بوو، وەرزێرانی لادێیان هەڵاتن، زۆربەی خەڵکی کوردستانی ئێران و تەنانەت عێراق و تورکییە سەری خۆیان هەڵگرتبوو و ڕایان کردبوو بۆ چیا و جەنگەڵان، هەروەها ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە خەڵکی کوردستانی ئێران کۆچیان کردبوو بۆ وڵاتی عێراق، لە دۆخێکی ئاوادا ئاشکرایە کاروباری کشتوکاڵ و چاندن بەکردەوە ڕاگیرابوو، ئەوە بووە هۆی قاتوقڕی، ئەویش چ قاتوقڕییەک، موسڵمان نەیبیسێ، کافر

نەیبینێ، دەستە دەستە خەڵک لە دێیەکان و شارەکانی کوردستان و تەنانەت لە شوێنەکانی دیکەی دنیا لە برسان دەمردن. نووسەر ئەودەمی شەش حەوت ساڵان بووم و بۆخۆم زۆرجار دیتم خەڵک لەبەرئەوەی برسێتی زۆری بۆ هێنابوون، گۆشتی سەگ و پشیلە و گوێدرێژیان دەخوارد و تەنانەت لە خواردنەوەی خوێنی ئاژەڵانیش دەستیان نەدەپاراست. سەگی بەرەڵا لە کووچە و کۆڵانان بەئاشکرا بەبەرچاوی خەڵکەوە خەریکی خواردنی تەرمی مردووان بوون. پێم وایە دێی باخچەی بنەماڵەی قازی، زیاتر لە دێیەکانی دی، لە بەر قاتوقڕی سەدەمە و تەلەفاتی بەخۆیەوە دی، چونکو ژمارەیەک لە عەشیرەتی مەنگوڕ (تایفەی زێڕنێ)، خاوەن موڵکانی گوندەکانی "چوارگا" و "هەنگەوێ" و "گوێجکەدەرێ" و هتد. لەشکریان کێشا سەر دێی باخچە و سەر باخچە و ئەو گوندانەیان داگیر کرد و هەرچی خەلە و خورد و خۆراکی خەڵکی ئەو دێیانە و خاوەن موڵکەکانیان بوو، خواردیان و دایان بەرەعیەتەکانی خۆیان، بەشێوەیەکی ئاوا هیچیان بۆ خاوەنانی ئەسڵی نەهێشتەوە و لە ئاکامدا بەشێکی سەرەکیی وەرزێرانی دێی باخچە لە برسان قڕ بوون.

دوای ئەوەی حاسڵات و گیا و گژ و میوە پێ گەیشت، توندوتیژی قاتوقڕی کەم بووەوە بەڵام ئەوانەی بەزیندوویی مابوونەوە ئەوەندەیان برسێتی چێشتبوو و شتی پیسیان خواردبوو، بەتایبەتی لەبەر بۆگەنبوونی زۆری تەرمی مردووان، تووشی نەخۆشییەکی گشتی هاتبوون و ئەوانەی مابوونەوە هەر بەو نەخۆشییە قڕبوون. ئاسەواری قاتوقڕی تا سێ چوار ساڵ مابووەوە و غەلە خۆشەویست و بەقیمەت بوو، دواتر بەرە بەرە حاسڵات زۆر بوو و خەڵک لە تەنگانە ڕزگاریان بوو.

خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی لەو سەروبەندانەیدا بارودۆخ شپرێو بووە و مەئموورانی دەوڵەت لە وزەیاندا نەبووە نەزم و هێمنیی شار بپارێزن، بۆخۆی کاروباری پاراستنی شاری وەئەستۆ گرتووە و خەڵکی شاری چەکدار کردووە و بۆ هەر گەڕەکێک کەسێکی وەک سەرۆکی پاراستنی نەزم و هێمنی دیاری کردووە و هێمنی شاری دامەزراندووە.

لە گوندەکانی لای ڕۆژئاوا و باشووری شاری مهاباد، تایفەکانی عەشیرەتی مەنگوڕ دەژین، هەندێک لەوان جارجار ئاڵۆزی و ناهێمنییان ساز دەکرد. لە سەروبەندی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازیدا، ئەوکاتەی کە پاراستنی نەزم و هێمنیی شار بەئەستۆی وییەوە بووە، پیاوەکانی بایزئاغای مەنگوڕ (بایز پادشای مەنگوڕ – وەرگێڕ)

(بایزئاغا لەلایەن تورکانی عوسمانییەوە نازناوی پادشایەتیی هەبووە) ڕانەمەڕێکی

خەڵکی شاری دەدزن، کاتێک ئەو خەبەرە بەگوێی خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی دەگا، کەسانی خۆی دەنێرێ بۆ شوێنگێرپی دزەکان، کەسانی خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی دزەکان دەگرنەوە و دوای هەندێک تەقە و لێدان مێگەلە مەڕەکەیان لێ دەستێیننەوە و دوایە شالاو دەبەنە سەر دێی هەمزاوا کە بایزئاغا (بایز پادشا) داگیری کردبوو، ئەو گوندە داگیر و تالان دەکەن و دەگەڕێنەوە شاری و کەلوپەلی تالانکراو لەنێو خەڵکی هەژارو نەداری شاریدا دابەش دەکەن.

دوای ئەو ڕووداوە خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی گەمارۆی ئابووری دەخاتە سەر مەنگوڕەکان و هاتوچۆی تاکوتەرای عێلی مەنگوڕ بۆشاری مهاباد بەتوندی قەدەغە دەکا و فەرمان دەدا هەرکاتێک خەڵکی ناوچەی مەنگوڕان بێنە مهابادێ، ئەو کەلوپەلی پێیانە لێیان بستێنن و خۆشیان بگرن. ئەو بابەتە کێشەیەکی زۆر بۆ مەنگوڕەکان ساز دەکا و دەبێتە گوشارێکی گەورە لە سەریان چونکو بەشی سەرەکیی عێلی مەنگوڕ لە دەورویەری مهاباد دادەنیشن و بۆ فرۆشتنی حاسلات و بەرهەمەکانی خۆیان کە بریتییە لە سەوزەواتی کوێستانی، ڕێواس، کارگ، کەنگر و تووتن و هەروەها بەرهەمی ئاژەڵ لە گوێن ماست، کەرە، پەنیر، ڕۆن، خوری و حاسلاتی جەنگەڵی وەکو ڕەژی و ئێزنگ و گوێنی و کەتیرە و مازوو و کڕینی پێداویستییەکانی خۆیان وەک قەند و چایی و پارچە و کەوش و برینج و... هتد. ناچاربوون بێنە مهابادێ، ئاشکرایە ئەو قەدەغە لێکردنە بەتەواوی گوشاری بۆ دەهێنان و لەبەرئەوەی بەزەبری زۆر و هەڵتۆز نەیاندەتوانی هیچ بکەن و دەستیشیان وەشارەکانی تر ڕانەدەگەیشت، بە ناچار ملیان ڕاکێشا و لەگەڵ خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی هاتنە ڕەدایێ و چەند کەس لە گەورە پیاو و ڕدێن سپی خۆیان بەهەندێک دیارییەوە ناردە ماڵی و لە ئاکامدا ئاشتی و تەبایی دامەزرا و ئێزنی هاتوچۆیان پێ درا، بەو مەرجەی ئەوانیش هەر ئاوا لەگەڵ تاجرە مهابادییەکان بجووڵێنەوە کە دەچوونە سەردەشت یان عێراق یان بۆ نێو مەنگوڕەکان خۆیان و بەتەواوی بیانپارێزن و هێمنییان دەستەبەر بکەن و هیچ چەتێک لە کاروباریان نەخەن.

دەبێ ئەم خاڵەش وەبیر بهێنمەوە خودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی لەگەڵ هەموو ئاغاکانی عێلی مەنگوڕ کێشە و عەداوەتی نەبووە، بەڵکو لەگەڵ هەندێک لەوان لەوانە لەگەڵ محەمەدی باپیرئاغای خاوەن موڵکی دێی سەلیمساغلوو ئەوپەڕی یەکێتی و یەکایەتی و دۆستایەتیی هەبووە و ئەو دۆستایەتییە قەت نەبووە بەعەداوەت و دوژمنایەتی. کاک محەمەد لەبەر خۆشەویستی و هۆگرییەک کە سەبارەت بەخودالێخۆشبوو میرزا فەتاحی

قازی بوویەتی، یەکێک لە کوڕەکانی خۆی ناوناوە "فەتاح". نووسەر ئەو کوڕەم کە لاوێکی بەخۆوە و وێچوو بوو، لە تاوڵی دێی شارستێنی محاڵی بەستام بەگ دیتووە.

بۆ ڕوونبوونەوەی هۆی ئەو کارەسات و ئاکارە توند و تیژانەی ڕووسەکان کە لە کوشتار و خوێنڕێژی لە کوردستاندا کردیان، ناچارم هەندێک ڕاستی بگێڕمەوە: هەروەک پێشتر ئاماژەی پێ کرا، هەرێمی کوردستان لە ماوەی شەڕی یەکەمی دنیاگرەوەدا مەیدانی هەڵتۆزهەڵتۆز و پێکدادانی هێزە دژبەرەکان بوو و وەک هەستان و نیشتنەوەی شەپۆلی دەریا وابوو، سەردەمێک هێزی عوسمانی زۆر و تازە نەفەسبوون تێیدا و بەنێوی ئەوەی سوڵتانەکانی بنەماڵەی عوسمان خەلیفە و جێنشینی پێغەمبەری ئیسلامن (دروودی خودای لێ بێ)، خێڵ و عەشیرەت، شێخ و مەشایخ و ساداتی کوردیان بەنێوی جیهاد لە ڕێبازی ئالای ئیسلامدا دنە دەدا، لە ئاکامی ئەوەدا کوردەکان هێرشیان دەکردە سەر هێزی ڕووسەکان لە کوردستاندا و ئەوانیان دەردەکرد و تا مەراغە و تەورێزیان ڕاودەنان. پاشان ڕووسەکان هێزی خۆیان ڕادەهێزاند و تورکەکانیان دەشکاند و دیسان و بۆ جاری سێیەم سابلاغیان داگیر دەکرد.

بەکورتی هەرێمی شەڕ بەردەوام دەستاودەستی دەکرد، جار جار ڕووسان لە پێش بوون و ئەو شوێنانەیان دەگرتەوە کە لە دەستیان ئەستێندرابوون و جارجاریش تورکانی عوسمانی سەر دەکەوتن. بەدەم ئەو کێشەیەوە، ئەو کاتانەی ڕووسەکان تێک دەشکان، لەشکری خێڵە کوردەکان لە ئاست ئەو سەربازە ڕووسانەی بەیەخسیر دەگیران خراپ دەجووڵانەوە، سەرو دەست و ئەندامانی دیکەی کوژراوەکانیان دەبڕی و لە سەر ڕێپێڵگە و ڕێگایان بۆ تەماشا دایان دەنان. ئاشکرایە ڕووسەکان لەو جۆرە ئاکارە دڕندانانە توورە دەبوون و ڕق دای دەگرتن. تەنانەت جارێک بەڕێگای میرزا حاجی، کوڕی خودالێخۆشبوو حاجی غەفووری قادری لە مزگەوتی سووری مهاباد ڕایان گەیاند دەوڵەتی بەرزی ڕووسییە هیچ شەڕ و کێشەیەکی لەگەڵ دەوڵەتی ئێران نییە و دەوڵەتی ئێران لەو شەڕەدا بێلایەنیی خۆی ڕاگەیاندووە[1]، ئێمە دوژمنی دەوڵەتی عوسمانین و لەگەڵ ئەوان شەڕ دەکەین، ئەوان دەوڵەتن و ئێمە دەوڵەتین، جارجار ئەوان دەشکێن و دەکشێنەوە و جارجار ئێمە دەشکێین و پاشەکشە دەکەین و دیسان دێینەوە. ئێوەی خەڵکی کوردستان نەکارتان بەسەر ئێمەوە بێ

١- بابم بەدوای ئەو ڕستەیە لە کەوانەدا لێی زیاد کردووە: ڕووسەکان ئەگەرچی پێیان لێ دەنا دەوڵەتی ئێران بێلایەنە، دیار نییە بەچ حەق و بەچ بیانوویەک قشوونی چەکداری خۆیان دەهێنا بۆ نێو خاکی ئێران و ئەوێیان کردبووە شەرگە.

و نە بەسەر عوسمانییەکان و خۆتان لە شەڕ وەرمەدەن. ئێوە ڕەعییەتی دەوڵەتی ئێرانن و دەوڵەتی ئێران بێلایەنە، حەق ئەوەیە ئێوەش هەر چاودێر بن و کارتان بەسەر کاری ئێمەوە نەبێ و خەریکی کارو کاسبی خۆتان بن.

خوداليێخۆشبوو میرزا حاجی، کوڕی حاجی غەفووری قادری ڕۆژێک لە مزگەوتی گەورەی سابڵاغ (مزگەوتی سوور) لە ڕووی خێرخوازی و چاکە بیریی خۆی ئەو پەیامەی ڕووسەکان بەخەڵک ڕادەگەیێنێ، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو سەروبەندی خەڵک نەخوێندەوار بوون و ئاگایان لە هەلومەرجی دنیا نەبوو، فریوی شاپەوگاپەی عوسمانییەکانیان خواردبوو و هیچ پێشوازییەکیان لە قسەکانی خێرخوازانەی میرزا حاجی نەکرد و لەبەرئەوەی نێوبراو پێوەندیی بازرگانی لەگەڵ ڕووسییە هەبوو، تاوانباریان کرد بەلاگری لە ڕووسەکان. کەسێک بەنێوی ڕەحمان کەوگیر بە ئاشکرا لە مزگەوتێ بەدمیدا دێتەوە و دەڵێ: ئەتۆ ڕووس پەرستی بەڵام ئێمە موسڵمانین و ڕووسەکان کافرن، دەبێ شەڕ و جیهادیان لە دژ بکەین. ئەوە بوو دانیشتوان و هەڕەمەی خەڵک بەقسەی عوسمانییەکان هەڵخەڵەتان و وەخۆ کەوتن و بێ هیچ جۆرە تەدارەک و چەکێک و بەپرێسکەیەک نانەوە لەگەڵ عەسکەرەکانی تورکی عوسمانی دەچوونە شەڕی ڕووسان، ئەو ڕووسانەی بەباشترین چەکی مۆدێرنی ڕۆژ وەکو تفەنگ، تۆپی شرینێل، موسەلسەل، فڕۆکە؟ تێلگراف و تەلەفۆن و بێ سیم تەیار بوون، ئەو جۆرە کردەوەیە جگە لە خۆکوژی و لە نێوبردنی خۆیان و نەتەوەکەیان چ ئاکامێکی دیکەی نەبوو و بەروبووی ئەوە بوو کە پێشتر باس کرا.

خوداليێخۆشبوو قازی فەتاح هەروەک پێشتریش باس کرا لە پیاوانی زۆر هەڵکەوتوو و بەنێوبانگی مهاباد بوو، بەڵام بچووکیی شوێنەکە و بێدەرەتانیی ماڵی و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دوژمنانی زۆر بەمەترسیدار و بەتوانا لەوانە کۆنسوولی ڕووسییەی قەیسەری لە مهاباد، محەمەد حوسێن خانی سەرداری موکری حاکمی مهاباد، حاجی محەمەد ئاغای ئێلخانیزادە سەرۆکی عەشیرەتی دێبۆکری و بایزئاغا (بایز پادشا)ی مەنگوڕ سەرۆکی عێلی مەنگوڕ و لەوانە هەمووان زیاتر دژایەتیی توندی کاربەدەستانی دەوڵەتی لەگەڵی، دەرفەت و دەرەتانی پێ نەدەدا ئاهێکی بێتەوە بەر و بتوانێ کارێکی گرینگ بەقازانجی میللەت و وڵات بکا، ئاخرەکەی لە بەر دژایەتیی توندی سەرۆک عەشیرەتەکان و خاوەن دەستەڵاتانی ناوچەیی، لە سەردەمی سەلتەنەتی موزەفەرەدین شای قاجار ماوەی دوازدە ساڵ لە تاران یان لە بەندیخانە یان لە ژێر چاودێریدا ڕایان گرت.

خوداليێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی لە تاران لەگەڵ ئەوەشدا لە ژێر چاودێریدا بووە و

ئازادیی نەبووە باوەکو ئەوەش کەسایەتی و لێوەشاوەیی زاتیی خۆی نیشان داوە و لە دەستگای سەڵتەنەتی و لە لای مەزن و پیاو ماقووڵانی تاران جێی ڕێز و حورمەت بووە. تەنانەت جارێک بزووتنەوەیەکی مەزن و هەرایەکی گەورە لە تاران لە شارەدێی شاعەبدولعەزیم دژی حکوومەتی ڕۆژ ساز دەبێ، کاربەدەستان لە خامۆشکردنی ئەو هەرایە، کە چلۆنایەتیی وی بۆ من ڕوون نییە، تێدا دەمێنن. دواجار بۆ کپکردنی ئەو هەرایە دەستەودامێنی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی دەبن، بەڕێزیان لەگەڵ سەرکردەکانی خۆپێشاندەران پێوەندی دەکا و کێشەکە بەخۆشی کۆتایی پێ دێ. لە ئاکامی ئەو کارەدا، دەوڵەت میرزا فەتاحی قازی، بەڕێز و حورمەتەوە دەنێرێتەوە بۆ شوێنی نیشتەجێبوونی هەمیشەییی خۆی (ساوجبولاغی موکری).

میرزا فەتاحی قازی بۆ پاراستنی هەڵکەوت و دەستەڵاتی خۆی و بۆ خۆڕاگری لە بەرانبەر ئەو دوژمنە بەمەترسییانەی بوویەتی، جگە لەوەی پێنج شەش کوڕی وێچوو و ئازای هەبووە، هەمیشە ژمارەیەک لە بوێرترین کەسانی لە لای خۆی بەنۆکەر ڕاگرتووە و لەبەرئەوەی داهاتی بەشی ئەو هەمووە نۆکەر و چەک و جلوبەرگ و خەرجی سەفەرەی نەکردووە، بەناچار کەسری مخاریجی خۆی لە تاجرانی دەوڵەمەند بەتایبەتی لەو جۆرە کەسانەی زانیویەتی سەروسێریان لەگەڵ دژبەرانی هەیە بە تکا یان بەزۆری ئەستاندووە، بۆ وێنە کاتێک دەستەنگ بووە بەشەو یەکێک لە کوڕەکانی لەگەڵ دووسێ نەفەر لە نۆکەرەکانی ناردووەتە ماڵی تاجرێک و گوتوویانە ئاغا (بۆ ڕەچاوکردنی حورمەتی زۆر لە ئاست خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی، تەنێ لەفزی ئاغا بەکار براوە) بێ دراوە و ئێمە هاتووین بڕی هەزارتمەن نەغد و پێنج تا برینج و پێنج تا قەند و دوو سندووق چایی بنێرن. تاجری بێچارە کە نەیوێراوە هیچ بڵێ، دەستبەجێ فەرمانی داوە شتەکانیان بدەنێ و گوتوویە هەرچی پیاوەکانی خوڵای چکۆڵە (خوڵای چکۆڵە مەبەست لە میرزا فەتاحی قازی بووە) دەیانەوێ زوو بیاندەنێ. نۆکەرەکانی میرزا فەتاحی قازی دەستبەجێ دراو و کەلوپەلەکەیان وەردەگرت و لەگەڵ خۆیان دەیانبرد.

زانای گەورە جەنابی ئاغای ئەحمەدی تورجانیزادە[1] – مامۆستای ئێستای کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی تەورێز ڕۆژێک سەبارەت بەکەسایەتیی میرزا فەتاحی قازی گێڕایەوە – بابی خوداڵێخۆشبووی مەلا حوسێنی تورجانی نۆکەرێکی هەبووە ڕۆژێک ئەو نۆکەرە بەمەلا

---

١– مامۆستا ئەحمەدی تورجانیزادە ڕۆژی چوارشەمۆ دووەمی ڕەزبەری ١٣٥٩ی هەتاوی لە تەورێز کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی " وادی ڕحمەت "ی ئەو شارە بەخاک ئەسپێردراوە.

حوسێن دەڵێ: ئاغا لە ماڵ نەبوو، خوداڵێخۆشبوو مەلاحوسێنی تورجانی کە هەمیشە دژی قازی فەتاح بووە دەپرسێ: ئاغا کێیە؟ بەڕوونی بیڵێ. نۆکەرەکە لە وڵامدا دەڵێ: مەبەستم لە ئاغا میرزا فەتاحی قازییە. خوداڵێخۆشبوو مەلاحوسێن تووڕە دەبێ و بەنۆکەرەکەی دەڵێ: ئەتۆ بەرات و خەڵات لە من وەردەگری و بەمیرزا فەتاحی قازی دەڵێی " ئاغا" ؟ لەئێستاوە ئیدی نۆکەری من نی و دەرت دەکەم.

هەروەک پێش گوتم، میرزا فەتتاحی قازی هەمیشە ژمارەیەک لە کەسانی ئازا و ناسراوی بەدەور و بەرییەوە بووە و لە خزمەتیدابوون. بەنێوبانگتر لە هەموویان خوداڵێخۆشبوو سەید کەریمی سەیدی قوشچی بووە. ئەو سەید کەریمە لە هەموو شەڕێکدا سەرکەوتوو بووە و هەمیشە ئازایەتییەکی جێی سرنجی لەخۆیەوە نیشان داوە، بۆیە لە لای میرزا فەتاحی قازی بێ ئەندازە خۆشەویست و بەڕێز بووە، بیستوومە تەنانەت ئەو سەید کەریمەی لە کورەکانی خۆشی زیاتر خۆش ویستووە. دەگێڕنەوە ڕۆژێک کوڕانی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی و لاوەکانی دیکەی بنەماڵە بەتایبەتی میرزا عەبدوڵای قازی عەسکەر، برازا و زاوای قازی فەتاح، سەید کەریم تووڕە دەکەن و پێی دەڵێن ئەتۆ ترسەنۆکی. ئەو قسەیە لە دڵی سەید کەریم گران دێ دەستبەجێ خەنجەرەکەی لەبەر پشتێندی دەردەهێنێ و لە ڕانی خۆی دەدا، بەشێوەیەکی ئاوا کە نووکی خەنجەرەکە کوناودیو دەبێ. کوڕانی خوداڵێخۆشبوو قازی فەتاح لە ترسی بابیان ڕووداوەکە دەشارنەوە و بەدزی لە ژوورێک دەیخەن و تیماری دەکەن بۆ ئەوەی برینەکەی خۆش بێتەوە و هەرکاتێک میرزا فەتاحی قازی دەپرسێ سەید کەریم لە کوێیە، نایبینم؟ وڵامی دەدەنەوە بۆ جێبەجێکردنی کارێک ناردوویانەتە "قارنجە".

خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی هەشت کوڕی هەبووە، بەپێی ئەم ڕیزەی خوارەوە:

١- میرزا عەبدوڵڵا ناسراو بە سیقەت.

٢- میرزا عەبدوڕەحمان ناسراو بە سالاری موکری.

٣- مەلا محەمەد ناسراو بە قازی محەمەدی حاجی ئاباد.

٤- میرزا مەحموود ناسراو بە مەنسوور.

٥- میرزا ئەحمەد.

٦- موحسین ئاغای موجاهیدی.

٧- میرزا حوسێن ناسراو بە" گرژە" کە بەجحێلی کۆچی دوایی کردووە.

٨- میرزا عەزیزی ڕووحی زاد

ئاگادارییەکی ئەوتۆم لە سەر میرزا عەبدوڵای سیقەت نییە. کوڕەکانی میرزا عەلی و میرزا قاسم و عەبدوڵا (کاک میرزا)ن. ئەوی یەکەمیان لە بۆکان خەریکی تەجارەتە و بەڕێژە ژیانێکی باشی هەیە. میرزا قاسم لە کویلاباد بەشێکی هەیە و بەداهاتی بەڕێ دەچێ. ئەوەی سێهەمیشیان ژیانێکی ئاسایی و بێ هەست و خوست تێ دەپەڕێنێ.

ئاغای عەبدولرەحمانی سالاری موکری (کە پاشناوی جەوانمەردی قازی)یە کەسێکی زانا و بەنوتق و قسەزان و خەت خۆشێکی هێژایە. لە تافی لاوەتیدا پیاوی شەڕ و گۆڵمەزان بووە و بەئازایەتی بەنێوبانگە و لە زۆربەی کێشە کێش و هەرای خوداڵێخۆشبووی بابی، میرزا فەتاحی قازیدا بەشداریی کردووە و لە کاتی قۆڵبەست بوونی بابی لە تاران، لەگەڵی بووە.

لە شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا، ئاغای سالار و براکانی قازی محەمەد و مەنسوور و میرزا ئەحمەد نزیکەی دووساڵ یەخسیری ڕووسە قەیسەرییەکان بوون و دوای شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبری ڕووسییە و بشێویی بارودۆخی نێوخۆیی ئەوێ، بەوەزعێکی دڵتاوێن گەڕانەوە ئێرانێ.

تاقە کوڕی ئاغای سالار، میرزا عەبدوڕەحیمی جەوانمەردی قازییە.[1] ئاغای سالار خاوەنی بەشێک لە گوندی ساروقامیش بوو و تاکۆتایی تەمەنی لەوێ دەژیا. خوداڵێخۆشبوو سالار پیاوێکی قسە خۆش و بەمەعلوومات و سەروسیمایەکی ئازایانە و پیاوانەی هەبوو. نێوبراو هەندێک یادداشتی سەبارەت بەحاڵ و ئەحواڵی خۆی و ڕووداوەکانی ناوچەیی نووسیبووەوە، بەداخەوە ئەو یادداشتانە لە لایەن سەروان کەنزی، سەرۆکی سازمانی ئەمنییەتی مهاباد، دەستیان بەسەردا گیرا.[2]

مەلا محەمەد ناسراو بەقازی محەمەدی حاجی ئاباد پیاوێکی زانا و خۆش مەجلیسە و، لە حاجی ئاباد خەریکی کشتوکاڵە، هەروەک پێشتر باس کرا، بەڕێزیشیان لەگەڵ براکانی

---

١- حاجی عەبدولرەحیمی جەوانمەردی قازی پیاوێکی خۆش مەجلیس و بە ئیمان بوو، بەڕێزیان ڕۆژی سێ شەممۆ ٧٣/٣/١٧ ی هەتاوی لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا لە مهاباد مالاواییی لە ژیان کرد. نێوبراو لە ڕێژیمی ڕابردوودا (ڕێژیمی پاشایەتی) بۆ ماوەی دوورودرێژ لە بەر هۆی سیاسی زیندانیی کێشا.

٢- کاک ئەحمەدی قازی، کوڕی خوا لێخۆشبوو حاجی مەلا کەریمی قازی ڕای گەیاند، دوای دەستاودەستێکی زۆر ئەو یادداشتانە لە لای وی بوون و بەداخەوە، لە ڕووداوێکی ماڵ سووتاندا، لەنێوچوون.

دیکەی لە شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا بۆ ماوەی درێژ لە خاکی ڕووسیە یەخسیری ڕووسەکان بوون. هۆی دژایەتی ڕووسە قەیسەرییەکان لەگەڵ خودالێخۆشبوو قازی فەتاح کە بەشەهادەتی وی و یەخسیرکرانی کوڕەکانی تەواو بوو، ئەوەبوو خودالێخۆشبوو قازی فەتاح لەبەر دەمارگرژیی دینی لایەنگری جیددی و سەرسەختی ترکییەنی عوسمانی بوو و بەتوندی لەگەڵ کۆنسوولی ڕووسیەی دانیشتووی مهاباد دژایەتی دەکرد. کۆنسوولی ڕووسیە لە یەکێک لە شەڕەکانی ترکییەنی عوسمانی لەگەڵ لەشکری ڕووسییە دەکوژرێ و سەری لە بەدەنی جوێ دەکەنەوە و دەیهێنن بۆ مهاباد.

میسیۆ ب. نیکیتین کۆنسوولی پێشووی ڕووسیە لە ورمێ، لە کتێبی " ایرانی کە من شناختەام "[١] (ئەو ئێرانەی من ناسیومە) دەڵێ نێوی کۆنسوولی ڕووسیەی لە ساوجبولاغ (مهابادی ئێستا) کۆلۆنێل ئیاس بووە و سەبارەت بەکوژرانی ئاوا دەنووسێ: لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩١٤ لە سابلاغەوە چوو بۆ میاندواو تا لە نزیکەوە چاوی بە سەر ڕووداوەکانەوە بێ و، بەو دەسترۆیشتوویەی هەیبوو، لەکاتی پێویستدا دەست لە بارودۆخ وەردا . بەدبەختانە لە نێوەڕاست مانگی ژانویە حاکمی کۆنی (؟) تەورێز کە لە قەوقاز تەقریبەن دەستەبەسەر بوو و دوورخرابووەوە (مەبەست حاجی سەمەد خانی شوجاعودەلە یە – وەرگێڕی کوردی)، گەڕاوە ئێرانێ و هەندێک کاری کرد کە بەزەرەری خۆشی تەواو بوو و لە شەڕ دژی کوردان لە دەوروبەری میاندواو تێک شکا، هەر لەو کاتەش دابوو کۆلۆنێل (ئیاس)یش کوژرا . دەستێکی جینایەتکاری کە کۆنسوولی کوشت، واتە کەسێکی کە لە شەڕدا نەبوو لەنێوی برد هەر بەئەوەندەش ڕازی نەبوو بەڵکو سەری کۆنسوولی کوژراوی بڕی (و بەسەر دارێکییەوە کرد) هێنایە ساوجبولاغ و لەبەر دەرگای یەکێک لە کەسانی ناسراوی کورد بەنێوی قازی فەتاح دای چەقاند، بۆ ئەوەی هەموو کەس ببینێ و هەمووان لەو جینایەتە خوشحاڵییان دەردەبڕی، یەکێک لە ترکییەکانیش بەنێوی موتەسەریف لە نێو بینەراندا بوو و زیاتر لە هەموو کەسی دیکە لەو ڕووداوە شادی دەردەبڕی. بەکورتی دوای تەماشای سەری بڕاو دایانە دەست منداڵانی کورد و خودا دەزانێ لە کوێ بزر بوو. بەدەنی وییان لە میاندواو لە تەنیشت چۆمی ناشت و وەک بیستوومە لافاوی ئاوی بەهارێ گۆڕی ئەوی شۆردووەتەوە و لەگەڵ خۆی بردوویە. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە، ژەنەڕاڵ ڕیباڵ چێنکۆ، بەتۆڵەی ئەو جینایەتە ماڵی قازی فەتاحی ئاور تێ بەردا و تەختی کرد.

---

١– وەرگێڕان و نووسینی ئاغای فەرەوەشی (موتەرجیم هومایوونی پێشوو)، لاپەڕەی ٢٠٤

لەو ڕووداوانەی لەمەڕ قازی محەمەدی حاجی ئاباد شیاوی باسکردنن، یەکێکیان ئەوەیە ئەو سەروبەندی دانیشتووی مهاباد بووە لەگەڵ حاجی قازی کەریم کوڕی قازی مونعیم شەڕێکیان لێ پەیدا دەبێ، گۆیا قازی کەریم، جنێو و قسەی سووکی پێ دەڵێ. قازی محەمەدی حاجی ئاباد ئەو ڕووداوەی زۆر لە دڵ گران دێ و نامەیەک بۆ براکانی خۆی دەنێرێ و ڕووداوەکەیان، بۆ باس دەکا، دوای ئاگاداربوون لەو مەسەلەیە، میرزا ئەحمەدی برای پچووکی لەگەڵ چەند نۆکەر دێن بۆ مهاباد و شەڕەکە دیسان دەست پێ دەکاتەوە، لەو لێدان و کوتانەدا برای قازی کەریم، بەنێوی میرزا محەمەد کە بە" حەمە سیپاڵ" بەناوبانگ بووە دەکوژرێ. دوایە کار دەگاتە ئاشتی و پێکهاتنەوە، کوڕانی میرزا فەتاحی قازی خوشکی خۆیان بەنێوی یای خەجیج (دایکی هاوسەری دووەمی نووسەر) دەدەن بەمیرزا وەهاب برای قازی کەریم. هەروەها زەوییەکانی باخی قۆپی وەکو خوێن بایی دەدەن بەوان(١). بەو پێیە پێک دێن و دڵئێشە و ناخۆشی نێوانیان کۆتایی پێ دێ.

قازی محەمەدی حاجی ئاباد، ئەوکاتەی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد کوڕی قازی عەلی و براکەی خوداڵێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی و ئامۆزاکەیان خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی لە مهاباد لە بەندیخانەی هێزی دەوڵەتیدا بوون، بەوهیوایەی بۆ ڕزگارکردنیان لە تاران کارێک بکا، هاتە تارانێ و ماوەیەک لە تاران بۆ ڕزگاریی ئەوان لە حەول و تێکۆشاندا بوو، دواجار بەڕواڵەت بەڵێنیان پێ دابوو قازییەکان بۆ ماوەیەکی کورت بۆ یەکێک لە ناوچە دوورە دەستەکانی وڵات دوور دەخەنەوە، بەڵام لەپڕ لە بەرواری دەی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی لە مهاباد لە دار دران و زەحمەتەکانی مەلا محەمەدی حاجی ئاباد، بەهیچ کوێ نەگەیشت. ئەمن نووسەر لەو ڕۆژەدا لە تاران لەگەڵ بەڕێزیان لە موسافیرخانەی (نونهال) لە نهۆمی ٣ ژووری ژمارە ٣دا هاو وەتاغی بووم. ڕۆژ ڕۆژی دەیەمی خاکەلێوەی ١٣٢٦ بوو، لای ئێوارێ لە ژووری موسافیرخانە بەیەکەوە دانیشتبووین، لەو دەمەدا دەنگی ڕۆژنامە فرۆش لەناو هەرا و زەنای

---

١- کوڕەکانی خوالێخۆشبوو قازی کەریم، کە گشتیان قسەخۆش و نوکتەبازن، یەکیان واتە کاک ئەحمەدی قازی کە تەقریبەن کوڕی نێونجی خوالێخۆشبوو حاجی مەلاکەریمی قازییە، دوای ئەوەی لەو بیست سی ساڵەی دواییدا خەڵک بۆ خانوو دروستکردن بەتوندی هێرشیان کردە سەر زەوی کشتوکاڵی و غەیری ویش و تەنانەت باغاتیش، ڕۆژێک لە مەجلیسی براکانیدا گوتبووی بریا یەکێکی تر لە مامەکانی ئێمەیان بکوشتبایە. براکانی بەبیستنی ئەو قسەیە سەریان سوڕ دەمێنێ و نارەحەت دەبن، نێوبراو دەستبەجێ لێی زیاد دەکا: ئەو دەمی ئەوەی بەئێمە گەیشتبایە، دوو قات دەبوو.

ئۆتۆبوسەکان و ماشێنی باریدا کپ بوو کە بەردەوام بەشەقامی (سپە)کە لە نێوەندی شاریدا هەڵکەوتووە، تێ دەپەڕن. مەلا محەمەد لە منی پرسی: ئەرێ ڕۆژنامە فرۆش چیی گوت ؟ لە وڵامدا گوتم، باسی نێوی قازی کرد، بەڵام هەمووی تێ نەگەیشتم. دوایە زەنگی لێدا و پێشخزمەتی پیری موسافیرخانە کە پیاوێکی ئازەربایجانی بوو، هاتە ژووری مەلا محەمەد دوو قڕانی دایە و گوتی بڕۆ ڕۆژنامەیەک کە ئێستا کابرا دەنگی دەهات بکڕە و بیهێنە. پێشخزمەت چوو، دوای چەند دەقیقە هاتەوە. بەر لەوەی ڕۆژنامەکە بداتە دەست ئێمە، بەزمانی تورکی گوتی:" قازی محەمەدی دارە چەکتیلار" یانی قازی محەمەدیان لە داردا. ئەمن دەستبەجێ ڕۆژنامەکەم لێ وەرگرت کە بەخەتی درشت خەبەرەکەیان لە سەرەوەی لاپەڕەی یەکەمی ڕۆژنامەی ئیتیلاعات نووسیبوو، بەم شەرحەی خوارەوە، خوێندەوە: ئەمرۆ بەیانی سەعات ٦ی دەیەمی فەروەردین مانگ (خاکەلێوە) قازی محەمەد و براکەی سەدری قازی، نوێنەری خولی چواردەی مەجلیس و محەمەد حوسێنی سەیفی قازی لە مهاباد لە داری سزا دران. مەلا محەمەد لە منی پرسی، چییان نووسیوە؟ گوتم خەبەرەکە ڕاستە و لە عەیبەتان نەمتوانی هیچی دیکە بڵێم، ڕۆژنامەکەم دایە دەستی بەڕێزیان، دوای ئەوەی خەبەرەکەی خوێندەوە لەبەر ئەو خەم و جەخارەی بەسەریدا هات لە کورسییەکە کەوتە خوارێ لە پێشدا پێم وابوو، دڵی ڕاوەستاوە، بەڵام هەستم پێ کرد هێشتا زیندووە و دەقسانم گرت و گوتم ئەو خەبەرە هێشتا ئەسەح نییە، چونکو چەند ڕۆژە هەموو چاپەمەنییەکان دەنووسن دەست لە ئێعدامی وان هەڵگیراوە و هەر دووریان دەخەنەوە، بۆیە پێویست ناکا لە ئێستاوە ئاوا خۆت نارەحەت بکەی. بەڕێزیان دەستبەجێ چوو بۆ ماڵی سەدری قازی کە ئەو دەمی ماڵی لە تاران بوو، بەمنیشی گوت ئەتۆش وەرە، بەڵام ئەمن لەبەر پەژارە و نارەحەتیی زۆر نەمتوانی بچم و ژن و منداڵەکانی لەو حاڵەتە دڵتاوێنەدا ببینم و داوای لێبووردنم لێ کرد، بەڵام بۆ بەیانییەکەی، لەگەڵ بەڕێزیان چوومە ماڵی خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان و سەدری قازی و دەرکەوت کە خەبەرەکە ڕاست بووە. بەڕێزیان ئێستا لە گوندی حاجی ئابادی محاڵی بێهی دەژی. منداڵی کوڕی بەڕێزیان ئەحمەد و عومەرن کە خەریکی خوێندنن.

میرزا مەحموود، ناسراو بەمەنسوورولسوڵتان کەسێکی ڕووخۆش و سەخی و میواندۆست بوو. کەمێکی خوێندەواریی فارسی هەبوو. بەئازایەتی و بوێری بەناوبانگ بوو، ئەویش لەگەڵ براکانی بۆ ماوەی درێژ یەخسیری ڕووسان بوو لە خاکی ڕووسیە، لە سەردەمی حکوومەتی خودالێخۆشبوو قازی محەمەددا ماوەیەک سەرۆکایەتیی ئیدارەی

شارەبانی (پۆلیس) مهابادی بەدەستەوە بوو. لەشەڕی بەناوبانگی قارنجەدا ئازایەتی و بوێرییەکی زۆری نواندبوو. ئەو شەڕە بەکورتی ئاوا بووە: هەروەک لە شەرحی حاڵی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازیدا، باسم لێوە کرد، ناوبراو دوژمنی زۆر مەترسیداری هەبوو و لە هەمووان بەمەترسیتر حاجی محەمەد ئاغای ئێلخانی بوو کە لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو، میرزا فەتاح بەهیچ جۆر دانووی نەدەکولاّ و جارویار ئەگەر دەرفەتێکی دەست کەوتبا، زەبرێکی لە میرزا فەتاح دەدا، لەوانە میرزا ڕەشیدی باپیرئاغای قارەمانی شێخ ئاغایی کە پیاوێکی ئازا و شەڕانی بوو، هان دا بچێتە دێی قارنجە لە محاڵی بێهی کە سێ دانگی ئی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاح بوو، داگیری بکا. میرزا ڕەشیدی باپیرئاغا بەحەوت سەد سوار و چەند سەد پیادە بەرەو قارنجە دەچێ و لەهەموو لایەکەوە دێی ناوبراو گەمارۆ دەدەن. میرزا مەحموودی مەنسوور و براکەی میرزا ئەحمەد و سەید کەریم لەگەڵ ژمارەیەکی دیکە لە نۆکەرانی میرزا فەتاحی قازی کە بەهەموویانەوە دە دوازدە کەس زیاتر نەبوون، لە بەرانبەر ئەو لەشکرە بۆڵەدا بڕیاری دەستکردنەوە و بەرگری دەدەن. شەڕ و پێکداداان دەست پێ دەکا. میرزا مەحموود خەبەری ڕووداوەکە بەئاگاداریی میرزا فەتاحی بابی دەگەیێنێ و داوای یارمەتی و فیشەکیشی لێ دەکا. میرزا فەتاح بەڕادەی پێویست گوللە و فیشەکیان بۆ دەنێرێ، بەلاّم پەیامیان بۆ دەنێرێ هێزی یارمەتیدەریان بۆ نانێرێ، و ئەگەر کوڕی من دەبێ لە بەرانبەر ئەو لەشکرەدا خۆڕاگری بکەن و سەرکوتی کەن. بەکورتی ئەو فیشەکەی میرزا مەحموود و میرزا ئەحمەد و نۆکەرەکانیان پێیان دەبێ تەواو دەبێ و ئەو فیشەکانەی میرزا فەتاح بۆی ناردبوون بەدەستیان ناگا، چونکو ئەو نۆکەرەی فیشەکی بۆ بردبوون لەبەرئەوەی گوندەکە بەتەواوی لە گەمارۆی میرزا ڕەشید و سوارەکانیدا بووە، ناتوانێ بچێتە لای مەنسوور و فیشەکەکان بدا بەبەرێزیان. میرزا مەحموود و میرزا ئەحمەد و نۆکەرەکانیان کاتێک هەرکامیان لە سێ چوار فیشەک زیاتریان پێ نامێنێ، بڕیار دەدەن خۆیان لەو داوە ڕزگارکەن. بەدوای ئەوەدا سواری ئەسپەکانیان دەبن و ئاڵقەی گەمارۆ تێک دەشکێنن. سوارانی میرزا ڕەشید تا دێی سریلاوا وەدوویان دەکەون و دەچنە ماڵی شێخزادە، خوشکی شێخی حیسامەدین و داوای تفەنگ و فیشەک دەکەن، ئەو چەکەی لە ماڵی شێخزادەدا هەبووە هەڵی دەگرن لەو کاتەدا ئاغایانی سادات و پیاوماقووڵان بەتایبەتی حاجی عەبدوڵای شێخ عەلی دەگەنێ و دەچنە لای میرزا ڕەشیدی حاجی باپیرئاغا و داوای لێ دەکەن دەست لە وەشوێن کەوتن و ڕاوەدوونانی ئەوان هەڵگرێ، چونکو تا دواین هەناسە دەست دەکەنەوە و بەشەڕ دێن و

ئێستاش بەڕادەی پێویست چەک و فیشەکیان بەدەست هێناوە. میرزا ڕەشیدی باپیر ئاغا و شوێنگیرانی دی دەست لە وەدووکەوتنیان هەڵدەگرن و دەگەڕێنەوە دێی قاڕنجە و ئەوەی خراپەیە لە دێی قاڕنجە دەیکەن: باخەکان و قەڵەمەزاری میرزا فەتاحی قازی خاشەبڕ دەکەن و خانووبەرەی ئەربابیی، ئاور تێ بەردەدەن. لەو شەڕەدا دوو یان سێ لە نۆکەرانی میرزا مەحموود دەکوژرێن و دوو سێ کەسیشیان بریندار دەبن. لە لەشکری دێبۆکرییەکان زیاتر لە بیست کەس دەکوژرێن و سی کەسیان بریندار دەبن،

لەوانەی دەکوژرێن سێ کەسیان لە خزمەکان و ئامۆزاکانی میرزا ڕەشید بوون.

کوڕانی خوداڵێخۆشبوو میرزا مەحموود بریتین لە: عەزیز، کەریم، قادر، سەعید[١].

خوداڵێخۆشبوو مەنسوور کە تازە لە نەخۆشییەک هەڵدەستێتەوە و لە حاڵی بناوبوێردا دەبێ، ڕۆژێک لە دێی سارووقامیش دەبینێ، ئاوی چۆمی تەتەهوو هەستاوە و ئەوە خەریکە جوانەگای پیرێژنێکی هەژار دەبا. نێوبراو بەناجوامێری دەزانێ لە بەرچاوی سێلاو جوانەگای پیرێژنێ ببا، بۆیە لەو هەوا ساردەی سەرەتای بەهاریدا خۆی بەئاوەکەدا دەدا و بەزەحمەت و ڕەنجێکی زۆر جوانەگایەکە لە دمی شەپۆلی تووڕەی چۆمەکە دەستێنێتەوە و دەیگەیێنێتە ساحیلی ڕزگاری، بەڵام بۆخۆی لە بەر سارد بوونی ئاوەکە دەستبەجێ لەرز و تای دێتێ، دوای یەک دوو ڕۆژ لەو بەسەرهاتە ماڵاوایی لە ژیان دەکا[٢].

خوداڵێخۆشبوو میرزا ئەحمەد، لە تەمەنی لاوێتیدا وەفاتی کردووە، ئەویش لەگەڵ براکانی بۆ ماوەی درێژ یەخسیری ڕووسەکان بووە و لە شەڕی قاڕنجەشدا بەشداریی کردووە. هەر وەک پێشووتر نووسرا، میرزا محەمەد کوڕی قازی مونعیم بەدەستی وی کوژراوە. کوڕانی میرزا ئەحمەد عەبدولفەتاح و حەسەنن.[٣]

موحسین ئاغای موجاهیدی دایکی خەڵکی تاران بوو. خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاحی قازی لەو سەردەمەیدا لە تاران لە ژێر چاودێریدا بووە ئەو خانمەی مارە کردبوو. موحسین ئاغای موجاهیدی ماوەیەک لە کۆمپانیای پێشووی نەوتی ئێران و ئینگلیس کاری دەکرد و دوایە گوێزرایەوە بۆ ئیدارەی ڕێگاویان، ئێستا لە مەشەد لە ئیدارەی ڕێگاوبان سەرۆکی حیسابدارییە و لەبەرئەوەی زمانی ئینگلیزی زۆر باش دەزانێ، ئەرکی دیلمانجی

---

١– ئێستا هەر کاک سەعید ماوە و لە مهاباد دادەنیشێ و خەریکی کاری ئازادە.

٢– ئەو ڕووداوە تەقریبەن بەهاری ساڵی ١٣٢٨ یان ١٣٢٩ی هەتاوی بووە.

٣– عەبدولفەتاح ناسراو بە کاکاغا، زۆر لەمێژە کۆچی دوایی کردووە، بەڵام براکەی کاک حەسەن ماوە.

کۆنسوولخانەی هیندستانیشی بە ئەستۆوەیە[1]. کورەکانی بریتین لە شاڕوخ، فەڕوخ، ئیرەج.

حوسێن ناسراو بە" گرژە" دایکی ئەویش فارس بوو، نێوبراو بەلاوەتی لەپڕ نەخۆش دەکەوێ و گیان دەسپێرێ.

عەزیز ناسراو بە عەزیزی ڕووحیزاد، دایکی لادێیی بووە، براکانی هیچ لایان لێ نەدەکردەوە، بەلاوەتی لە ئێران ڕۆیشتووە و ئێستا لە ئەرتەشی عێراقدا دەرەجەی ئیستیواریی هەیە، لەو دوایانەدا خانەنشین کراوە، لە سلێمانی دووکانی نانەوایی کردووەتەوە و بارودۆخی ماڵیی خراپ نییە.

(مام عەزیز لە ساڵی ١٩٦٤ - ١٩٦٥ لە ڕانیە دووکانی نانەوایی هەبوو و زۆر لە تێکۆشەرانی ڕۆژهەلاتی کوردستان و لەوانە برازاکانی، ئەمیری قازی، ڕەحمەتی قادری مەنسووری قازی (مامەند)، و ڕەحمەتی حاجی مونتەقیمی قازی و نووسەری ئەم دێرانە سەریان دەدا. دەرگای ماڵەکەی بۆ هەموو کوردە ئێرانییەکان ئاواڵە بوو. مام عەزیز لەگەڵ خانمێکی تورکمان زەواجی کردبوو، منداڵیان نەبوو، بەلام کچێکیان وەخۆ کردبوو. ئەو خانمە تورکمانە لە ساڵانی دواتردا جارێک بۆ سەردانی خزمان هاتە کوردستانی ئێران. تێبینیی وەرگێڕی کوردی).

قازی وەهاب (برای میرزا فەتاحی قازی) کە لە مهاباد پلەی قەزاوەتی هەبووە لە کاتێکدا کە لە مزگەوتی قازی خەریکی نوێژکردنی بەیانی بووە و سەری بەسوجدە داداوە ماڵئاوایی لە ژیان کردووە و تا ماوەیەک هیچکەس هەستی بەمردنی نەکردووە. مجێوری مزگەوتی قازی خوداڵێخۆشبوو مەلا عەبدوڵا ناسراو بە" خوارزا" کە لێی نزیک دەبێتەوە و هەرچەندی بانگی دەکا وەڵامێکی لێ نابیسێ، کاتێک ڕای دەتڵەکێنێ، قازی وەهاب دەکەوێتە سەر زەوی و، نێوبراو ئەوجار دەزانێ قازی وەهاب گیانی داوەتەوە بەگیان ئافرێنەر.

---

١- خوالێخۆشبوو موحسین ئاغای موجاهیدی تا ساڵی ٤٥-١٣٤٤ ی هەتاوی مابوو.

میرزا ڕەزاق (برای میرزا فەتاحی قازی) لە کۆنە دێ، خەریکی کاری کشتوکاڵ بووە.[1]

خوداڵێخۆشبوو قازی وەهاب دوو کوڕی هەبووە:

١- قازی مونعیم.

٢- میرزا حەمید.

میرزا حەمید زیاتر لە دێی قاڕنجە ژیاوە و خەریکی کشتوکاڵ بووە. کوڕەکانی بریتی بوون لە میرزا برایم و میرزا ساڵح هەردووکیان دانیشتووی قاڕنجە بوون و خەریکی کشتوکاڵ بوون و لە تەمەنی جوانیدا ماڵاواییان لە ژیان کردووە.

قازیی مونعیم، خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم بەڕادەی پێویست لە زانستە دینییەکان و ئەدەبیاتی فارسیدا خوێندەواری هەبوو و خاوەنی مەحکەمە و مەحزەری شەرعی بوو. لە مەحکەمەکەیدا مەسەلەی گرینگی شەرعی و دۆزی حوقووقی و تەلاق و ساتوسەودای موڵکی جێبەجێ دەکران. لە مەحزەر و مەجلیسیدا بەپێی دابی ڕۆژ هەمیشە ژمارەیەکی زۆر لە عالمان و تاجران و پیاوماقووڵان ئامادەبوون و لەسەر کێشەی جۆربەجۆری دینی و شەرعی و مێژوویی و عیرفانی دەدوان و ڕاوێژیان دەکرد. لە ئامادە بووان بەچایی میوانداری دەکرا و لە جێژنە دینییەکاندا (جێژنی ڕەمەزان و جێژنی قوربان و جێژنی لە دایکبوونی حەزرەتی جێ کۆتا، محەمەدولستەفا درووودی خودای لێ بێ) بێ ڕێزپەڕ قاوە بەناو هەمووواندا دەبەشراوە. ئەو دەمی هێشتا عەدلییە و ئیدارەی تاپۆی بەڵگە و ئەحواڵی شەخسی پێک نەهاتبوو و کاروباری عەدلیە و تاپۆکردنی سەنەد و بەڵگە ئەو جۆرە مەحزەرە شەرعییانە بەڕێوەیان دەبرد. لەو مەحزەرانەدا لەگەڵ ئەوەشدا کاروبارەکانیان بێ خەوش و کەموکوڕی نەبوو، دۆزی زۆر گرینگی موڵکی و حقووقی لە ماوەی یەک دوو ڕۆژ، و ئەوپەڕی لە ماوەی حەوتوویەکدا جێبەجێ دەکران و بەلایەکدا دەخران، ئەگەر لایەنەکان سەنەد و بەڵگەیەکیان هێنابا گۆڕێ، دوای لێکۆڵینەوە لە بەڵگەکان و گوێگرتن لە قسەی لایەن و شاهیدەکانیان، حوکمی حاکمییەتی شەرعی دەدرا بەلایەک و ئەگەر هاتبا شاهید و بەڵگە لە گۆڕێدا نەبایە،

---

١- بابم دوای میرزا ڕەزاق شەرحی حاڵی خواڵێخۆشبوو قازی لەتیفی باس کردووە و لەبەرئەوەی شەرحی حاڵی قازی لەتیف لە کتێبی " سالهای اضطراب " (ساڵانی پەشێوی) (بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازی) دا هاتووە، لێرەدا لە دووپاتە کردنەوەی دەست دەپارێزین. بابم دوای باسێکی تێروتەسەل لەمەڕ قازی لەتیف و سمایل ئاغای شکاک دەست دەکا بەباسی کوڕانی خواڵێخۆشبوو قازی وەهاب کە لێرەدا دەکەوێتە بەرچاوی بەڕێزتان. (بەسەرهاتی قازی لەتیف لە پاشکۆی دووەمی وەرگێڕانی کوردی ئەم دەقەدا هاتووە – تێبینیی وەرگێڕی کوردی)

کەلامی خولای، واتە قورئانی مەجید دەبوو بەحاکم و لایەنێک سوێندی دەخوارد و حاکم دەبوو و بەو پێیە کێشە و دووبەندی کۆتایی پێ دەهات و جارجاریش کێشەکان بەپێی نەریت و داب و شوێن و کەیخوایەتی بەلایەکدا دەخران و لایەنەکان بەڕەزایەتەوە ئاویان بەئاوری کێشە و دۆزەکەیاندا دەکرد و بەخۆشی و ڕەزایەتەوە، دەچوون بەدووی کاری خۆیانەوە. لە کۆتاییەکانی سەروبەندی قەزاوەتی خودالێخۆشبوو قازی مونعیمدا، عەدلیە بەشێوەی نوێ پێک هات و جێبەجێکردنی کێشە و دۆز لە مەحزەری شەرعی بەرتەنگ کرا و دواجار بەتەواوی قەدەخە کرا و کوێر بووەوە. خودالێخۆشبوو قازی مونعیم جگە لە کاری قەزاوەت کشتوکاڵیشی دەکرد. قازیاوا، وزن دەرێ، باخی قۆپی، باخی مەلای، بەشێک لە مەزرای عەینولزەمان (کەریم ئاوا) و قەرە برایم، ئی بەرێزیان بوو، ماوەیەکیش دێی بایندەرێ لە بەیعولشەرعی بەرێزیاندا بووە، دوایە دراوەتەوە بەخاوەنەکەی. گوندی تۆختە لە کۆنەوە ئی بنەماڵەی قازی بووە. کاتێک برایم ئاغا (کوڕی مەلا عەبدولەلیک کوڕی میرزا عەبدوڵڵای قازی) و میرزا ڕەشید (کوڕی میرزا موئمین کوڕی میرزا عەبدوڵڵای قازی) خاوەن موڵکەکانی ئەوێ خودا لێیان خۆش بوو، موڵکی نێوبراو بوو بە ئی وەرەسەیان. لەو سەروبەندەدا قات و قڕی بەناوبانگی کۆتاییەکانی شەڕی یەکەمی دنیاگرەوە (هاوکاتی ساڵانی ١٣٣٥ و ١٣٣٦ی کۆچی مانگی) قەوما[1] و کاکە سواری مەنگوڕ گوندەکانی بەیرەم[2]، بەرمجۆ، (گردە بەران) ی لە کوڕانی خاڵ ئۆغڵی[3] (پاشناویان مەلیکزادە بوو) تاجری تەورێزی ئەستاند و دوو کەس لەوانی بەنێوی عەلی ئاغا و سمایل ئاغا کوشت و گوندی تۆختەشی کە دراوسێی گوندەکانی نێوبراو بوو خستەوە سەر ئەوان. چەند ساڵ دوای ئەوەی گوندی تۆختە بەدەست کاکە سوارەوە بوو، ناوبراو بۆ ئەوەی ڕووی شەرعی بدا بەداگیرکاریی خۆی، ڕای گەیاند ئامادەیە گوندی تۆختە بکڕێ و لەبەرئەوەی خاوەنانی موڵکەکە سەغیر و کەم تەمەن بوون، خودالێخۆشبوو قازی مونعیم دەبوو وەک قەیوم ئەو سەودایە بکا و دواجار هەرچۆنێک بوو[4] قازی مونعیم ئامادە بوو بەنوێنەرایەتیی

١– مەبەستی بابم ئەوەیە پەیدابوونی قاتوقڕی و چۆلبوونی لادێکان لە دانیشتووان و مردن و پەراگەندە بوونی خەڵک لەبەر شەڕ، یارمەتیی کرد بەکاکە سوار بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی (واتە داگیرکردنی گوندەکانی نێوبراو).

٢– بابم لە وڵامی پرسیاری مندا گوتی کە بەیرەم پێشتر موڵکی مەلیک پاشا خانی بەیرەم بووە. پاشا خان لە خانزادەکان بووە.

٣– بڕواننە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ٨

٤– هەرچۆنێک بووبێ، ئەوە نیشان دەدا کە خوالێخۆشبوو قازی مونعیم لەمەڕ ئەو سەودایە دوودڵ بووە.

سەغیرەکان دێی تۆختە بەکاکە سواری مەنگوڕ بفرۆشێ. ئاشکرایە کاکە سواری مەنگوڕ پیاوێک نەبوو دراو بدا و مولک بکڕێ و ئەو سەودایەی هەر لەبەر ئەوە دەکرد، ڕوویەکی شەرعی و قانوونی بدا بەداگیرکردنی مولکی نێوبراو. بەکورتی خوالێخۆشبوو قازی مونعیم، ئاوەدانیی نێوبراوی شەش دانگ بەشەش هەزارتمەن بەکاکە سوار فرۆشت، بەڵام لەبەرئەوەی کاکە سوار دراوی نەغدی نەبوو، بایی دێیەکەی نێوبراو بدا، بەو پێیە، ئەو سەودایەی بەقەرز کرد.

بۆیەش خوالێخۆشبوو قازی مونعیم قەباڵەی مولکەکەی نەدایە و وەکو وەسیقە لە لای خۆی ڕای گرت. لەوەش دەرچێ بەئاگاداریی گشت عالمان و پیاو ماقووڵان کاغەزێکی شەرعی لە کاکە سوار ئەستاند بێت و دوای تێپەڕینی ساڵێک کاکە سوار دراوەکە نەدا، گوندی تۆختە نەزری قازی مونعیم خۆی بێ. بەو پێیە کاکە سوار نیوە بەزۆر و نیوە بەتکاو ڕەجا و بۆ ماوەی شەش ساڵ ئەو گوندەی خوارد و دوایە بۆ ئەوەی بابەتەکە بەتەواوی لە بیر بکرێ و بەکارێکی دابنێ کە بڕاوەتەوە، گوندی تۆختەی خاشەبڕ کرد و لە سەر زەوی گوندی بەرەجۆ دێیەکی دیکەی دروست کرد و نێوی لێ نا میرەدێ. هەرچەندی خوالێخۆشبوو قازی مونعیم پێی دەگوت بایی دێیەکەی بداتێ، کاکەسوار گوێی پێی نەدەبزووت و وەڵامی نەدەداوە. کاکە سوار هەر دەمەی بەبیانوویەک تەفرەی دەدا، جگە لە بەگشتی نزیکەی هەزار و دووسەت تمەن دراوی نەغد و کەلوپەل نەبێ کە لە ماوەی ئەو شەش ساڵەدا دابووی بەقازی مونعیم و لەپاش بەجێماوانی خاوەن مولک. پاش شەش ساڵان لە پاش بەجێماوان کە گەیشتبوونە تەمەنی بلووغ بەجیددی داوای مولکی خۆیان یان بایی ئەویان لە قازی مونعیم دەکردەوە و لەبەرئەوەی قازی مونعیم نەیدەتوانی مولکی نێوبراو لە کاکە سوار بستێنێتەوە یان نرخەکەی لێ بستێنێ، دواجار لە پاش بەجێماوان ناچار مان ڕوو لە کاربەدەستانی دەوڵەتی بنێن و هەر ئەو کارەشیان کرد. لەو سەروبەندیدا هێشتا عەدلیە بەشێوەی ئێستا پێک نەهاتبوو و ئەو جۆرە کاروبارە لە لایەن کاربەدەستی عەسکەری لە کۆمیسیۆنی عەشیرەتیدا پێی ڕادەگەیشترا و لەبەرئەوەی حەق بە لە پاش بەجێماوان بوو، کۆمیسیۆن لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، دەنگی دا بۆ بەرحەقبوونی لەپاش بەجێماوان و ئەوان دیسان مولکەکەی خۆیان وەگیر کەوتەوە.

دوای ماوەیەک لە پاش بەجێماوان لەوێ دامەزران، خوالێخۆشبووی بابم کە ئەودەمی بەشی لە گوندی گۆل و چۆمەڵاندا هەبوو، ئامادە بوو بەشی خۆی لەگەڵ گوندی تۆختە یان میرە دێ بگۆڕێتەوە. دوای ئەو کارە، دیسان کاکە سوار ڕەگی کەڵەگاییی بزووت و

گێرەوکێشەیەکی زۆری بۆ بابم ساز کرد[1].

پێویستە ئەو خاڵەش باس بکەم، خوداڵێخۆشبوو میرزا برایمی قازیزادە، کوڕی خوداڵێخۆشبوو میرزا جەلیلی قازی بۆ ئەستاندنەوەی دێی تۆختە لە کاکەسواری مەنگوڕ، زۆری کوێرەوەری دی و زۆر بەجیددی شانی دا بەر ئەو کارە و، لە ڕاستیدا دەستخستنەوەی ئەو موڵکە تەنێ لە سایەی هیممەت و پشتکاری بەڕێزیان هەڵسووڕا ، دەنا لەپاش بەجێماوان کە هەڕەمە و نەخوێندەوار و زماننەزان و لە هەمان کاتدا هەژار و نەدار بوون، مەحاڵ بوو بتوانن کارێکی ئاوا گرینگ بەو ئاسانییە ئەنجام بدەن.

خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم لە شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا کە ڕووسە قەیسەرییەکان دەستدرێژییان کردبوو بۆ سەر خاکی ئێران و لە هیچ جۆرە کوشتن و تاڵانێک لە کوردستان دەستیان نەپاراستبوو، ماوەی دوو ساڵ، لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو قازی لەتیف و کوڕانی خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاح یەخسیری ڕووسان بوو. خوداڵێخۆشبووان قازی لەتیف و قازی مونعیم کە بەتەمەن بوون نەیاندەتوانی لە هەلومەرجی سەختی یەخسیریدا بۆ ماوەیەکی درێژ بەزیندوویی بمێننەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دوای دوو ساڵ یەخسیریی لەگەڵ ئەوانیدی بەسڵامەت هاتنەوە نیشتمانی خۆیان.

خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم چوار کوڕی هەبوو: قازی کەریم، میرزا محەمەد، میرزا وەهاب، میرزا قادر. قازی کەریم (کوڕی گەورەی قازی مونعیم) لەگەڵ ئەوەشدا ئەدەبیاتی فارسی و سەرف و نەحوی عەرەبی و شەریعەتی باش دەزانی و خەت و ڕەبتێکی خۆشی هەبوو، باوەکو ئەوەش تا ئەوکاتەی بابی زیندوو بوو (و دوای ئەویش)[2] چ مەیلێکی ئەوتۆی نیشان نەدەدا بۆ کاری قەزاوەت کە پشتاوپشت بۆی مابووەوە و لە هەمان کاتیشدا بەدامەزرانی عەدلیە لە برەو کەوتبوو، بەڵکو زۆربەی کاتی خۆی بە ڕاو و کشتوکاڵ تێپەڕ دەکرد، ئەنگێوەیەکی تەڕدەست بوو، دایم و دەرهەم لەگەڵ هاواڵە ڕاوچییەکانی زستانان، لە نێو بەفر و سەهۆڵبەنداندا، لە تەنیشت چۆمی مهاباد خەریکی ڕاوە مراوی بوو، هاوینان لە کێوەکانی بایندەرێ، کەرێزە، قازیاوا ڕاوە کەوی دەکرد، جارجاریش بەقولاپ خەریکی ماسیگرتن دەبوو. لە کۆتاییەکانی ژیانیدا بۆ ئەنجامدانی فەریزەی دینی چووە حیجازێ و ماڵە خولای تەواف کرد. بەڕێزیان لە دوای دوو سێ ساڵ کە بەجێ و بانەوە کەوتبوو و

---

١– لە کتێبی "سالهای اضطراب" یان بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازیدا بە دوور و درێژی باسی مەسەلەی کاکەسوار کراوە.

٢– ئەو نووسینەی نێو دووکەوانە بژارکار (قادری فەتتاحی قازی) لێی زیاد کردووە.

هەمیشە لە دەست نەخۆشی ئاه و ناڵەی بوو، لە بەهاری ساڵی ١٣٣٢ی هەتاوی ئەو دنیا بێ بەقایەی بەجێ هێشت.

خوداڵێخۆشبوو حاجی قازی مەلاکەریم، حەوت کوڕی هەیە، بەم ناوانەی خوارەوە:

عەبدوڕەحمان، عەبدوڵڵا، مستەفا (عەبدولڕەزاق)، ئەحمەد، مونتەقیم[1]، مەلیک (مەحموود)، یوسف.

کوڕی گەورەی خوداڵێخۆشبوو حاجی قازی مەلا کەریم، کاکە ڕەحمانە. بەڕێزیان جەوانێکی لێوەشاوەیە، خوێندەواری تا نزیک پۆلی سێیەمی ئامادەییە، خەتی یەکجار خۆشە و لە هونەری نیگارکێشیدا تەڕدەستە، ڕاوچییەکی زۆر چازانە، ئەنگێوەیەکی وەهایە چ لە هەوا و چ لە زەوی سێرەی تفەنگی بەزایە ناچێ. بەکورتی بڵێم جەوانێکی ژیرو پێگەیشتوو و کارلێهاتوو و ئازا و قسە ڕەوان و بە دموپلە. کوڕەکانی دیکەی خوداڵێخۆشبوو قازی کەریم کەم تەمەنن و خەریکی خوێندنن و بەهیوای خوڵای لە ژوورسەری، داهاتوویەکی درەوشاوەیان دەبێ.

کوڕەکەی دیکەی خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم، میرزا محەمەد، هەروەک پێشتر باس کرا لە شەڕێکدا لەگەڵ میرزا ئەحمەد کوڕی خوداڵێخۆشبوو قازی فەتاح کوژرا.[2]

میرزا وەهابی قازی، کوڕی سێیەمی خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیمە. کچەکەی عەیالی دووەمی منە و خوشکی من، مریەم خانم عەیالی میرزا محەمەد کوڕی بەڕێزیانە. میرزا وەهاب، پیاوێکی هەتا بڵێی مەجلیس خۆش و قسە خۆش و شیرین کەلامە، هەربۆیەش لە نێو هەموو ئەندامانی بنەماڵەی قازی و تەنانەت بێگانەشدا بەتایبەتی زۆر خۆشەویستە. بەڕێزیان کەمێک خوێندەواریی فارسیی هەیە و لە کاری کشتوکاڵدا زۆر چازانە. نێوبراو ماوەیەک لە دێی قازیاوا دەژیا و خەریکی کشتوکاڵ بوو، بەڵام لەو دوایانەدا گوندی نێوبراو و گوند(ەکانی) داش تەمری (سەرێ و خوارێ) دوای سازکردنی بەنداو، چوونە ژێر ئاو و لە جیات قازیاوای پێشوو ئاوەدانییەکی دی لە بناری کێوی بەو دوایانە دروست کراوە.

میرزا وەهاب ڕاوچی و ئەنگێوەیەکی زۆر تەڕدەستە، بەڵام ماوەیەکە دەستی لە ڕاوکردن بەتفەنگ هەڵگرتووە، تەنێ جارویار بەقولاپ خەریکی ڕاوە ماسی دەبێ. نێوبراو لەو

---

١- خواڵێخۆشبوو حاجی مونتەقیمی قازی ڕۆژی شەمۆ ٧٤/١٠/٢٤ لە نەخۆشخانەیەک لە تاران ماڵاوایی لە ژیان کرد و لە مهاباد، گۆڕستانی بداغ سوڵتان تەسلیم بە خاک کراوە.

٢- کوژرانی میرزامحەمەد لە سەردەمی ژیانی بابیدا ڕووی داوە.

دوایانەدا لە[…]ە نەفەسی و برۆنشیت بەجێ و بان لە ماڵێدا کەوتووە و خانەنشین […]ک حەسانەوە و موداوایە. میرزا وەهاب لە سەردەمی حکوومەتی قازی بووەدا ر[…]یمی ئیدارەی باربەری بوو و چەند دەزگا کامیۆنی شڕی شەڕی دووەمی کر[…] لەبەردەستدا بوو. بۆیە دوای هاتنەوەی هێزی دەوڵەتی بۆ مهاباد، ماوەیەک [ز]یندانی کرا. نێوبراو بڕی پێنج هەزار تمەنی لە ئیدارەی دارایی مهاباد بۆ کڕینی کەلوپەلی یەدەکی ماشینەکان وەرگرتبوو و ئەو دراوەی ناردبووە تەورێز بۆ کڕینی کەلوپەلی یەدەک. دوای هاتنەوەی نەیپوو ئەو دراوەیان لە بەڕێزیان دەویستەوە. نێوبراو ناچار بوو ئەو بڕە پارەیە بەسوود لە سەلەمخۆران قەرز بکا و بیداتەوە. جابۆیە ماوەیەک قەرزدار و دەستتەنگ بوو. پاشان دراوەکەی ئامادە کرد و دایەوە و ئاسوودە بوو. میرزا وەهاب دوو کوڕی هەیە: محەمەد، عومەر. کاک محەمەد(١) خەریکی کاری کشتوکاڵە و عومەر دەخوێنێ.

کوڕەکەی دیکەی خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم، میرزا قادرە. بەڕێزیان لە دێ[…] وزندەرێ خەریکی کشتوکاڵە و لەو بوارەدا کەسێکی چازان و بە مشوورە. کەم تاکورتێ[…] خوێندەواریی فارسیی هەیە. منداڵە کوڕەکانی بریتین لە: حاجی حەسەن، ئەحمەد، مونع[…] حاجی حەسەن خوێندەواریی فارسی هەیە و لە کاری کشتوکاڵدا یارمەتیی بابی د[…] ئەحمەد و مونعیم هێشتا منداڵ و چکۆلەن.

---

١- ئاغای محەمەدی قازی حەوتوویەک دوای پێکدادانی ماشێنی شەخ[…] ڕۆژی چوارشەمۆ ١١ / ٣ / ٧٣ ماڵاوایی لە ژیان کرد و لە گۆڕ[…] […]کرا. ناوبراو منداڵی نەبوو و بە "کاکە شینە" بەناوبانگ

# قازی محەمەد(١)

خوداڵێخۆشبوو میرزا عەلی قازی، دوو کوڕی هەبوو: ١– میرزا محەمەدی‌مومامی
کە دواتر بە قازی محەمەد، نێوبانگی دەرکرد. ٢– ئەبولقاسمی سەدری قازی.
خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، خوێندنی لە مهاباد دەست پێ کرد و ماوەیەکیش لە
خانەقای شەرەفکەند لەگەڵ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و میرزا قاسمی مەجیدی
خوێندی. ئەدەبیاتی فارسی و سەرف و نەحوی لەلای بابی خۆی قازی عەلی و عالمانی تری
ناوچەیی دەخوێند، لە هەمان کاتدا زمانەکانی ڕووسی و ئینگلیزی و فەڕانسەیی لە لای
ەرکەس ئەو زمانانەی زانیبا، فێر دەبوو و بۆ فێربوونی زانست و مەعریفەت هەدای
دەدا و هەمیشە تێ دەکۆشا، لە کەمترین دەرفەت بۆ فێربوون کەلکی وەردەگرت، هەمیشە
هەرکوێیەک بوویا کتێب، ڕۆژنامە یان گۆواری بەدەستەوە بوو، زۆر جاران کاتێک
یان بەکۆڵان و شەقامدا تێ دەپەڕی، خەریکی موتاڵا و خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆوار
پیاوێکی شارستانی، بەدین، ئازادیخواز، بەجەرگ، حەقیقەتبین و لە هەمان کاتدا،
م و سەروڕوو خۆش بوو. یەکجار زۆریش حەزی لە وەرزش بوو. هەموو ڕۆژێ بەیانی
خەو هەڵدەستا، میل بازیی دەکرد، ماوەیەک لە هەوای ئازاددا هەڵدەهات و، دوایە
ی دەکرد، مەلەکردنی لە ئاوی ساردیشدا یەکجار زۆر پێ خۆش بوو، هاوینان لە
هابادێ کە بەبەر خانووی بەڕێزیاندا تێ دەپەڕی، شوێنێکی تایبەتی و قووڵی پەیدا
هەموو ڕۆژێ بۆ ماوەیەک مەلەی تێدا دەکرد، زۆرجار منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی
ێری مەلەی دەکردن، ئەو شوێنەی چۆمی ئێستا بە" گۆمی قازی" بەنێوبانگە(٢).

---

کو قەت بیری لەوە نەدەکردەوە نووسراوەکانی چاپ و بڵاو بینەوە و لە ڕاستیدا ئەوانی بۆ لێ
انی خۆی دەنووسی و لە لایەکی تریشەوە کاری نووسین بۆ ئەو زیاتر لایەنی سەرگەرمیی
ە پێرۆیی لە نەزمی ئاسایی و بەڵێندراو و ناسراوی نووسەران نەکردووە و هەرچییەکی لە
سین لە زەینیدا بووە، هێناویەتە سەر کاغەز، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە، ئەم باسە
اسی سەبارەت بەخواڵێخۆشبوو قازی (عەلی)یە کە پێشتر هاتووە.
ێ کە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەخوشێ، ئێستا هێندێکیان لە شاری (بەشی کۆنی
کردووەتەوە) و بەرەو باکووریان بردووە و لە هەر دوو بەری چۆمی دیوار ڕایەڵ کراون و بە
شەقام لێ دراون. لەبەرئەوەی ئێستا لە بەر دیوارکێشان دەست وێ ڕاگەیشتن بەچۆمی،
انی بوون بەچەنگەڵی چڕ و وەکو شاکارەکانی نیگارکێشی خەیاڵبزوێن و جوانن. ئەو
ازەی پێ دەکا ئێستا باغی عێلییەکی زۆر جوانیان لێ سازکردووە.

گۆم لەزمانی کوردیدا بەشوێنێک لە چۆم دەڵێن کە قووڵ بێ.

خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، پیاوێکی زۆر فەرهەنگدۆست و لایەنگری زانست و مەعریفەت بوو و پێی وابوو میللەت تەنێ لە سایەی زانست و مەعریفەتدا دەمێنێ. بۆیە زۆری پشتیوانی لە فەقێ و تەلەبەی زانستی دینی دەکرد و یارمەتیی ماددی و مەعنەوی پێ دەکردن. نێوبراو لە لای تەلەبەی زانستی دینی ڕێز و خۆشەویستییەکی تایبەتی هەبوو بەڕادەیەکی ئەوتۆ کە گشت فەقێ و تەلەبان ئەویان بە سەرۆک و سەرپەرستیی خۆیان دادەنا.

ڕێکخراوی فەرهەنگ و پەروەردەی نوێباو لە مهاباد بەرووبووی تێکۆشانەکانی ئەو و مامی خودالێخۆشبوو سەیدلقوزاتە. لەسەرەتای دامەزراندنی قوتابخانە بەپێی پرێنسیپی نوێباو، بەڕێوەبردن و سەرپەرستیی قوتابخانە نوێباوەکانی مهاباد بەڕەسمی بەئەستۆی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات بوو و پاشان خودالێخۆشبوو قازی محەمەد جێی ئەوی گرتەوە. بەڕێزیان بۆ پەرەپێدانی فەرهەنگی مهاباد زۆری زەحمەت کێشا، دواتر لەبەرئەوەی چاوەڕوانی پێشکەوتنی زیاتری دەکرد، بەرەبەرە تێکەڵاوی سیاسەتی عەشیرەتی و ناوچەیی بوو و دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ پێڕاگەیشتن بەکاروبارەکانی ئیدارەی فەرهەنگ بۆ نەماوە، بۆیە تەریکیی خۆی لە نوێنەرایەتی فەرهەنگی مهاباد دەربڕی، و دوای بەڕێزیان خودالێخۆشبوو میرزا برایمی قازیزادە کوڕی خودالێخۆشبوو میرزا جەلیلی باخچەی کوڕی میرزا ڕەحمانی قازی ئەو بەرپرسیارییەتەی بە ئەستۆوە گرت، بەڕێزیان بۆ ماوەیەکی درێژ بەرپرسی فەرهەنگی مهاباد بوو.

ئەمەش بڵێم لەبەرئەوەی کارکردن لە دەستگای دەوڵەتیدا پێویستی بەیەکپۆشی هەبوو وخودالێخۆشبوو قازی محەمەد ئامادە نەبوو لە جلوبەرگی مەلایەتی و پلەی قەزاوەت دەست هەڵگرێ، بۆیە لە پیشەی دەوڵەتی لە فەرهەنگ خۆی کێشایەوە و بۆ ماوەیەکی کاتی کە جلوبەرگی یەک شێوەی دەبەر دەکرد، دیسان جلوبەرگی ڕوحانییەتی دەبەر کردەوە.

لەبەرئەوەی پلەی قەزاوەتی شەرعی لە مهاباد لە کۆنەوە بەدەست بنەماڵەی قازی بوو، بۆیە ئەوان لە لای لێپرسراوانی دەوڵەت و هەروەها لە لای زۆربەی خەڵک حورمەت و گەورەییەکی یەکجار زۆریان هەبوو. ئەو دووبەندی و شەڕوکێشەیەی لە نێوان عەشیرەتە کوردەکان یان لە نێوان عەشیرەتەکان و دەوڵەتدا دەقەوما، بنەماڵەی قازی بەشێوەیەکی جێی ڕەزایەت و هێمنانە لە ڕێگای کەیخوایەتییەوە جێبەجێیان دەکردن. لەبەر ئەو ڕێز و دەستڕۆیشتوویەی کە بنەماڵەی قازی لە لای کاربەدەستانی دەوڵەت هەیانبوو، ئەگەر

خەڵک، لە کاروباری دەوڵەتی، یان نادەوڵەتیدا گیرەو کێشەیەکیان بۆ هاتبایە پێشێ، پەنایان بنەماڵەی قازی بوو. بەتایبەتی خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی و برایەکی خودا لێخۆشبوو سەیفولقوزات و خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و برایەکەی خوداڵێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی، ئەوانە لە هیچ جۆرە چالاکی و تێکۆشان و خۆبەختکردنێک ئەویش بێ منەت و بێ هیچ جۆرە چاوەڕوانییەک لە ڕاپەڕاندنی کاری خەڵک وکردنەوەی گرێیان کەمتەرخەمییان نەدەکرد و لەو کارەدا ئەوەندە زیدەڕۆیی و پێکێشیان دەکرد جار جار بۆ جێبەجێکردنی کاری کابرایەکی لادێیی لەگەڵ کاربەدەستێکی پایە بەرزی دەوڵەتی تووشی کێشە دەهاتن. زۆربەی ئەو کەسانەی لە ئیدارە دەوڵەتییەکان دامەزرابوون، لە لایەن خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی و یان قازی محەمەدەوە دەستەبەر کرابوون. جارێکیان نووسەری ئەم دێڕانە فایلی ژاندارمەیەکی خەڵکی مەراغەم دی کە خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی بۆی بووبوو بەزامن. ئەمن زۆرم پێ سەیر بوو و گوتم سەدری قازی ئەو کابرایەی نە دیوە و نە دەیناسێ، چۆن ئامادە بووە زەمانەتی ژاندارمەیەکی خەڵکی مەراغە بکا؟

یەکێک لە ئامادە بووانی مەجلیسەکە گوتی: فلانکەس ئەوە سەیر نییە، لە جێدا ئاکاری ئەم بنەماڵەیە ئاوایە، خۆشەویستی و دەستگرۆیی ئەوانە هەموو کەس دەگرێتەوە جا چ بیانناسن یان نەیانناسن، ئەو جۆرە دەستەبەربوونە داراییانە هەرهیچ، کەسانی ئەوتۆیان پاراستووە کە تاوانی زۆر قورسیان وەپاڵ دراوە، هەر وەک ژمارەیەک لە سەرانی خێڵی مەنگوڕ کە بەتاوانی ڕاپەڕین دژی دەوڵەت لە سەردەمی مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ لە تەورێز دەستبەسەرو بەند کرابوون بەنێوبژیکاری و زەمانەتی خوداڵێخۆشبوو سەیفولقوزات لە بەندیخانە ئازاد کران، یەکێک لەو کەسانەی نێویم لە بیرە سولەیمانی[1] ڕەسووڵ ئاغای مەنگوڕ، ئاغای خڕی ئاغەلان و خاتوون ئەستی بوو.

مەشهوورە دەگێڕنەوە، یەکێک لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە میرزا ڕەحمانی قازی[2] یان

١- بە لەبەرچاو گرتنی ئەو شەجەرەیەی لە لایەن ئاغای عەبدولفەتاحی سالار عەشایرییەوە کێشراوەتەوە، ئەمن وای بۆدەچم ئەو سولەیمان ئاغایە، کوڕی ڕەسووڵ ئاغا کوڕی کاکە سوارکوڕی برایم ئاغا کوڕی باپیرئاغا کوڕی هەمزاغای بەنێوبانگ بێ.

٢- میرزا ڕەحمان و میرزا ئەحمەد ئامۆزا بوون، ئەوی یەکەمیان کوڕی میرزا عەبدوڵلا و ئەوی دووەمیان کوڕی میرزا قاسم بووە، ئەوانەش کوڕانی میرزا مەحموودی قازی ساوجبولاغین. بەرگێک قورئانی مەجید بەبەرواری ١٢٧٩ی کۆچیی مانگی بە خەتی میرزا ڕەحمانی قازی وەکو یادگار ماوەتەوە. میرزا ئەحمەدی قازی بابی میرزا فەتاحی قازییە. نووسەری ئەم دێڕانە کوڕی میرزا خەلیل کوڕی میرزا ڕەسووڵ کوڕی حاجی خەلیل کوڕی میرزا ڕەحمانی قازیم (قادری فەتاحی قازی)

دوایانەدا لەبەر تەنگە نەفەسی و برۆنشیت بەجێ و بان لەماڵێدا کەوتووە و خانەنشین بووە و خەریکی حەسانەوە و موداوایە. میرزا وەهاب لە سەردەمی حکوومەتی قازی محەمەددا ڕەئیسی ئیدارەی باربەری بوو و چەند دەزگا کامیۆنی شەڕی دووەمی دنیا گرەوەی لەبەردەستدا بوو. بۆیە دوای هاتنەوەی هێزی دەوڵەتی بۆ مەهاباد، ماوەیەک زیندانی کرا. نێوبراو بڕی پێنج هەزار تمەنی لە ئیدارەی دارایی مەهاباد بۆ کڕینی کەلوپەلی یەدەکی ماشینەکان وەرگرتبوو و ئەو دراوەی ناردبووە تەورێز بۆ کڕینی کەلوپەلی یەدەک. دوای هاتنەوەی نەیروو ئەو دراوەیان لە بەڕێزیان دەویستەوە. نێوبراو ناچار بوو ئەو بڕە پارەیە بەسوود لە سەلەمخۆران قەرز بکا و بیداتەوە. جابۆیە ماوەیەک قەرزدار و دەستتەنگ بوو. پاشان دراوەکەی ئامادە کرد و دایەوە و ئاسوودە بوو. میرزا وەهاب دوو کوڕی هەیە: محەمەد، عومەر. کاک محەمەد[1] خەریکی کاری کشتوکاڵە و عومەر دەخوێنێ.

کوڕەکەی دیکەی خوداڵێخۆشبوو قازی مونعیم، میرزا قادرە. بەڕێزیان لە دێی وزندەرێ خەریکی کشتوکاڵە و لەو بوارەدا کەسێکی چازان و بە مشوورە. کەم تاکورتێک خوێندەواریی فارسیی هەیە. منداڵە کوڕەکانی بریتین لە: حاجی حەسەن، ئەحمەد، مونعیم. حاجی حەسەن خوێندەواریی فارسی هەیە و لە کاری کشتوکاڵدا یارمەتیی بابی دەدا. ئەحمەد و مونعیم هێشتا منداڵ و چکۆلەن.

١- ئاغای محەمەدی قازی حەوتوویەک دوای پێکدادانی ماشێنی شەخسی خۆی لە ڕێگەی مەهاباد ورمێ، ڕۆژی چوارشەمۆ ١١ / ٣ / ٧٣ ماڵاوایی لە ژیان کرد و لە گۆڕستانی بداغ سولتانی مەهاباد بەخاک ئەسپێردرا. ناوبراو منداڵی نەبوو و بە "کاکە شینە" بەناوبانگ بوو.

# قازی محەمەد[1]

خودالێخۆشبوو میرزا عەلی قازی، دوو کوڕی هەبوو: ١- میرزا محەمەدی هومامی قازی کە دواتر بە قازی محەمەد، نێوبانگی دەرکرد. ٢- ئەبولقاسمی سەدری قازی.

خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، خوێندنی لە مهاباد دەست پێ کرد و ماوەیەکیش لە خانەقای شەرەفکەند لەگەڵ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و میرزا قاسمی مەجیدی خوێندی. ئەدەبیاتی فارسی و سەرف و نەحوی لەلای بابی خۆی قازی عەلی و عالمانی تری ناوچەیی دەخوێند، لە هەمان کاتدا زمانەکانی ڕووسی و ئینگلیزی و فەڕانسەیی لە لای هەرکەس ئەو زمانانەی زانیبا، فێر دەبوو و بۆ فێربوونی زانست و مەعریفەت هەدای نەدەدا و هەمیشە تێ دەکۆشا، لە کەمترین دەرفەت بۆ فێربوون کەلکی وەردەگرت، هەمیشە لە هەرکوێیەک بووبا کتێب، ڕۆژنامە یان گۆواری بەدەستەوە بوو، زۆر جاران کاتێک بەپێیان بەکۆڵان و شەقامدا تێ دەپەڕی، خەریکی موتاڵا و خوێندنەوەی ڕۆژنامە و گۆوار بوو. پیاوێکی شارستانی، بەدین، ئازادیخواز، بەجەرگ، حەقیقەتبین و لە هەمان کاتدا، بەڕوحم و سەروڕوو خۆش بوو. یەکجار زۆریش حەزی لە وەرزش بوو. هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو لە خەو هەڵدەستا، میل بازیی دەکرد، ماوەیەک لە هەوای ئازاددا هەڵدەهات و، دوایە بەرچایی دەکرد، مەلەکردنی لە ئاوی ساردیشدا یەکجار زۆر پێ خۆش بوو، هاوینان لە چۆمی مهابادێ کە بەبەر خانووی بەرێزیاندا تێ دەپەڕی، شوێنێکی تایبەتی و قووڵی پەیدا کردبوو و هەموو ڕۆژێ بۆ ماوەیەک مەلەی تێدا دەکرد، زۆرجار منداڵەکانیشی لەگەڵ خۆی دەبرد و فێری مەلەی دەکردن، ئەو شوێنەی چۆمی ئێستا بە" گۆمی قازی" بەنێوبانگە[2].

---

١- بابم چونکو قەت بیری لەوە نەدەکردەوە نووسراوەکانی چاپ و بڵاو ببنەوە و لە ڕاستیدا ئەوانی بۆ لێ بەجێماوانی خۆی دەنووسی و لە لایەکی تریشەوە کاری نووسین بۆ ئەو زیاتر لایەنی سەرگەرمیی هەبوو، بۆیە پێڕۆیی لە نەزمی ئاسایی و بەڵێندراو و ناسراوی نووسەران نەکردووە و هەرچییەکی لە کاتی نووسین لە زەینیدا بووە، هێناویەتە سەر کاغەز، بە لەبەرچاوگرتنی ئەو خاڵانە، ئەم باسە پاشماوەی باسی سەبارەت بەخوالێخۆشبوو قازی (عەلی)یە کە پێشتر هاتووە.

٢- چۆمی مهابادێ کە لە ڕۆژئاواوە بەرەو ڕۆژهەڵات دەخوشێ، ئێستا هێندێکیان لە شاری (بەشی کۆنی شاری دوور کردووەتەوە) و بەرەو باکووریان بردووە و لە هەر دوو بەری چۆمی دیوار ڕایەڵ کراون و بە تەنیشتیانەوە شەقام لێ دراون. لەبەرئەوەی ئێستا لە بەر دیوارکێشان دەست وێ ڕاگەیشتن بەچۆمی، نالوێ قەراغەکانی بوون بەچەنگەڵی چڕ و وەکو شاکارەکانی نیگارکێشی خەیاڵبزوێن و جوانن. ئەو شوێنەی بابم ئاماژەی پێ دەکا ئێستا باغی عێلییەکی زۆر جوانیان لێ سازکردووە.

گۆم لەزمانی کوردیدا بەشوێنێک لە چۆم دەڵێن کە قووڵ بێ.

خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، پیاوێکی زۆر فەرهەنگدۆست و لایەنگری زانست و مەعریفەت بوو و پێی وابوو میللەت تەنێ لە سایەی زانست و مەعریفەتدا دەمێنێ. بۆیە زۆری پشتیوانی لە فەقێ و تەلەبەی زانستی دینی دەکرد و یارمەتیی ماددی و مەعنەوی پێ دەکردن. نێوبراو لە لای تەلەبەی زانستی دینی ڕێز و خۆشەویستییەکی تایبەتی هەبوو بەڕادەیەکی ئەوتۆ کە گشت فەقێ و تەلەبان ئەویان بە سەرۆک و سەرپەرستیی خۆیان دادەنا.

ڕێکخراوی فەرهەنگ و پەروەردەی نوێباو لە مهاباد بەروبووی تێکۆشانەکانی ئەو و مامی خودالێخۆشبوو سەیدلقوزاتە. لەسەرەتای دامەزراندنی قوتابخانە بەپێی پرێنسیپی نوێباو، بەڕێوەبردن و سەرپەرستیی قوتابخانە نوێباوەکانی مهاباد بەڕەسمی بەئەستۆی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات بوو و پاشان خودالێخۆشبوو قازی محەمەد جێی ئەوی گرتەوە. بەڕێزیان بۆ پەرەپێدانی فەرهەنگی مهاباد زۆری زەحمەت کێشا، دواتر لەبەرئەوەی چاوەڕوانی پێشکەوتنی زیاتری دەکرد، بەرەبەرە تێکەڵاوی سیاسەتی عەشیرەتی و ناوچەیی بوو و دەرفەتێکی ئەوتۆی بۆ پێڕاگەیشتن بەکاروبارەکانی ئیدارەی فەرهەنگ بۆ نەماوە، بۆیە تەریکیی خۆی لە نوێنەرایەتی فەرهەنگی مهاباد دەربڕی، و دوای بەڕێزیان خودالێخۆشبوو میرزا برایمی قازیزادە کوڕی خودالێخۆشبوو میرزا جەلیلی باخچەی کوڕی میرزا ڕەحمانی قازی ئەو بەرپرسیارییەتەی بە ئەستۆوە گرت، بەڕێزیان بۆ ماوەیەکی درێژ بەرپرسی فەرهەنگی مهاباد بوو.

ئەمەش بڵێم لەبەرئەوەی کارکردن لە دەستگای دەوڵەتیدا پێویستی بەیەکپۆشی هەبوو وخودالێخۆشبوو قازی محەمەد ئامادە نەبوو لە جلوبەرگی مەلایەتی و پلەی قەزاوەت دەست هەڵگرێ، بۆیە لە پیشەی دەوڵەتی لە فەرهەنگ خۆی کێشایەوە و بۆ ماوەیەکی کاتی کە جلوبەرگی یەک شێوەی دەبەر دەکرد، دیسان جلوبەرگی ڕوحانییەتی دەبەر کردەوە.

لەبەرئەوەی پلەی قەزاوەتی شەرعی لە مهاباد لە کۆنەوە بەدەست بنەماڵەی قازی بوو، بۆیە ئەوان لە لای لێپرسراوانی دەوڵەت و هەروەها لە لای زۆربەی خەڵک حورمەت و گەورەییەکی یەکجار زۆریان هەبوو. ئەو دووبەندی و شەڕوکێشەیەی لە نێوان عەشیرەتە کوردەکان یان لە نێوان عەشیرەتەکان و دەوڵەتدا دەقەوما، بنەماڵەی قازی بەشێوەیەکی جێی ڕەزایەت و هێمنانە لە ڕێگای کەیخوایەتییەوە جێبەجێیان دەکردن. لەبەر ئەو ڕێز و دەسترۆیشتووییەی کە بنەماڵەی قازی لە لای کاربەدەستانی دەوڵەت هەیانبوو، ئەگەر

خەڵک، لە کاروباری دەوڵەتی، یان نادەوڵەتیدا گیرەو کیشەیەکیان بۆ هاتبایە پێشێ، پەنایان بنەماڵەی قازی بوو. بەتایبەتی خوداڵیخۆشبوو قازی عەلی و برایەکی خودا لێخۆشبوو سەیفولقوزات و خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد و برایەکەی خوداڵیخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی، ئەوانە لە هیچ جۆرە چالاکی و تێکۆشان و خۆبەختکردنێک ئەویش بێ منەت و بێ هیچ جۆرە چاوەڕوانییەک لە ڕاپەڕاندنی کاری خەڵک وکردنەوەی گرێیان کەمتەرخەمییان نەدەکرد و لەو کارەدا ئەوەندە زیدەڕۆیی و پێکێشیان دەکرد جار جار بۆ جێبەجێکردنی کاری کابرایەکی لادێیی لەگەڵ کاربەدەستێکی پایە بەرزی دەوڵەتی تووشی کێشە دەهاتن. زۆربەی ئەو کەسانەی لە ئیدارە دەوڵەتییەکان دامەزرابوون، لە لایەن خوداڵیخۆشبوو سەدری قازی و یان قازی محەمەدەوە دەستەبەر کرابوون. جارێکیان نووسەری ئەم دێڕانە فایلی ژاندارمەیەکی خەڵکی مەراغەم دی کە خوداڵیخۆشبوو سەدری قازی بۆی بووبوو بەزامن. ئەمن زۆرم پێ سەیر بوو و گوتم سەدری قازی ئەو کابرایەی نە دیوە و نە دەیناسێ، چۆن ئامادە بووە زەمانەتی ژاندارمەیەکی خەڵکی مەراغە بکا؟

یەکێک لە ئامادە بووانی مەجلیسەکە گوتی: فڵانکەس ئەوە سەیر نییە، لە جێدا ئاکاری ئەم بنەماڵەیە ئاوایە، خۆشەویستی و دەستگرۆیی ئەوانە هەموو کەس دەگرێتەوە جا چ بیانناسن یان نەیانناسن، ئەو جۆرە دەستەبەربوونە داراییانە هەرهیچ، کەسانی ئەوتۆیان پاراستووە کە تاوانی زۆر قورسیان وەپاڵ دراوە، هەر وەک ژمارەیەک لە سەرانی خێڵی مەنگوڕ کە بەتاوانی ڕاپەڕین دژی دەوڵەت لە سەردەمی مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ لە تەوریز دەستبەسەرو بەند کرابوون بەنێوبژیکاری و زەمانەتی خوداڵیخۆشبوو سەیفولقوزات لە بەندیخانە ئازاد کران، یەکێک لەو کەسانەی نێویم لە بیرە سولەیمانی[1] ڕەسووڵ ئاغای مەنگوڕ، ئاغای خڕی ئاغەلان و خاتوون ئەستی بوو.

مەشهوورە دەگێڕنەوە، یەکێک لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە میرزا ڕەحمانی قازی[2] یان

---

١- بە لەبەرچاو گرتنی ئەو شەجەرەیەی لە لایەن ئاغای عەبدولفەتاحی سالار عەشایرییەوە کێشراوەتەوە، ئەمن وای بۆدەچم ئەو سولەیمان ئاغایە، کوڕی ڕەسووڵ ئاغا کوڕی کاکە سوارکوڕی برایم ئاغا کوڕی باپیرئاغا کوڕی هەمزاغای بەنێوبانگ بێ.

٢- میرزا ڕەحمان و میرزا ئەحمەد ئامۆزا بوون، ئەوی یەکەمیان کوڕی میرزا عەبدوڵڵا و ئەوی دووەمیان کوڕی میرزا قاسم بووە، ئەوانەش کوڕانی میرزا مەحموودی قازی ساوجبولاغین. بەرگێک قورئانی مەجید بەبەرواری ١٢٧٩ی کۆچیی مانگی بە خەتی میرزا ڕەحمانی قازی وەکو یادگار ماوەتەوە. میرزا ئەحمەدی قازی بابی میرزا فەتاحی قازییە. نووسەری ئەم دێڕانە کوڕی میرزا خەلیل کوڕی میرزا ڕەسووڵ کوڕی حاجی خەلیل کوڕی میرزا ڕەحمانی قازیم (قادری فەتاحی قازی)

میرزا ئەحمەدی قازی بووە دەچێتە لای یەکێک لە حاکمەکانی سەردەمی سەرەڕۆیی، دوای دەرچوون لە لای حاکم، کاتێک دەیەوێ لە دەروازەی حکوومەتی وەدەرکەوێ، کەسێک پێشی پێ دەگرێ و دەڵێ برایەکەی قەرزدارە و خاوەن قەرزەکە سکاڵای لێ کردووە و ئێستا لەبەر ئەوە گرتوویانە، تکات لێ دەکەم داوا لە حەزرەتی ئەشرەف (حاکمەکانی سەردەمی سەرەڕۆییان بەنازناوی حەزرەتی ئەجەل و حەزرەتی ئەشرەف و حەزرەتی والا بانگ دەکرد) بکەی، برایەکەم بەربدا و ماوەیەکمان مۆڵەت بداتێ هەتا قەرزەکەی خۆی دەداتەوە. قازی دەستبەجێ دەگەڕێتەوە لای حاکم و داوای کابرای پێ دەڵێ، بەڵام حاکم قوڵ لەسەر قسەکەی ناکێشێ. قازی بەنائومێدی لە لای حاکم دێتە دەرێ، کاتێک دەیەوێ لە دەروازەی حکوومەتی بچێتە دەرێ، کابرایەکی دیکە ئاتەگی دەگرێ و دەڵێ لەبەرئەوەی کوڕەکەم نەیزانیوە و دوای لێدرانی شەیپووری قۆرغی شەوێ لە ماڵێ وەدەرکەوتووە، بێ ئەوەی هیچ خەتایەکی دیکەی کردبێ، گرتوویانە و ئێستا مانگێک دەبێ لە بەندیخانەدایە، تکام ئەوەیە داوا لە حاکم بکە کوڕەکەم بەر دا. قازی بۆ جاری دووەم دەچێتەوە لای حاکم و داوای کابرای دووەمی لەگەڵ دەهێنێتە گۆڕێ، بەڵام حاکم ئەوجاریش قوڵ لە سەر تکاکەی ناکێشێ. قازی بەنائومێدی و لارەملی دێتە دەرێ. کاتێک دێتەدەرێ کەسێکی دی پێشی پێ دەگرێ و دەڵێ برایەکەم پینەچییەکی بێ سەرمایە و نەدارە و، دابینکردنی ژیانی دە سەر خێزانی بە ئەستۆوەیە، ئێستا داوای باجێکی زۆری لێ دەکەن، تکا لە حەزرەتی ئەشرەف بکە بەحاڵ و ئەحواڵی ڕابگا، بۆی دەردەکەوێ ئەو پیاوە نانی ژن و منداڵەکانیشی پێ پەیدا نابێ، بیکاتە سەدەقە سەری خۆی ئێستا ئەو نزیک دوومانگە گیراوە یا بەری بدەن و یان لانی کەم ئەوەندە دراوەی لێ بستێنن، پێی بدرێ و لە گوێن کارو کاسبییەکەی بێ. قازی بۆ جاری سێیەم دەچێتەوە لای حاکم و تکای کەسی سێیەمیشی پێ دەڵێ: ئەوجار حاکم تووڕە دەبێ و دەڵێ: فلانکەس ئەتۆ دووجار تکات لێ کردم، تکام نەگرتی، بۆیە پێم سەیرە دیسان هاتوویەوە و بۆ جاری سێیەم بەربینگت پێ گرتووم. قازی لە وەڵامیدا دەڵێ: من بەپێی ویژدان و ڕەوشت و شەرع لەسەرمە داوخوازی موسڵمانان بەگوێی بەڕێوەبەرانی کاروباران بگەیێنم، ئەو کارە لە ڕێی خودا و نێردراوی خودادا دەکەم، جا قوڵی لە سەر بکێشرێ یان نەکێشرێ بۆیە لە دووپاتەکردنەوەی هیچ شەرم ناکەم. حاکم کە گوێی لەو وەڵامە دەبێ دەڵێ: وا دیارە، ئەتۆ مرۆیەکی خێرخوازی، بۆیە تکات دەگرم. حاکم فەڕاشباشی بانگ دەکا و فەرمان دەدا لەبەرئەوەی قازی شەفاعەتی بۆ کردوون، دەستبەجێ گیراوەکان بەر دەن و بەفەڕاشباشی دەڵێ: لەمەوبەدواوە هەر سات و کاتێک

قازی ویستی ئەمن ببینێ، چ گرفت نییە ڕێگای بدەن با بێتە لام.

پێویستە ئاماژە بەمەش بکەم: بنەماڵەی قازی هاوکات خاوەنی قەڵەم و شیربوون و لەو دوایانەدا نزیکەی سی و پێنج تا چل گوندیان هەبووە، بەڵام لەبەرئەوەی لایەنی رووحانیی ئەوان زیاتر و دێیەکانیان پەراگەندە و لەیەکتر دووربوون، لە کاتی پێویست و لە هێرشی نەیاراندا بەکردەوە نەیانتوانیوە پشتیوانییەکی کاریگەر لە یەکدیی بکەن، بەو پێیە لەچاو خێڵ و عەشیرەتەکان بەتایبەتی دێبۆکرییەکان زۆر لاوازتر و کەم دەستەڵاتتر بوون و ئەگەر هەرایەک کەوتبێتەوە یان لە کاتی بێدەستەڵاتیی دەوڵەتی نێوەندیدا، وەزعیان دەمەترسی کەوتووە و، لەو سەروبەندانەدا سەدەمەی زۆریان پێ گەیشتووە، هەروەک چۆن لە سەرەتای شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا کە هێزی رووس و عوسمانی هێرشیان کردە سەر خاکی ئێران و دەوڵەتی نێوەندی بۆ ماوەیەکی کاتی دەستەڵاتی خۆی لە کوردستان لە دەست دا، زۆربەی گوندەکانیان لەوانە گردیاقۆب، کۆنە دێ، باخچە، بەدەست دێبۆکرییەکان و گۆل و ئاڵبولاغ لە لایەن مامەشەکانی سێمانی مامەش[1] دەستیان بەسەرداگیرابوو و داگیر کرابوون. هەروەها لە جەنگەی شەڕی هەوەڵی دنیاگرەوەدا، جگە لەوەی خوداڵێخۆشبوو قازی فەتاح بەدەستی سپای رووسیەی قەیسەری کوژرا و ماڵەکەی ئاوری تێ بەردرا، کورەکانی و براکەی (قازی لەتیف) و برازاکەی (قازی مونعیم کوڕی قازی وەهاب) بۆ ماوەی درێژ یەخسیری رووسان بوون کە پێشتر بەوردەریشاڵەوە نووسیومە. لە هەرای (سمایل ئاغای شکاک)دا، خوداڵێخۆشبوو قازی لەتیف لە لایەن لەشکری سمایل ئاغاوە شەهید کرا و شکاکەکان لە خوداڵێخۆشبوو قازی (عەلی)یان دابوو، بەشێوەیەکی ئاوا لە بەر ئەو زەبرانەی وەسەری کەوتبوو تارادەیەک حەواسی تێکچوو بوو. شکاکەکان بڕی پەنجاهەزار تمەنیان جەزا بۆ قەرەبووکردنەوەی خوێنبایی چەند نەفەر لە لەشکری سمایل ئاغا کە لە لایەن ئاغای کەریمی یەمینولقوزات بە تۆڵەی کوژرانی بابی کوژرابوون، بەتوندی لە خوداڵێخۆشبوو قازی عەلی و قازی مونعیم داوا دەکرد، تاکو ئەوەی بەدەستێوەردان و شەفاعەتی ژمارەیەک لە پیاوماقوولانی ناوچە، سمایل ئاغا وازی لەو داوایە هێنا و بەئەستاندنی دوو سەر ئەسپی قیمەتی لە قازی عەسکەر و سەیفولقوزات (برایانی قازی عەلی) پێمل بوو.

دەی ئەگەرچی لەباسەکە دوورکەوتمەوە، بەڵام نووسینی ئەم وردە ریشاڵانە بۆ ئاگاداریی خوێنەرەوانی ئەم بیرەوەرییانە بەتەواوی پێویست بوون. ئێستا دەگەڕێینەوە سەر بابەتی

١– پیاوی هەمزەی سێمانم – گێلمە گێلمەی نازانم

سەرەکی کە بریتییە لە کورتەیەک لە شەرحی حاڵی قازی محەمەد. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، وەک پێشتر باس کرا، پیاوێکی ڕووناکبیر و فەرهەنگپەروەر بوو و لەگەڵ زمانگەلی ئینگلیزی، فەڕانسەیی، ڕووسی، عەرەبی ئاشنایی هەبوو و مرخێکی زۆری هەبوو بۆ خوێندنەوەی کتێب و چاپەمەنی، ئەو لاوەییانەی دانیشتووی مهاباد بوون، لەبەر حورمەت و کەسایەتیی قازی، زۆر دەچوونە خزمەتی و قازی محەمەدیش بۆ فێربوونی زمان، دیداری ئەوانی بەغەنیمەت دەزانی.

بنەماڵەی قازی لەبەر هەبوونی پلەی ڕووحانی لە کوردستانی ئێران و عێراق و ترکییەدا ناسراو بوون، ئەو چاپەمەنییە کوردییانەی لە لایەن کوردانی ئازادیخوازی عێراق و ترکییەوە بڵاو دەکرانەوە، وەکو "زاری کرمانجی" کە خوداڵێخۆشبوو سەید حوسێن حوزنی موکریانی بەڕێوەی دەبرد و لە ڕەواندز چاپ دەکرا و " گەلاوێژ" و هتد. بە نهێنی دەگەیشتنە دەست قازی محەمەد. ئەو جگە لەو پشتیوانییە ماڵییەی کە دەیدا بەچاپەمەنیی ئازادیخوازی کوردی، بەشەخسە هیچ جۆرە چالاکییەکی سیاسیی دیکەی لەو بوارانەدا نەبوو بەڵکو بۆخۆی و برایەکەی خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی و مامی ئەبولحەسەنی سەیفی قازی ڕۆژ بەڕۆژ تێ دەکۆشان خۆیان لە دەوڵەتی نێوەندی نزیکتر کەنەوە، حەقیشیان بوو، چونکو بە هەبوونی ئەو هەمووە دوژمنە بەمەترسییە، ئەگەر شۆڕشێک قەومابا و دەستەڵاتی دەوڵەت کەم بووباوە، لێبڕاوانە تێدا دەچوون.

هەرچۆنێک بێ، قازی محەمەد دوای کۆچی دواییی بابی لە لایەن ڕەزاشاوە بەڕەسمی فەرمانی قەزاوەتی مهابادی درایە و لە جێی بابی خەریکی کاری قەزاوەت بوو. ئەگەرچی لە سەردەمی قەزاوەتی ئەودا کێشە شەرعییەکان بەتەواوی وەکو دۆزی حقووقی لە عەدلیەدا یەکلا دەکرانەوە، لەگەڵ ئەوەش لە مەحکەمەی بەڕێزیاندا کە بێ پسانەوە لە عالمان و پیاوماقووڵانی ناوچەکە جمەی دەهات، ئەو مەسەلانەی کێشەیان لە سەر بوو، لە هەر بوارێکدا، بەڕێگای کەیخوایەتییەوە جێبەجێ دەکران. هەروەها کاروباری ئاوەدانکردنەوە، فەرهەنگی، لەشساخی یان سیاسیی ناوچەکە، لە ژێر چاودێری و پەسندی بەڕێزیان دەکران. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و برایەکەی سەدری قازی لەگەڵ ئەوەشدا خەرج و مخاریجێکی زۆریان لەسەر بوو بۆ میوانداریکردن لە خەڵک، بەپێچەوانەی شێوازی کۆن کە باربوو و دیاری لە خەڵک قبووڵ دەکرا، خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد ئەو دابوشوێنەی کوێر کردەوە و بەهیچ جۆر دیاری و بەسەرکردنەوەی ئەوتۆی تەنانەت لە نزیکترین دۆستەکانیشی وەرنەدەگرت. بیستم ڕۆژێک یەکێک لە ئاغایانی قوم قەڵا پێستەیەک پەنیری

وەک دیاری بۆ دەنێرێ و قازی محەمەد لە ماڵ نابێ و نۆکەرەکەی ئەو دیارییە وەردەگرێ، کاتێک خودالێخۆشبوو لەوە ئاگادار دەبێ، دوای ئەوەی زۆر لە نۆکەرەکەی تووڕە دەبێ فەرمانی پێ دەدا پێستە پەنیرەکە کە بەئاسایی سی تا چل کیلۆ دەبێ بەکۆڵی هەڵگرێ و دیسان بیباتەوە بۆ قوم قەڵا و بیداتەوە.

لەبەر ئەو ڕێز و حورمەتەی خودالێخۆشبوو قازی لە ناوچەدا هەیبوو، گیروگرفت و دووبەندیی گەورە لە لایەن فەرماندەری نیزامی و فەرمانداریيەکانەوە، بۆ جێبەجێکردن، بەخودالێخۆشبوو قازی محەمەد دەسپێردران و بەڕێزیشیان لەگەڵ برایەکەی خودالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی، ئەو کێشە و ناخۆشییانەیان بەشێوەیەکی هەرە شیاو کە هەر دوو لایەن پێی ڕازی بان لە ڕێگای کەیخودایەتییەوە جێبەجێ دەکرد و بەو پێیە بنەماڵەی قازی لەوپەڕی گەورەیی و سەربەرزیدابوون تا ئەوەی شەڕی دنیاگرەوەی دووەم دەستی پێ کرد و دوای ماوەیەک ئاوری شەڕی ماڵوێرانکەر پڕیشکی گەیشتە نیشتمانی خۆشەویستی ئێمە ئێرانیش. باوەکو دەوڵەتی ئێران بەڕەسمی بێلایەن بوو و لە شەڕەکەدا بەشدار نەبوو، بەڵام هاوپەیمانان واتە ئینگلیس و ڕووس و ئەمریکا گوێیان بەبێلایەنی ئێران نەدا و، بەبیانووی ئەوەی سیخوڕانی ئاڵمانی لەخاکی ئێراندا کاردەکەن و مەترسییان بۆ ڕووسیە پێک هێناوە، ناچارن بێنە نێو خاکی ئێرانەوە. ئەوە بوو لەڕۆژی سێیەمی مانگی خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی، هێزەکانی ڕووسیە لە لای باکورەوە و ئینگلیزییەکان لە باشوورەوە دەستدرێژییان کردە سەر خاکی وڵاتی خۆشەویستی ئێمە و لەبەرئەوەی دەوڵەتی ئێران لە ئاست ئەو دوو دەوڵەتە بەهێزە گەورەیەدا، لاواز بوو و توانایی پێشگیری لە دەستدرێژی و پەلاماری ئەوانی نەبوو، دوای پێکدادانێکی کەم، هاتنە ناو خاکی ئێمەوە. هێزی دەریایی ئێران بەدەستی هێزی دەریایی ئینگلیز لە کەنداوی فارس بەتەواوی لەنێوبرا، هەروەها لەلایەن هێزی ڕووسەوە زەبری یەکجار زۆر وە هێزی زەوینیی ئێمە کەوت و ژمارەیەک لە ئەفسەران و تاکوتەرای ئێرانی لە پێناو پارێزگاری لە یەکپارچەیی و سەربەخۆیی وڵاتدا تا دوایین نەفەس گیانبازییان کرد و شەربەتی شەهادەتیان فڕ کرد.

دوو یان سێ ڕۆژ لە دەستدرێژی و وەسەرپەڕینی هاوپەیمانان بۆ سەر وڵاتی ئێمە ئێران تێ دەپەڕی، خەڵکی مهاباد لەوپەڕی نیگەرانی و پەشێویدا بوون و هەر دەم چاوەڕێی ڕووداو و دەنگوباسێکی نائاسایی بوون، حەقیشیان بوو، چونکو وڵاتی ئێمە لە ئاشتی و ئارامیدا دەژیا و، لەپڕ لە لایەن دوو دەوڵەتی بەهێزەوە کەوتبووە بەر پەلامار و دەستدرێژی

و بەروبوو و ئاکامی ئەو رووداوە هەتابڵێی گرینگ بوو، چونکو پێوەندیی پەیدا دەکردەوە بە سەربەخۆیی و یەکپارچەییی وڵات و گیان و ماڵی خەڵک.

نووسەریش وەک خەڵکی دی لەبەرئەوەی ئەوپەڕی نیگەران و دڵپەشێو بووم، بڕیارمدا لە پێشدا منداڵەکان بگەیێنمە شوێنێکی هێدی و بۆخۆم بەتاقی تەنها لە شاردا بمێنمەوە کە لە مەترسیدا بوو. ئەوە بوو بەمنداڵەکانم گوت، هێواش هێواش، بەپێیان بەرەو گوندی قزڵجەی سەرێ (موڵکی خۆمان) کە لە نزیکەی دوو فەرسەخ و نیویی شارەوە هەڵکەوتووە، بڕۆن. لەباڵ خۆمدا بیرم دەکردەوە ئەوێ ئاوەدانییەکی پچووک و کوێستانییە و ڕێگای شۆستەی بۆناچێ و جارێ مەترسییەکی ئاوای لە سەر نییە و ئەگەر لەوێ مەترسییەک بێتە گۆڕێ، دەکرێ لەوێ لە چیاکان و دۆڵەکان و ئەشکەوتە خۆڕسکییەکانی لەم وەرزی هاوینەدا (بەراییەکانی مانگی خەرمانانی ١٣٢٠) کە هەوا خۆشە، ماوەیەک بحاوێنەوە و خۆیان وەشێرن تا بارودۆخەکە ئارام و ڕوون دەبێتەوە و بۆ خۆشم لە شاری لە ئیدارەی دوخانیات خەریکی کاری خۆم دەبم و بێتو مەترسییەک بێتە پێشێ خۆم دەگەیێنمە قزڵجە.

ئەوە بوو ڕاسپاردەی پێویستم دا بەدایکی منداڵان، بۆخۆم سەعات ٨ی بەیانی لە ماڵێ هاتمە دەرێ. هەوای ئەوی ڕۆژێ زۆر ئارام و خـۆش و بلاوێن بوو و گـەرمـای هاوینێ هەندێک فێنکی کردبوو. هەر کە هاتمە نێو شەقامی شاپوور، دیتم خەڵک بەپەشۆکاوی و ترسەوە، لەملاولای شەقام، هەندێکیان دانیشتوون و هەندێک بەپێوەن و سەبارەت بەبارودۆخی ڕۆژ و چارەنووس و داهاتووی خۆیان خەریکی قسەکردن و ڕاوێژن.

دوو یان، سێ ماشینی سواریی لووکس کە دیاربوو تازە گەیشتبوونێ، ڕووبەڕووی کاروانسەرای سەید عەلی حوسێنی، کە ئەودەمی تێلێگرافخانە بوو، ڕاگیرابوون. پرسیارم کرد ئەو ماشێنانە لە کوێوە هاتوون و ئی کێنە؟ گوتیان ئەمانە ئی فەرماندەریی لەشکری ورمێ، سەرلەشکر مەتبووعین کە لە (ورمێ)وە هەڵاتووە و لەشکری ئەوێش بڵاوەی لێ کردووە و لە بەریەک هەڵوەشاوە و بۆخۆشی بۆ وتووێژ لەگەڵ نێوەند، هاتووەتە ئێرە. کاتێک ئەو خەبەرە ناخۆشەم بیست، زۆری پێ تێک چووم و ئەوەندەی دیکەش زیاتر ترس و پەژارە سەبارەت ئەو بارودۆخەی تێیدابووین لە دڵم گەڕا. لەوکاتەدا دوو ئەفسەری ئێرانی، لە نزیکی ماشێنەکان بەدووربین تەماشای ئاسمانیان دەکرد و دیار بوو چاوەڕوانی پەلاماری هەوایی بوون. بێ ئەوەی زۆر لە سەر شەقام بەند بم، بەفیکری ئاڵۆز و پەرێشانەوە چوومە ئیدارە. ژمارەیەک لە کارمەندەکان هاتبوون بۆ ئیدارە بەڵام هیچ کەس دەستی بۆ کار نەدەچوو و هەموو تێماو و سەرگەردان دەفکرەوە چووبوون. چوومە ژووری کارەکەم، بەڵام

تاقـەتم نەهێنا لەوێ بمێنمـەوە و، چوومـە لای هێندێک لـە کـارمـەندەکـان کـە لە سـەربانی باستیانی[1] ئیدارەی دوخانیات ڕاوەستابوون.

ئەو کەسانەی سـەربانی باستیانی دوخانیاتی مهابادیان دیتووە، دەزانن شوێنی نێوبراو تەقـریبـەن لـە تەواوی جـێـی دیکەی شـاری بـەرزترە و هـەمـوو دەوروبـەری شـاری لەوێوە دەبینـدرێ و لەبەرئەوەی چۆم و باخـەکـانی شـار، لە لای باکـوری باسـتـیـان هـەڵکەوتوون، دیمەنی ئەوێ زۆر تایبـەتی و شیاوی تەماشاکردنە. تازە گەیشتبوومە سـەربانی باستیان، دیتم ئۆتۆبووسـێک لە ڕێگای (ورمێ)وە بەخـێـرایی بـەرەو مـهـاباد دەئاژوێ، هـەر کـە ئەو ئۆتۆبووسـە گەیشـتـە قەراغ چۆمـی، لە جیاتی ئەوەی بچێتـە نێو شـاری، لەتەنیشت چۆمی ڕووبەڕووی ماڵی ئاغای کـەریمی یەمینولقوزات چوو دە مێشـەڵانەوە و خۆی شاردەوە، بەڵام دووسێ کەس لەو ئۆتۆبووسە دابەزین و هاتنە نێو شاری و چونکو وێ دەچوو سەرنشینانی ئەو ئۆتۆبووسـە ئاگاداری و خـەبەری تازەیان پێ بێ، بۆیە یەکێک لە کارمەندەکانم ناردە لای ئەو ئۆتۆبووسـە. کاتێک ئەو کـەسـە گەڕاوە، دەرکـەوت ئوتوبووسـەکە لە (ورمێ)وە هـاتووە و هێزی شوورەوی هاتووەتە نێو (ورمێ)وە و ئەوێی داگیـر کردووە، یەکێک لە ڕێبوارەکانیش ئەفسەرێک بوو – بەتەقەی فڕۆکەکانی شوورەوی دەستی بریندار بووبوو. یەک لە فڕۆکەکان مـاوەیـەک بەسـەر ئۆتۆبووسی نێـوبراودا هـەڵـفـڕیبـوو و ڕاوەدووی نابوو و دوایـە لێی دوور کەوتبـووەوە. ئەو خـەبەرە و بارودۆخـەکە نیشـانی دەدا مـەترسـیی پەلاماردانی مـهـابادیش نزیک بووەتەوە. چوومـەوە ژوورەکـەم، چەند دەقـیـقـەی پێ نـەچوو، هـاڕەی فـڕۆکـەم بیـست. دەستبەجێ لە ژوورەکەم دەرپەڕیم و دیسـان چوومـەوە سەربانـی باستـیـان، تەمـاشام کرد، سێ فـڕۆکـەی سـپی، زۆر نـەوی، بەسـەر باخـەکـانی بـاکـوری ڕۆژهـەڵات و چۆمـیـدا ڕاستەوڕاست بەرەو ئاسمانی شەقامی شاپوور لە فڕیندان.

لەبەرئەوەی یەکجـار زۆر نەوی و لە نزیک یـەک دەفڕین، پێم وابوو فـڕۆکـەی خـۆمـانەن، هێندێک هیـوا پەیدابووەوە، بەڵام ئەو فـڕۆکـانە هـەر کـە گـەیشـتنە نزیک خـانووبەرەی فـەرمـانداری (شـارداریی ئێـسـتـا)، دەسـتـیـان کـرد بەبۆمب بەردانەوە، نزیکەی ١٥ تا ٢٠ بۆمبیـان بەدرێژاییی ئەو شـەقـامـە و بەسـەر سـەربازخـانە، کـە کـەوتووەتە شـانی باشـووری ڕۆژئاوای شار، دادا. نزیکەی ٢٠ کەس کوژران و هێندێک جێ تێکتەپین.

بەدەنگی هاڕەی فڕۆکەکان و بۆمـباران، زەوی هـەژا و تەپ و تۆزێکـی چڕ بەرز بووەوە و

---

١– باستیان (باستیۆن) بینایەکی بەرز کە لە قەڵادا دروستی دەکەن. قەڵایەک کە تێیدا چەک و ئامرازی شەڕی تێدا پاشەکەوت دەکەن. فەرهەنگی موعین.

پێشی ڕۆژی گرت و بۆنی توندی ماددەی تەقەمەنی هەوای ژاراوی کرد. خەڵک بە ژن و پیاو و بچووک و گەورە، سەرگەردان و پەشۆکاو، سەروپێ خاوس، لە ماڵەکانیان دەرکەوتن بەرەو سەحرا و باخ و چیاکانی دەوروبەری شاری تێیان قووچاند. ئەمنیش لەبەرئەوەی منداڵەکانم بەڕێ کردبوو بۆ دەرەوەی شاری و بۆخۆشم ساخ بووم، تارادەیەک فیکرم ئاسوودە بوو و بەمەبەستی چوونەدەر لە شار لە ئیدارە دەرکەوتم، لە کۆڵانێ تاقولۆق خەڵک دەبیندران کە زۆر بەپەلە لە شاری دەردەکەوتن و هەڵدەهاتن. لە کۆڵانان وردە شووشەی پەنجەرەی شکاوی ماڵان لە بەرگوشاری بۆمبارانەکە هەڵڕژابوو. کاتێک گەیشتمەوە ماڵێ، تەماشام کرد منداڵەکان بەپێچەوانەی پێوابوونی من هێشتا لە شاری نەچوونەتە دەرێ و لەشارن. دەستبەجێ دەستی منداڵەکانم گرت و لەگەڵ خۆم بردمن و لە شار وەدەر کەوتین و ماڵەکەمان بەهەموو کەلوپەلەکانییەوە بەجێ هێشت.[1] هەر کە گەیشتینە ئاشەکانی قەراغ شاری، کە بە سێ ئاشان بەناویانگن، تەماشام کرد خەڵکی شاری وەک مێروو و کوللە بەوەزعێکی پەرێشان و پەشۆکاو و ڕەنگ بزرکاو بەرێگای شاخاندا بەرەو لادێکانی دەوروبەر دەچن و لە شاری هەڵدێن. لەو کاتەدا دیسان دەنگی فڕۆکەکان لە ئاسمان بیسترا. کاتێک تەماشای ئاسمانم کرد، دیتم ئەوە هەر هەمان سێ فڕۆکەکەن کە ڕاستەو ڕاست بەئاسماندا بەرەو خەڵکەکە دێن. ژمارەیەک لە هەڵاتووەکان پەنایان بردە بەر ئاشێک کە لەوێوە نزیک بوو. ئەمن دەنگم دان و کوتم کۆبوونەوە لە شوێنێکدا باشترین نیشانەیە بۆ هێرشی هەوایی، باشتر وایە بڵاو ببنەوە و لە سەر زەوی دوور لە یەکدی ڕاکشێن و ئاوا مەترسی تەقە لێکران و بۆمب کەمتر دەبێتەوە و بۆخۆشم لە نێو خێزی چۆمی ویشکهەڵاتووی " پەرغوو" لێی ڕاکشام. هێندەی پێ نەچوو فڕۆکەکان گەیشتنێ، لە کاتێکدا چاوەڕێمان دەکرد، بۆمبمان پێدادەن و وەبەر ئاوری موسەلسەلمان دەن، بەهارەی هەورەتریشقە ئاماڵی خۆیان، بەسەر سەرماندا تێ پەڕین. بەخۆشییەوە نە تەقەیان کرد و نە بۆمبیان بەرداوە و، دوایە گەڕانەوە و بەرەو سەربازخانە چوون و ئەوێیان بۆ جاری

---

١– هەڵبەتە نەنکم لە لایەن دایکەوە (قادری فەتاحیی قازی) خوالێخۆشبوو سەیزادەی بەڕێز " بوزورگ خانم" نەوەی سەید قادری گەورە کە ئەو دەمی بینایی خۆی لە دەست دابوو و خوالێخۆشبوو ماه بەگم خانم (کچی خوالێخۆشبوو میرزا محەمەد عەلی گۆلێ، کوڕی حاجی عەبدوڕەحیم کوڕی میرزا عەبدوڵای قازی) عەیالی خوالێخۆشبوو خاڵم مەلا محەمەد حەسەن کوڕی خوالێخۆشبوو مەلا جەلالەدینی موعتەمەدولعولەما لە ماڵێ مابووەوە. تەنیا منداڵی ماه بەگم خانم و خوالێخۆشبوو مەلا محەمەد حەسەن، ئاغای عەبدوڵای قازیزادەیە، مامۆستای خانەنشینی ئیدارەی فێرکردن و بارهێنان (پەروەردە) کە لە مهاباد دادەنیشێ.

دووەم بۆمباران کرد. دوای دوورکەوتنەوەی فڕۆکەکان ئەمن و خاووخێزانم لەگەڵ خەڵک درێژەمان بەڕێگای خۆمان دا.

لە نزیک پردی ناسراو بەپردی حاجی سمایلی(١)، دیتم برایەکەم، سەروان حەسەنی فەتاحی قازی (سەرهەنگی (کۆلۆنێل) خانەنشینی ئێستا)(٢) بەجلوبەرگی ئەفسەرییەوە لەگەڵ دوو سەرباز کە تفەنگە چەکەی پێنج تیری ڕووسییان پێ بوو و نۆکەرێکمان بەنێوی عەبدوڵا سەرخشت لە قزڵجەوە بەسواری بەرەو مهاباد ڕووبەڕووی ئێمە دێن. هەرکە گەیشتینە یەکدی بەڕێزیان دەنگوباسی لێ پرسیم، ئەمنیش ئەوەی دەمزانی و ڕووی دابوو، بۆم گێڕاوە و لێم پرسی هۆی هاتنی بۆ شاری لەو هەلومەرجە ئاڵۆز و شێواوەدا چییە؟. بەڕێزیان گوتی دەوڵەت ئەفسەرانی بۆ ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆ پەروەردە کردووە، ئێستا کە دوژمن دەستدرێژی کردووەتە سەر خاکی ئێمە و وەسەری پەڕیوە، ئەرکی نەتەوەیی و ویژدانیی من وادەخوازێ شانبەشانی ئەفسەران و نەفەرەکانی ئەرتەش دژی دوژمنی پەلاماردەر بچینە مەیدانی شەڕ و ئێستا دەچم بۆ ئەوەی خۆم بەفەرماندەری هەنگی مهاباد بناسێنم و هەر ڕاسپاردەیەکم پێ بسپێرێ، بەو پەڕی فیداکارییەوە ڕای پەڕێنم. لە وڵامدا پێم گوت نە هەنگ و نە ئەفسەرەکانی هەنگ لە هیچ کوێ دیار نین، ئەو سێ فڕۆکەیەی دوژمن کە ئێستا لە دوورەوە دەنگیان دێ، لە سەری بەیانییەوە تائێستا دووجار شار و سەربازخانەیان بۆمباران کردووە و داویانەتە بەر موسەلسەل، بەڵام مخابن لە لایەن هەنگی مهابادەوە کەمترین کاردانەوەش نەبووە و تەنانەت بۆ نموونە گوللەیەکیش چییە نەیانتەقاندووە، بۆیە ئەتۆ لە خۆڕا خۆت دەمەترسی داوێی و وەک دەردەکەوێ هەنگی مهاباد تەما یان فەرمانی دەستکردنەوە و بەرگریی نییە، باشتر وایە بگەڕێیەوە قزڵجە و لەوێ چاوەڕێی بارودۆخ بی و دوایە هەرچۆنێک بەمەسڵەحەت بێ، وا بکەی. بەڕێزیان بەقسەکانی من پێمل نەبوو و، بەنۆکەرەکەی گوت لەگەڵ ئێمە بگەڕێتەوە قزڵجە و بۆ خۆی و دوو سەربازە پەڕپووتەکە کە هەرکامیان چەند فیشەک و کەچە تفەنگێکی پێنج تیری ڕووسییان پێ بوو، بەرەو مهاباد درێژەیان بەڕێگایەکەی خۆیان دا.

سەبارەت بەچەکی ئەو سەربازانە دەبێ بڵێم، لەبەرئەوەی ئەوانە لە ڕاسپاردەی غەیری

---

١- پردی حاجی سمایلی بۆ پەڕینەوە لە ئاوی چۆمی بەرغوو لە وەرزی بەهاریدا، لە چرپی و تەختە ساز کرابوو، تا ڕادەیەک پێداویستیی پێک دەهێنا.

٢- خوالێخۆشبوو سەرهەنگ حەسەنی فەتاحی قازی، ڕۆژی جومعە شانزدەهەمی مانگی ڕەزبەری ١٣٦١ لە تاران ماڵاوایی لە ژیان کردووە و لە گۆڕستانی بەهەشتی زەهرا بە خاک ئەسپێردراوە.

شەڕ (کرێنی ئەسپ)دا بوون و لەو کاتانەدا بەئاسایی تفەنگی کۆن و دەکارکراو دەدرێ بەتاکوتەرایان، بۆیە چەکەکانی وان ئەوجۆرەی کە باس کرا، پێنج تیری ڕووسی بوون کە کۆن و کەچەن، دەنا ئەو سەردەمی ئەرتەشی ئێران باشترین چەکی سازکراوی چێکوسلوڤاکی بەنێوی " برنوو" ی لەبەر دەستدا بوو. لە کاتی هاتنی سەربازانی شوورەوی بۆ مهاباد، ئەو هەموو تفەنگ و موسەلسەلە باشە برنوویانە، بێ ئەوەی دەستیان لێ درابێ، دە سندووقاندا، کەبەو پەڕی وردییەوە دەپارێزران و ئاگاداریان لێ دەکرا، کەوتنە دەست سەربازانی شوورەوییەوە. ئەمن لە چوونی براکەم بۆ مهاباد، لە کاتێکدا کە هێشتا فرۆکەکانی دوژمن بەسەر دەوروبەری شاریدا دەفرین و دەسووڕانەوە، یەکجار زۆر دڵپەشێو بووم و بەپێی ڕوحم و عاتیفەی برایەتی، بەدوای ئەواندا، بەپێیان، بەرەو مهاباد گەڕامەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئەوان سوار بوون و ئەمن پیادە و زووتر لە من وەڕێ کەوتبوون، نەمگرتنەوە. وەک پێشووتریش گوتم، دەستە دەستە ژن و پیاو سەرگەردان و پەشۆکاو، بەپێیان و ڕەنگ بزڕکاو، تۆز و خۆڵاوی ڕێگای سەحرا و بیابانیان وەبەر گرتبوو و هەڵدەهاتن. لە ڕێگایە تووشی چەند کەس دۆست و ناسیاو و لەوانە جەنابی ئاغای مەلا عەبدوڵای مودەڕیسی[1]، وانەبێژ و پێشنوێژی مزگەوتی ڕۆستەم بەگ بووم. بەڕێزیان بەپێیان وەک خەڵکەکەی دیکە بەڕێوە بوو، ئەو بەدابی فەقێیان چەند بەرگ کتێبی لە پڕێسکەیەکەوە پێچابوو و قەراغەکانی گرێ دابوو و دارێکی بەنێو گرێکاندا ڕایەڵ کردبوو و لەسەر شانی دانابوو. دوای سڵاو و چاکوخۆشی، لێی پرسیم بۆ کوێ دەچی؟ عەرزم کرد دەچمە شاری. گوتی: بۆ نازانی فرۆکە ڕووسییەکان شاریان بۆمباران کرد و خەڵکی شاری هەموویان هەڵاتوون و شار وێران بووە و کەسی تێدا نەماوە؟ لەوڵامدا گوتم: بەڵێ دەزانم، بۆ خۆم لە کاتی هێرشی فرۆکەکاندا لە شاری بووم، دوایە لە شاری هاتمە دەرێ، بەڵام لەبەرئەوەی برایەکەم ،سەروان حەسەنی فەتاحی قازی، بەقسەی منی نەکرد و چوو بۆ شاری، ئەمنیش نەمەویست لێی جیابم، بۆیە دیسان دەگەڕێمەوە شاری تا بزانم ئاخری کارەکە دەگاتە کوێ؟ دوایە ماڵاواییم لە بەڕێزیان کرد و درێژەم بەڕێی خۆم دا، بەبێ هیچ پێشهاتێک چوومە نێو شاری.

ئەو دەمی لە حەساری خوداڵێخۆشبوو سەیدزادە بوزورگ خانم، دایکی خێزانمدا کە لە

---

١- جەنابی مەلا عەبدوڵای مودەڕیسی ڕۆژی دووشەمۆ نۆزدەی مانگی سەرماوەزی ١٣٦٣ی هەتاوی بەرانبەری ١٦ی ڕەبیعونەوەلی ١٤٠٥ی مانگی لە تەمەنی ٩٨ ساڵیدا ماڵاوایی لە ژیان کردووە. سەرچاوە: کتێبی کاک سەید محەمەدی سەمەدی، بەناوی " نگاهی به تاریخ مهاباد" لاپەڕەی ٨٠

قەراغ شاری، لە نزیک گۆڕستانی مەلا جامی بوو، دەژیام. کاتێک گەیشتمەوە ماڵێ، خوداليێخۆشبوو سەیدزادە بوزورگ خانم کە پیربوو و چاوی نەیدەدی، وەک ئەوەی هیچ نەقەومابێ لەگەڵ بووکەکەی بەگم خان، خوشکی ئاغای میرزا قاسمی قادری قازی، لەو پەڕی لەسەرخۆییدا دانیشتبوو و سەماوەری کە قوڵت قوڵت دەکوڵی لە پێشە خۆی دانابوو و بەو پەڕی ئارامی و لەسەرەخۆیی خەریکی چای خواردنەوە بوو. کاتێک چوومە ژوورێ و سڵاوم کرد هاتنەوەی منیان زۆر پێ سەیر بوو و دڵپەشێویی خۆیان دەربڕی، دوای ئەوەی هۆی گەڕانەوەی خۆمم بۆ باس کردن، فیکریان حەساوە و ئەوەندەی بڵێی یەک و دوو ئیستیکانێک چای تازە دێمیان بەقەندەوە لە پێش دانام، کە دوای ئەو هەموو ماندوویی و بەپێ ڕۆیشتنە لە گەرمای هاوین و تۆونیایەتیدا، تام و چێژێکی تایبەتی هەبوو. دەنگوباسی سەروانی برام پرسی، گوتیان لێرە نانی نیوەڕۆیەی خوارد و وەدەرکەوت. پاش ماوەیەک چاوەڕێیی لەبەرئەوەی هیچ خەبەرێک لە برایەکەم نەبوو و بارودۆخی شاریش زۆر نائاسایی و جێی نیگەرانی بوو، دیسان بەفیکری ئاڵۆز و پەرێشانەوە لە شاری هاتمە دەرێ و بەرێگای دێی " لاچین "دا بەپێیان، بەرەو قزڵجە وەڕێ کەوتم، کاتێک گەیشتمە ماڵێ، دیتم برایەکەم بەرێگای " پیربەلە" و " سارەوانان"دا هاتبووەوە ماڵێ، بەدیتنی بەرێزیان لە دڵپەشێوی ڕزگاریم هات و شوکرانە بژێریی خوام کرد.

لە دێ زۆر ئاسوودە بووین و ژیانمان خۆش بوو. یەکەم لە مەترسی دوور بووین، هەستمان وابوو دەتگوت لە قەڵایەکدا دانیشتووین کە هیچ شتێک زەفەری پێ نابا.(١) لە ماڵی باوان نەک هەر جارێکی تر وەکو سەردەمی منداڵی سێبەری دایک و بابمان بەسەر سەری خۆمانەوە هەست پێ دەکرد، بەڵکو لە نانی گەرم و شیرەمەنیی تازە و باش و خواردنی خۆش و بەچێژیش بەهرەمان وەردەگرت. هەوا فێنک و ڕۆحپەروەر بوو. لەوێ هیچ جۆرە ڕێسایەک لە گۆڕێدا نەبوو، جگە لە قانوونی لەتیف و ناسکی فیترەت نەبێ. هاونشینی و دیدار و چاوپێکەوتنی دۆستان و ناسیاوانی گوندەکانی دراوسێ کە بەبۆنەی هاتنەوەی ئێمە دەهاتنە لامان و دانیشتن و قسەکردن لەگەڵ ڕدێن سپییەکانی خۆش قسە و بەئەزموونی دێ(٢) و گەڕان بەنێو باخەکانی قزڵجەدا و خواردنەوەی ئاوی سەرچاوەی

١– زمانی حاڵی بابم ئەم بەیتە شێعرەی خواجە حافزی شیرازییە:

فتنه میبارد از این سقف مقرنس برخیز

تا به میخانه پناه از همه آفات بریم

٢– ڕوحیان شاد بێ "حەمە سەرخشت"، "عەزیز ئامان"، "وەستا عەولای قەمتەرێ"، "عەولا مووسا" زۆر قسەزان و قسەخۆش بوون.

"کانیێ شاخه ڕەشان" بەرنامەی ڕۆژانەی ئێمەی پێک دەهێنا. لەو مەجلیسانەدا لەبەر ئاسوودەییی خەیاڵ و هێوریی دڵ و دەروون، قسەی زۆر خۆش دەکران کە لە دڵ دەنیشتن. لەیەکێک لەو مەجلیسانەدا برایەکەم باسی سەفەری خۆی بۆ مهاباد ئاوا بۆ ئامادەبووان گێڕایەوە: کاتێک گەیشتمە مهابادێ، دەستبەجێ، بەپێی ئەرک، چوومە لای فەرماندەری هەنگی دەی پیادەی (باوەند پوور) لە سەربازخانەی مهاباد و خۆم ناساند و گوتم: ئەمن ئەفسەرێکم سەر بەلەشکری ٣ی تەورێز و لەم مەڵبەندەدا ڕاسپاردەکەم کڕینی ئەسپە، ئێستا کە دەستدرێژی کراوەتە سەر وڵاتی ئێمە و دەرەتانی ئەوە بۆ من نییە، بچم و پەیوەست بم بەشوێنی کاری خۆم، خۆم بەنزیکترین سەربازخانە کە هەر ئەم هەنگی دەی پیادەی (باوەندپووره) دەناسێنم تاکو بەپێی پیشەی سەربازی هەر ئەرکێکی پێتان باشە، پێم بسپێرن.

فەرماندەری هەنگی نێوبراو، کە ئەو دەمی سەرهەنگ موختاری بوو، لە وڵامدا گوتی: بەپێی قسەی ڕادیۆ، دەوڵەتی ئێمە دەستی لە خۆڕاگری هەڵگرتووە و مەسەلەی خۆبەدەستەوەدان و ئاشتی و سازان هاتووەتە گۆڕێ و بڕیار وایە سبەینێ نوێنەرانی هەنگ بەهەڵکردنی ئاڵای سپی، بۆ چاوپێکەوتن و وتووێژ بچنە لای فەرماندەرانی پێشەنگی شووڕەوی و دوایە هێزی شووڕەوی دێتە ئێرە و هەنگ بەبێ خۆڕاگری خۆی دەداتە دەست کاربەدەستانی ئەرتەشی شووڕەوی و ئێستا ناکرێ پێشبینی بکرێ شێوەی جووڵانەوەی ئەوان لەگەڵ ئەفسەران و سەربازەکانی ئێمە چۆن دەبێ. ئێستا ئەمن و ئەفسەرانی هەنگ لە شوێنێک کۆ دەبینەوە و چاوەڕێی هێزی شووڕەوی دەکەین. ئەگەر ئەتۆش پێت خۆش بێ، دەتوانی وەکو ئەفسەرەکانی دیکەی هەنگ لێرە بمێنییەوە و چاوەڕێی هاتنی هێزی شووڕەوی بکەی و هەروەها لێی زیاد کرد ئەفسەر و سەربازەکان چەک دەکرێن. کاتێک لەوە ئاگادار بووم و بۆم دەرکەوت بەداخەوە هێزەکانی ئێمە بڕیاریان وایە خۆ بەدەستەوە بدەن، ئەو بڕیارە هەتا بڵێی لە دڵم گران هات و لای خۆم بیرم کردەوە بێت و لە نێو ئەفسەرەکانی هەنگدا بمێنمەوە، جگە لەوەی دەبێ نەنگی خۆ بەدەستەوەدان بێ هیچ هۆیەک بپەژرێنم، دەبێ دەمانچە و دووربین و ئەسپی خۆم و سەربازەکانیشم بدەم بەدوژمن و جارێ دیاریش نییە بەدوای خۆ بەدەستەوەدانمان، ڕووسەکان چۆنمان لەگەڵ دەجووڵێنەوە، داخوا دەمانگرن، یەخسیرمان دەکەن، یان دوای چەککردن ئازادمان دەکەن؟ هەرچۆنێک بێ خۆبەدەستەوەدانم بەدوور لە پیاوەتی و ئاوەز زانی و لەگەڵ سەربازەکانم دەستبەجێ مهابادمان بەجێ هێشت و هاتمەوە قزڵجە، ئەگەر لێرە هەست بەمەترسییەک

بکرێ، چەند ڕۆژێک لە کێوەکان و ئەشکەوتەکانی گوندەکە خۆم لە چاوان دەشارمەوە تا بزانین کۆتاییی کارەکە بەکوێ دەگا؟ خوداڵێخۆشبوو بابم و منی نووسەری ئەم دێڕانە و ئامادەبووانی دیکەی مەجلیس هەمووماں بڕیارەکەیمان بەبڕیارێکی بەجێ دانا و پشتمان گرت.

بۆ بەیانیی ئەوی ڕۆژێ چەندین سەربازی وەزیفە (جوندی موکەلەف)، خەڵکی دێیەکانی دەوروبەری قزڵجە، کە بۆخۆیان بەچاوی خۆیان شاهیدی هاتنی هێزەکانی شووڕەوی بۆ نێو مهاباد بووبوون و دەرفەتیان هێنابوو هەڵێن، هاتنە قزڵجە و وردە ڕیشاڵی هاتنی هێزی مۆتۆریزەی شووڕەوییان بۆ مهاباد ئاوا گێڕایەوە: ژمارەیەک لە ئەفسەرانی ئێرانی بەهەڵکردنی ئالای سپی، بەسواری ماشێنێکی جیپ، بۆ پێشوازی و وتوویژ لەگەڵ فەرماندەری هێزی شووڕەوی بەرەو میاندواو یان ورمی وەڕێ کەوتن و، دوای ماوەیەکی کورت گەڕانەوە و دەرکەوت هێزەکانی شووڕەوی بەزوویی دێنە نێو مهابادەوە و بەتەمان ئەفسەران و تاکوتەرای هەنگ چەک بکەن، کاتێک ئەفسەرانی خۆمانە گەڕانەوە مهاباد و چوونە نێو سەربازخانە، فەرمانیان دا گشت سەربازانی چەکدار تفەنگەکانیان لە نێو سەربازخانەدا لە سەریەک کۆبکەنەوە و بۆ خۆشیان لە گۆشەیەک ڕاوەستن. لەو دەمەدا هێزی مۆتۆریزەی شووڕەوی گەیشتە نێو سەربازخانە و هەموو شوێنەکانی ئەوێیان داگیر کرد و لوولەی موسەلسەل و چەکەکانی دەست خۆیان لە سەربازە ئێرانییەکان کرد و دوایە چەند کەس لەوان لە ماشین دابەزین و گورج چەکەکانی سەربازە ئێرانییەکانیان باری کامیۆنان کرد و بردیان و سەربازەکانیشیان لە چەند خانووبەرەی قشڵەکەدا زیندانی کرد و قەرەوڵیان لە دەوری دانا. دوای چەککردنی ئەفسەرەکانیش ئەوانیشیان لە ژوورێکدا زیندانی کرد، دوایە پەلاماری ئەنبارەکانیان دا و هەرچی چەکوچۆڵ بوو باری کامیۆنەکانیان کرد و لە سەربازخانەیان بردە دەرێ. دوایە چەند کامیۆن سەرباز و ئەفسەر چوونە شاری، ئیدارەی شارەبانی (پۆلیس) و (ژاندارمەری) یان داگیر و چەکیان کردن، ژاندارمەکان و پاسەبانەکانیان وەدەر نا و هەموو بەندییەکانیان بەردا و هیچ بەخراپ لەگەڵ خەڵک نەجووڵانەوە و کاریان بەکاری دانیشتوانی شاری نەبوو و بەتەواوی نەزم و هێمنییان لە شاریدا دامەزراند.

بۆ زانینی ڕاستی و دروستی ئەو خەبەرانە و وەدەستهێنانی دەنگوباسی باوەڕپێکراو کەسێکمان نارده شاری. ئەو کەسە کە نێوی عەزیز ئامان بوو، دوای چەند سەعات هاتەوە گوند و گوتی بۆ خۆی بەشەخسە چووتە نێو شاری و وەزعی شاری لەوپەڕی ئارامیدا دیوە

و کەس کاری بەکەس نەبووە. دوای ئاگاداری لەو بارودۆخە، ئەمن کە مووچەخۆری ئیدارەی دارایی، ماڵی و ئابووری بووم، بەپێویستم زانی بچمەوە سەر کارەکەی خۆم، کاتێک بەنیگەرانی و دڵپەشێوییەوە (ترس لە ڕووسەکان لەبەر ئەو مرۆکوژی و خوێنڕێژییە بێ بەزەییانە بوو کە لە شەڕی یەکەمی دنیاگرەوەدا لە مەهاباد و دەوروبەری کردبوویان و نووسەر سەبارەت بەوە بەکورتی لە شوێنی خۆیدا ئاماژەم پێ کردووە) گەیشتمە شاری مەهاباد، دیتم بەڕاستیش نەزم و هێمنی دامەزراوە، بەڵام جۆرێک ترس و نیگەرانی و دڵپەشێویی دەروونی و دەستەوەستانی، باڵی بەسەر شاردا کێشاوە. لەبەر دەرگای گشت دامەزراو و ئەنبارە دەوڵەتییەکاندا وەکو بانکی میللی، ئەنباری پارچە و قوماش، غەلە و هتد. سەربازانی ڕووسی خەریکی کێشک کێشان بوون.

خەڵک کەم کەم دەگەڕانەوە شاری و خەریکی کاروکاسبی ئاسایی خۆیان دەبوون. ڕووسەکان – حکوومەتی نیزامییان لە شار ڕاگەیاند و هیچ کەس شەوانە مافی نەبوو دوای تاوەڕان لە ماڵی خۆی بێتە دەرێ. شەوانە بێدەنگییەکی تەواو شاری دادەپۆشی، بەڵام جار جار دەنگی تەقەیەکی کەم دەبیسترا، ئەو سەربازە ئێرانییانەی لە لایەن ڕووسەکانەوە دەستبەسەر کرابوون، ئەگەر دەرفەتیان پەیدا کردبا، حەولی هەڵاتنیان دەدا، ڕووسانیش تەقەیان لێ دەکردن و چەند کەسێک بەو شێوەیە گیانی خۆیان لە دەست دا. دوای دوو سێ ڕۆژ، ڕووسەکان ڕاگەیاندراوێکیان بەزمانی فارسی بڵاو کردەوە، تێیدا فەرمان درابوو هەرکەس چەکی سارد و گەرمی هەبێ، دەبێ لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا ڕادەستی کاربەدەستانی شوورەویی بکا، دەنا ئەگەر کەسێک چەکی پێ بگیرێ، بەتوندی سزا دەدرێ.

ڕووسەکان لە دوای چەند ڕۆژ گشت سەربازە ئێرانییەکانیان بەردا، بەڵام ئەفسەرەکانیان بردە تەورێز و ورمێ و ئەوانیان دووسێ مانگان ڕاگرت و دوایە ئەوانیشیان بەردا. سەبارەت بەیەکێک لە ئەفسەرە گیراوەکان چیرۆکێکم بیستووە کە گێڕانەوەی بێ جێ نییە، بۆیە لێرەدا بۆتان دەگێڕمەوە.

ڕۆژێک چەند نەفەر لە ئەفسەرانی ئێرانی کە لە تەورێز لە زیندانی ڕووسەکاندا بوون داوا دەکەن ڕێگایان بدرێ بچنە گەرماوێ، ڕووسەکان قۆڵ لە سەر داواکەیان دەکێشن و چەند کێشکچی و گرووهبانێک دیاری دەکرێن، ئەفسەرانی نێوبراو لە بەندیخانە وەربگرن و بیانبەنە گەرماوێ و بیانهێننەوە. بەکورتی ئەفسەرەکان لەژێر چاودێریدا دەبەنە یەکێک لە گەرماوە گشتییەکان. یەکێک لە ئەفسەرەکان کە پێشتر خەیاڵی هەڵاتنی لە سەردا دەبێ،

ئەو دەرفەتە بەکاردەهێنێ بێ ئەوەی کاتی خۆی بەزایە بدا لە خەزێنەی گەرماوێ دێتە دەرێ، دەچێتە جێگای جلوبەرگ داکەندن، لەوێ لەجیات ئەوەی جلوبەرگی ئەفسەری خۆی دەبەرکا، دەستێک جلوبەرگی نانیزامی یەکێک لە موشتەرییەکان هەڵدەتێ و جلوبەرگەکە دەبەردەکا و لەوپەڕی لەسەرەخۆییدا بەبەردەم سەربازی ڕووسیدا لە گەرماوەکە دێتە دەرێ و سواری فایتوونێک دەبێ و لەوێ دوور دەکەوێتەوە. دوای ماوەیەک گشت ئەفسەرەکان لە گەرماو دێنەدەرێ و خەریکی دەبەرکردنی جلوبەرگەکانیان دەبن، بەڵام جلوبەرگی ئەفسەری هەڵاتوو لەوێ بێ خاوەن لە گۆڕێ دەمێنێتەوە. کێشکچییە ڕووسەکان ماوەیەک چاوەڕێ دەبن، ئەفسەری نێوبراو لە گەرماو بێتە دەرێ و جلوبەرگەکانی دەبەرکا تا بیانگێڕنەوە سەربازخانە، بەڵام دەردەکەوێ مریشک لە کولانەدا نەماوە. ڕووسەکان لای خۆیان بیر دەکەنەوە نەکا ئەفسەرەکە لە خەزێنەی گەرماو یان یەکێک لە نومرەکاندا خۆی شاردبێتەوە، بۆیە دەست دەکەن بەگەڕان، ئاخرەکەی خاوەنی جلوبەرگە نانیزامییەکە کە کابرایەکی بەڕیش و پەشمی خەنەتێدراو دەبێ دەدۆزنەوە و بۆ ئەوەی ژمارەی ئەو کەسانەی هێنابوویانن بۆ گەرماو کەم نەهێنێ، لە جیات ئەفسەرە هەڵاتووەکە دەیگرن و ڕاکێش ڕاکێش دەیهێننە دەرێ بەزۆری جلوبەرگی ئەفسەری، پێ دەبەردەکەن و لەگەڵ ئەوانیدی دەیبەن بۆ سەربازخانە.

لە ئەنبارەکانی غەلە و دانەوێڵەی مهاباد دا، گەنم، جۆ و ئاردێکی زۆر لە ئەنبار درابوو. ڕووسەکان دەستیان کرد بەڕاگوێستنی ئاردەکان بۆ تەورێز و ورمێ. خودالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی، سەرۆکی ئەنجومەنی شاری وەکو ڕدێن سپی و نوێنەری شار لەگەڵ کاربەدەستانی شوورەوی دانیشتووی مهاباد دەستی کرد بەوتووێژ و پێی ڕاگەیاندن ئەو غەلەیە بەمەبەستی دابینکردنی نانی خەڵکی شاری بەتایبەتی چینە دەستتەنگەکان ئامادە کراوە و لە ئەنبار دراوە، ئەگەر هێزەکانی ڕووسیە ئەو غەلەیە بەرن، شارەکە تووشی قاتوقڕی دێ و نەداران لە برسان دەمرن. لە ئاکامی ئەو وشیارکردنەوە و تێکۆشانە بەکەلکەی خودالێخۆشبوو سەدری قازی، ڕووسەکان لە بردنی ئاردی دەوڵەتی چاوپۆشییان کرد و ئەنبارەکانیان لەبەر دەست کاربەدەستانی ئیدارەی غەلە نا. لە ئاکامی ئەو کردەوە جێی پێزانین و خێرخوازانەی خودالێخۆشبوو سەدری قازی دا، ئەو غەلەیەی لە مهاباددا هەبوو تا چەند ساڵ دواتر پێداویستیی شاری دابین کرد و چ بێدەرەتانی و گیروگرفتێک لەمەڕ نان ساز نەبوو.

هەرچۆنێک بێ، دوای دە دوازدە ڕۆژ مانەوە، هێزە شوورەوییەکان لە پڕ مهابادیان چۆڵ

کرد و بەرەو تەورێز و ورمێ وەڕێ کەوتن. هەروەک پێشتر گوتمان، ڕووسەکان هەموو هێزەکانی دەوڵەتی ئێرانیان لە تەواوی کوردستان جگە لە سەردەشت نەبێ چەک کردبوو و هەڵیان وەشاندبوون، پاشان بۆخۆشیان مهاباد و ناوچەکانی دیکەی کوردستانیان چۆڵ کرد، و بەڕۆیشتنی ئەوان بۆشاییی هێز ساز بوو. لەو سەروبەندەدا بوو کە گیان و ماڵی خەڵکی کەم دەستەڵات لەلایەن ژمارەیەک لاتولووت هەڕەشەی لێ دەکرا و بەگوتنێکی دی بەپێی قانوونی جەنگەڵ بەهێزەکان وەبیر خواردنی بێهێزان کەوتبوون و، هەرکەس هەرکەسی و لغاوپساوی و ئاڵۆزی گەیشتە ئەوپەڕی خۆی و هیچ کەس لە گیان و ماڵی خۆی ئەمین نەبوو.

لە کاتێکی ئاوادا کە بارودۆخ گەیشتبووە ئەوپەڕی ناخۆشی و تووشی و خەڵک بەتایبەتی دانیشتوانی شاری مهاباد بۆ پاراستنی گیان و ماڵی خۆیان لە هەموو جێیەک نائومێد بووبوون و دەستەوەستان مابوونەوە، وەکو داونەریتێکی لەمێژینە کە لە ڕۆژی چارەڕەشیدا پەنایان دەبردە بنەماڵەی قازی، ئەو جاریش داڵدەیان بردە بەر ماڵی هیوای خۆیان، بۆ پاراستنی گیان و ماڵی خۆیان لەو بارودۆخە شپرزەیە و لەو ڕۆژە تاریکەدا دەستەوداوێنی بنەماڵەی قازی بوون و داوای یارمەتی و چارەیان لێ کردن.

ئەوە بوو خوالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی و بەتایبەتی برا گەورەکەی خوالێخۆشبوو قازی محەمەد کە تەنانەت لە کاتی پەلاماری هەواییی فڕۆکەکانی شوورەوی بۆ سەر مهاباد و بۆمبارانکردنی لە شار دەرنەکەوتبوون و لە مهاباد مابوونەوە، بانگەوازی یەکڕەنگی و یەکایەتیی خەڵکی شاریان دا و هانیان دان بۆ خۆ چەکدارکردن، بۆ ئەوەی بۆخۆیان پارێزگاری لە گیان و ماڵ و نامووسی خۆیان بکەن، دەنا لەو بارودۆخە تاریک و توفەی دنیادا کەس ناتوانێ لە فیکری مهاباد و مهابادیدا بێ. ئەوە بوو خەڵکی مهاباد لە ترسی گیان و ماڵی خۆیان کە بەردەوام لە لایەن عەشیرەتەکانی دەوروبەر هەڕەشەی لێ دەکرا و دەمەترسی نەمان دابوو، یەکیان گرت، بەرە بەرە چەکیان دەشانی کرد، ئیدارەیەکیان بەنێوی پاراستنی هێمنایەتیی شاری دامەزراند و بەپێی پەسند و دەنگی گشتی هێندێک لێپرسراویان بۆ سەرپەرستیکردنی بارودۆخی هێمنایەتیی شاری هەڵبژارد کە هەر شەوەی بەنۆرە دەستەیەک کێشکی شاری بەئەستۆوە بگرێ و خوالێخۆشبوو قازی محەمەدیشیان بەکۆی دەنگان بۆ سەرپەرستیکردن و سەرۆکایەتیی بەرزی پاراستنی نەزم و هێمنایەتیی شار هەڵبژارد. بەو پێیە جگە لە پاراستنی شار و کێشکی شەوانە، دیارە پێڕاگەیشتن بەدووبەندی و کێشەکانی تریش بەڕێوە دەچوو و

بەرێگای کەیخوایەتی و جێی ڕەزایەتی دوولایەنە، ئاو بەئاوری کێشەکاندا دەکرا و بەلایەکدا دەخران. عەشیرەتەکانی دەورویەریش چەند جار حەولیان دا بەمەبەستی ڕاوڕووت و تالانی ملک و ماڵی خەڵک دەستدرێژی بکەنە سەر شاری مهاباد، بەڵام هەموو جارێک لەگەڵ خۆڕاگریی جیددی خەڵکی مهاباد ڕووبەڕوو دەبوون، لە ئاکامدا فیکری دەستدرێژی و بەربینگ پێگرتنی خەڵکی مهابادیان، بۆ هەمیشە لە مێشکی خۆیان دوور کردەوە، لەوەودوا عەشیرەتەکان و خەڵکی شار بەدۆستانە مامەڵەیان لەگەڵ یەکدی دەکرد.

خوالێخۆشبوو قازی محەمەد، نەک هەر گیان و ماڵی خەڵکی لە دەستدرێژی و دەستتێوەردان پاراست، بەڵکو ئیدارە و کەلوپەلی دەوڵەتیشی پاراست و پەنای ئەو کاربەدەستە دەوڵەتییانەشی دەدا کە لەوێ مابوونەوە. هەڵبەت زۆربەی مووچەخۆر و کاربەدەستی کە خەڵکی خۆجێیی نەبوون جێی ڕاسپاردەی خۆیان بەجێ هێشتبوو و چووبوونەوە شارەکانی خۆیان، تەنێ ژمارەیەکی کەم مابوونەوە لەوانە سالاری یەحیا پوور، فەرمانداری مهاباد و عەبدولعەلی حەسەنزادە سەرۆکی دارایی و ئابووری، خاو و خێزانی خۆیان ناردبووە تەورێزێ بەڵام بۆخۆیان لە ترسی بەرپرسایەتی لە مهاباد مابوونەوە. ئەوانە لە چاوەڕێی ئەهوەنبوونەوەی بارودۆخەکەدا، پەنایان بردبوو بۆ ماڵی قازی محەمەد و شەو و ڕۆژ لەوێ بوون و مرۆ دەبێ لە ڕووی ویژدانەوە بڵێ لە لایەن خوالێخۆشبوو قازی محەمەدەوە ئەوەی پێویستی ڕێز و حاواندنەوە بوو لەگەڵیان دەکرا. بەڵام چاوەڕوانی ئەوان بۆ ئەهوەنبوونەوە و باشتربوونی بارودۆخ چاوەڕوانییەکی خۆڕایی بوو، چونکو ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخەکە گرژتر و تاریکتر دەبوو و ئەو دەمی پێوەندیی پۆست و تێلێگرافیی لەگەڵ تەورێز و تاران بڕابوو و لەجێدا چارەنووسی هیچ تاکێک و بگرە چارەنووسی دنیا دیار نەبوو، چی بەسەر دێ، چونکو لەشکرەکانی ئاڵمانی هیتلێری سەرتاسەری ئورووپای بێجگە، لە ئینگلیستان نەبێ، داگیر کردبوو و هەروەها قۆڵێکی دیکە لە سپای ئاڵمانییەکان پێشڕۆییەکی زۆری لە ئەفریقا کردبوو و لە لایەکی دیکە بەشی سەرەکیی وڵاتی شوورەوی داگیر کردبوو، تەنانەت گەیشتبوونە شەش فەرسەخیی مۆسکۆ پێتەختی ئەو وڵاتە. بەکورتی تەواوی دنیا لە ئاوری شەڕدا دەسووتا و، دێوەزمەی مەرگ و کوشتوبڕ و هەژاری و برسێتی و کاولکاری و وێرانی خەریک بوو، دنیای قووت دەدا.

لە دوای لە نێوچوونی سەربازخانەی سەردەشت بەدەستی عەشیرەتەکان[1]، حەمەڕەشیدخانی بانە کە چەندین جار لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان لە سەقز پێکیان دادابوو

١- بڕوانە: سالهای اضطراب، خاطرات خلیل فتاح قاضی، لاپەڕەی ٧٧

و سەربازخانەی ئەوێی تێک شکاندبوو و سەرلەشکر (ئەمین)ی کوشتبوو، بەدوو سێ هەزار نەفەرەوە بەمەبەستی داگیرکردنی مهاباد وەڕێ کەوت. بۆ ڕەواندنەوەی ئەو مەترسییە، خودالێخۆشبوو قازی محەمەد چوو بۆ چاوپێکەوتنی حەمەڕەشیدخان لە دێی خەلیفان لە محاڵی یەڵتەمری مەنگوڕ کە حەمەڕەشیدخان هاتبووە ئەوێ. قازی محەمەد زۆر بەجیدی وشیاری دەکاتەوە کە دەبێ لە فیکری جووڵان بەرەو مهاباد دەست بپارێزێ و پێی ڕادەگەیێنێ نێوبراو مافی دەستوەردان لە کاروباری مهاباد و دەوروبەریدا نییە و نەزم و هێمنایەتیی ئەوێ بەدەست خۆی (خودالێخۆشبوو قازی محەمەد) و عەشیرەتەکانی دەوروبەری مهابادە و ئەگەر بیەوێ بەرەو مهاباد بێ، خەڵکی مهاباد و عەشیرەتەکانی دەوروبەری ناچار دەبن شەڕی بکەن. حەمەڕەشید خان لە بەرانبەر ئەو هەڕەشە و ئاگادارکردنەوەیە دا، ناچار بوو لە دێی خەلیفانەوە بەرەو بانە پاشەکشە بکا و دەست لە چوون بۆ مهاباد هەڵبگرێ. بەو پێیە مهاباد لەبەر حەولەکانی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە مەترسییەکی گەورە ڕزگاری بوو.

هەر لەو سەروبەندانەدا چل دەستگا کامیۆنی هێزە ئینگلیسییەکان، لە خەتی عێراق خانێ (پیرانشار)وە هاتنە نێو مهاباد. ئەوانە دوو شەو لە سەربازخانەی مهاباددا مانەوە. ژمارەیەک لە کەسانی هەژار و بێکاری شار چووبوون بۆ تەماشایان، سەربازە ئینگلیسییەکان دنەیان دەدەن و داوایان لێ دەکەن پاشماوەی خواروبار و کەلوپەل و چەکە شەق و شڕەکانی کە لە ئەنبارەکانی سەربازخانەدا مابوونەوە و ڕووسەکان نەیان بردبوون لەگەڵ خۆیان بەرن. لەئاکامدا تەماشاکاران ملی پێوەدەنێن و ئەوەی لە خواروبار و کەلوپەل و چەکی لەکارکەوتوو و شەقوشڕەکان مابووەوە، هەمووی دەبەن. هەروەک پێشتر باسمان کرد، ڕووسەکان تەنێ دەستیان بەسەر جبەخانە و چەکوچۆڵی نوێی، سازکراوی فابریکی برنووی چێک و سلۆڤاکی داگرت و بردیان و چەکی کۆن و شەقوشڕ هەر وا بەدەست لێنەدراوی لە ئەنبارەکاندا مابوونەوە کە ئەوانیش بەدنەدانی سەربازە ئینگلیسییەکان، لە لایەن خەڵکی نەدار و هەژاری دەوروبەری شارییەوە لە سەربازخانە برانە دەرێ.

لەو سەردەمەدا شەڕی دنیاگرەوەی دووەم گەیشتبووە ئەو پەڕی توندیی خۆی. هێزە ئاڵمانییەکان لە ڕووسیەدا پێشڕۆییان کردبوو و گەیشتبوونە نزیک قەوقاس و موسکۆ و لە جێدا چ دەگا بەچارەنووسی مهاباد و ئێران بگرە چارەنووسی دنیاش دیار نەبوو، بەو پێیە فەرماندار و ژمارەیەک لە سەرۆک ئیدارەکان کە بەهیوای باشتربوونی بارودۆخ لە مهاباد مابوونەوە و میوانی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد بوون، لە باشتربوونی بارودۆخ هیوا

براو بوون، تکایان لە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد کرد بەتفەنگچییەکانی خۆی (قۆڵسووری قازی وەرگێڕ). تا میاندواویان بەڕێیان بکا. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد تکای گرتن و دووسێ چەکداری باوەڕپێکراوی خۆی لە لەگەڵ خستن و بەماشێنێکی سواری لە بەرواری...[1] ڕەوانەی میاندواوی کردن. یەکێک لەوانە ئاغای کیتاش سەرۆکی بانکی میللی مهاباد بوو، نێوبراو یەکسەد و دە هەزار ڕیاڵ (یازدە هەزار تمەن) ی کە لە سندووقی بانکدا بوو لەگەڵ خۆی برد. ڕۆیشتنی فەرماندار و سەرۆک دایەرەکان و کۆکردنەوەی ئیدارەکانی بەرپرسی نەزم و هێمنی، دوا هەناسەی دەستەلات و هێزی دەوڵەتی بوو و گشت ئیدارەکان جگە لە ئیدارە ئابوورییەکان نەبێ کە خەریکی فرۆشتنی قەند و شەکر و تریاک و غەلە بوون، پاکیان دەرگایان داخرا.

لە جیات ئیدارەی شارەبانی (پۆلیس)، بنکەیەک لەلایەن خەڵکی شار و خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەدەوە بەنێوی ئینتیزاماتی شاری دامەزرا. ئینتیزاماتی نێوبراو لە خانووی شارەبانیی مهاباددا بەکاروبار و کێشەوهەرا ڕادەگەیشت. ئەگەر داوا و خیلاف بچووک بوویان لە لایەن سەرۆکی ئینتیزاماتی شارییەوە جێبەجێ دەکران، کە بەڕێوەبردنی ماوەیەک بەدەست میرزا غەنی خوسرەوی، پاشان حاجی سەید ڕەحیمی نیزامی و ماوەیەک خوداڵێخۆشبوو میرزا مەحموودی مەنسووری قازی، کوڕی خوداڵێخۆشبوو قازی فەتاح و دواتر کاک سەید خدری (سەید نیزامی)یەوە بوو کە بە سەیدە پیرە، بەنێوبانگ بوو. هەروەها ئەگەر کێشەکان ئاڵۆزتر بوویان، خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و برایەکەی خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی، بەپێی حوکمی شەرعی یان بەڕێگای کەیخوایەتی دەستبەجێ پێیان ڕادەگەیشتن و کۆتاییان پێ دەهێنان.

لەو سەروبەندانەدا گشت سەرۆک عەشیرەتەکانی دەوروبەری مهاباد لەوانە خوداڵێخۆشبوو حاجی قەرەنی ئاغای ئەمیر عەشایر، خاوەنی پەسوێی لاجانی مامەش و حاجی کاک هەمزەی قادری، خاوەنی جەڵدیان و ڕدێن سپییەکانی دیکەی مامەش و خوداڵێخۆشبوو عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد (عەلی یار) و ڕدێن سپییەکانی تری دێبۆکری و عەولای بایز ئاغا و برایم ئاغای سالاری، سەرۆکەکانی عێلی مەنگوڕ و بایزی عەزیزئاغای سەرۆکی عێلی گەورک و قەرەنیی بایزی، ڕدێن سپیی عێلی پیران لە مهاباد بوون و لە مەحکەمەی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەددا کۆبوونەوەیەکیان پێک هێنا، ئەمنیش نووسەری ئەم دێڕانە لەو مەجلیسەدا ئامادە بووم، دوای قسە و وتووێژێکی زۆر و بیرورا

---

١- بابم بەروارەکەی نەنووسیوە و جێگەکەی خاڵی هێشتووەتەوە.

گۆڕینەوە سەبارەت بەبارودۆخ، یەکدەنگ بڕیاریان دا: مادام دەوڵەت لە هەرێمی کوردستان (مەبەست مهاباد و دەوروبەرە) هێزی عەسکەریی نییە و ئیتیزاماتی دانەمەزراندووە، ئاغاکان بۆ خۆیان ئارامی و هێمنی لە ناوچەکەدا دەپارێزن و بۆ دەستەبەرکردنی ئەو مەبەستە هەموویان هاوکاری یەکدی دەکەن و کەسانی سەربزێو و تێکدەر لە دەرەوەی شاری مهاباد بەهاریکاریی یەکتری سەرکوت دەکەن و دژایەتی و دووبەرەکی بەلەسەرەخۆیی و ئارامی و بێ ئەوەی توندوتیژی بەکاربهێنن، بەپێی حوکمی شەرعی کۆتایی پێ دەهێنن. وا بڕیار درا لەو بارەیەوە پەیماننامەیەک بنووسرێ و هەموویان ئیمزای کەن. تەکلیفیان لە نووسەر کرد کە لەو مەجلیسەدا ئامادە بووم، نێوەرۆکی ئەو ڕێککەوتنە بهێنمە سەر کاغەز، ئەمنیش شەرحێکم نووسی و پێشکێشی خودالێخۆشبوو قازی محەمەدم کرد و دوای پێداچوونەوەی و چاککردنی نێوەرۆکەکەی، سەرۆک عەشیرەتەکان پاکنووسی ئەو پەیماننامەیان واژۆ کرد.

ماوەیەک ئاوا ڕابرد، مهاباد و دەوروبەری (لە لایەن دەوڵەتی نێوەندییەوە) چ لای لێ نەکراوە و لەبیر کرا تا ئەوەی دەوڵەتی نێوەندی سەرۆک عەشیرەتەکان و خودالێخۆشبوو قازی محەمەدی بانگێشتن کرد بۆ تارانێ. کەسانی نێوبراو لە تاران چاویان بە شا و کاربەدەستانی دیکە کەوت و لەوێ هەرکامێکیان هێندێک قەند و شەکر و قوماشیان حەواڵە کرا و هەروەها بڕیار درا ئینتیزامات و هێمنیی دەوروبەری مهاباد و میاندواو بەدەست سوارەی عەشیرەتەکانەوە دابین بکرێ. ئەوە بوو هێندێک سوارەی کەریم ئاغای بایزاغای خاوەنمولکی قوم قەڵا و ژمارەیەک سوارەی خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی لە ژێر چاودێری ژاندارمەریی میاندواودا دەست بەکار بوون.

لەو سەروبەندەدا ئینتیزاماتی نێوخۆیی مهاباد، هەر بەدەست خودالێخۆشبوو قازی محەمەدەوە بوو و خودا لێخۆشبوو قەرەنی ئاغای مامەشیش لە مهاباد دادەنیشت و یارمەتیی خودالێخۆشبوو قازی محەمەدی دەدا و هاوکاریی دەکرد. هەرلەو ماوەیەدا بوو عەلی ئاغای عەلییار (ئەمیر ئەسعەد) سەرۆکی گشت تایفە و تیرەی جۆربەجۆری دێبۆکری، سەفەرێکی تارانێی کرد و دوای مانەوەیەکی کورت لەوێ، توانی حوکمی فەرمانداریی مهاباد بەدەستەڵاتی تەواوەوە بۆ خۆی و پلەی سەروانی بۆ کوڕەکەی سلێمان و هەر هەمان پلە بۆ برایم ئاغای شێخ ئاغایی (ناسراو بەبرایمە سوور) برای مستەفاخانی شێخ ئاغایی وەربگرێ. بەدووی ئەوەدا خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا بەشاتەشات و گەورەیی و جەلالی تەواوەوە لە ڕیزی پێشەوەی سوارەی دێبۆکریدا هاتە نێو مهاباد و دەست بەکار

بوو و لەبەر هێزی شەخسیی خۆی و بنەماڵەیی و دەستەڵاتێک کە دەوڵەت بەڕەسمی پێی دابوو، لە ماوەیەکی کورتدا بەسەر مەهاباد و دەوروبەریدا بەتەواوی زاڵ بوو. عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد، لەگەڵ ئەوەشدا پیشەکەی فەرمانداری بوو، بەڵام دەستەڵاتی هیچ سنووری نەبوو: بەڕێزیان هەموو کاروبارەکانی مەهاباد و دەوروبەری بەتەواوی بەدەستەوە گرت و لەبەرئەوەی ئیدارەی ئینتیزامی و قەزایی نەبوون، کاروباری ئەو ئیدارانەی بۆخۆی و بەپێی سەلیقە و مشووری خۆی بەڕێوە دەبرد. بەکورتی عەلی ئاغا حوکمێکی بەدەستەڵات و ڕەهای بۆخۆی لە مەهاباد دامەزراند، خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا جگە لە لێوەشاوەیی و کەسایەتیی زاتی و دەستەڵاتی بنەماڵەیی، فەرمانداری ڕەسمییش بوو، بۆیە عەشیرەتەکان ڕێزیان لێ دەنا و کەم تازۆر گوێڕایەڵی بوون، بۆیە بەتەواوی بارودۆخەکەی خستە ژێر دەستی خۆی و بەسەریدا زاڵ بوو.

عەلی ئاغا هەر بەهاتنی بۆ مەهاباد، قازی محەمەد و سەدری قازی لە هەموو ڕوویەکەوە خستە ژێر گوشار و گەمارۆوە و دەرفەتی خۆ دەرخستنی پێ نەدەدان. دەیەویست هەموو کەسان و خزمەکانی ئەم بەندەیە کە ئەو دەمی کاری بچووکی وەک کێشک کێشانی ئەنبار و سندووقی دایرە دەوڵەتییەکانیان بەئەستۆوە بوو، لە سەر کار لابەرێ. نووسەر ئەو دەمی بەوەکالەت سەرپەرستی دارایی، ماڵی و ئابووری مهاباد بووم، ڕۆژێک فەرماندار نامەیەکی ڕەسمیی بۆنووسیبووم و فەرمانی دابوو چەند کەس لە کەسان و خزمەکانی خۆم کە بەر لە هاتنە سەر کاری بەڕێزیان لەبەر باوەڕییەکی کە پێم هەبوون لە جیاتی پاسەوان و دەرکەوانەکانی ناخۆجێیی ڕاکردوو، بەمووچەیەکی کەم بۆ پاراستنی ئەنبارەکان و کەلوپەلی دەوڵەت لەبەر کارم ڕۆنابوون، لە خوت و خۆڕایی و بەبێ هیچ هۆیەک لە سەر کار دەربکەم. ئەمنیش لە وڵامدا نووسیم، ئەمن باوەڕم بەو کەسانە هەیە و تاکو ئێستا لەوپەڕی دروستکاریدا ڕاسپاردەی خۆیان بەجێ هێناوە و لەکار لادانیان بەسەلاح نازانم و، ئەگەر فەرمانداری لە سەر دەرکردنی ئەوان، پێکێشی دەکا، پێویستە بەرپرسیارەتی پاراستنی ماڵ و دارایی دەوڵەت کە ئەنبارەکانی غەڵەی دەرەوەی شاریشی دەگرتەوە، بەڕەسمی بخاتە سەر ئەستۆی خۆی. عەلی ئاغا لەبەرئەوەی پیاوێکی زۆر تێگەیشتوو و بیردوور بوو، بەرپرسیارەتیی پاراستنی ماڵ و کەلوپەلی دەوڵەتی وەئەستۆ نەگرت و ئیدی بۆ لادانی کەسان و خزمانی ئەم بەندەیە پێی دانەگرت.

لەو سەروبەندیدا لە مهاباد، باجێک داهاتبوو بەنێوی " تۆپانە". لە هەر تۆپە پارچەیەک کە بەقاچاغی لە عێراقەوە دەهێندرا یان لە تاران و تەورێزەوە دەهێندرا، بڕێک دراو

وەردەگیرا و عەشیرەتەکانی[1] دیکەش کە چاوەڕوان بوون لەو سەودایە بەشیان دەست کەوێ و دەستیان نەدەکەوت، لەوە دڵمەند و ناڕازی بوون و، لە ئاکامدا دەستیان کرد بەدژایەتی و چەت تێخستنی کارەکانی عەلی ئاغا و لە دەوروبەری شاری دەستیان دایە دزی و ڕێگری. لەو بارودۆخ و هەلومەرجەدا عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد، نەیدەتوانی ئینتیزاماتی دەرەوەی شار بپارێزێ. ماوەیەکی پێ نەچوو عەشیرەتە دژبەرەکانی عەلی ئاغا، دژایەتیی خۆیان بەتەواوی وەڕووخست. هێندێک لە سەرۆکەکانیان چوونە تارانێ و بارودۆخ و حاڵ و باڵیان بەو جۆرەی بۆخۆیان دەیانەویست، بەگوێی کاربەدەستانی کاروبار گەیاند. بەدوای ئەو پێشوەچوونانەدا عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد باندەستی و دەستەڵاتی خۆی لە دەست دا و ناچار بوو مهاباد بەجێ بهێڵێ. دوای ڕۆیشتنی بەڕێزیان، دەستبەجێ ژمارەیەک لە سوارەی مەنگوڕ لە ژێر فەرمانی کاکەسواری مەنگوڕ، کوڕی ئەحمەدی گوڵاویاغا هاتنە نێو مهاباد و دەستیان کرد بەوەرگرتنی باجی "تۆپانە".

دوای ڕۆیشتنی عەلی ئاغا، بەپێی پەسندی سەرۆک عەشیرەتەکان لە جیات نێوبراو فەرمانداریکی دی بەنێوی سەریعولقەلەم هاتە مهاباد و دەست بەکار بوو و ئیدارەی شارەبانی (پۆلیس) کە کۆکرابووەوە، دیسان دامەزراندەوە. ئاشکرایە فەرمانداری و شارەبانی جگە لە نێوێکی بێ نێوەرۆک نەبێ، شتێکی دیکە نەبوون و نەیاندەتوانی بەبێ ئاگاداری و قۆڵ لە سەرکێشانی سەرۆک عەشیرەتەکان هیچ بکەن و هیچ دەستەڵاتێکیان نەبوو، تەنها شتێکی کە هەبوو نەزم و هێمنی لە نێو شاریدا کەم تازۆر لەلایەن خەڵکی شارەکەوە خۆیان ڕەچاو دەکرا و دەپارێزرا و خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لەو سەروبەندەدا چووبووە تارانێ، لە نەبوونی خودالێخۆشبوو قازی محەمەددا لەپڕ لە کۆتاییەکانی مانگی ڕێبەندانی ١٣٢٣ی هەتاویدا لە مهابادێ ڕووداوێکی خوێناوی قەوما، کە بووە هۆی کوژرانی پێنج پاسەوان و یەکێک لە خەڵکی مهاباد. گوزارشتی ئەو ڕووداوە بەپێی نووسراوەی ڕۆژنامەی (کوهستان) (ژمارەی یەک، دووشەمۆ حەوتەمی مانگی ڕەشەمەی ١٣٢٣) کە لە تاران لە ژێر بەڕێوەبەری ئاغای دوکتور سمایلی ئەردەڵاندا چاپ و بڵاو دەکرایەوە، لە لایەن سەرۆکی شارەبانی ئەو کاتی مهاباد ئەفشار پەنا و حاجی قەرەنی ئاغای مامەش بەم شێوەیەی خوارەوە بۆ نێوەند (تاران) ناردراوە:

" تێلێگراف لە میاندواوەوە ٢٧/ ١١/ ١٣٢٣ شارەبانیی گشتیی وڵات،

---

١- مەبەست لە عەشیرەتەکانی دیکە، هەموو عەشیرەتەکانی هەرێم جگە لە (دێبۆکری) یە؛ چونکو عەلی ئاغا خۆی دێبۆکری و سەرۆکایەتیی ڕەهای تایەفەش، لە دەست ویدا بوو.

ڕوونووس شارەبانیی ڕەزائیە سەعات چواری ئێوارەی ٢٦ی مانگی ڕێبەندان، نزیکەی دووهەزار نەفەر لاتولووتی چەکدار و بێ چەک، بەهاندانی عەزیز نێوێک کوڕی گەنجاڵی خاوەن موڵکی دێی یاسیکەندی لە محاڵی بۆکان لە تایەفەی فەیزوڵابەگی پەلاماری شارەبانییان دا، دوو نەفەر سەر پاسەوان و سێ نەفەر پاسەوانیان کوشت و چەند کەسێکیان بریندار کرد ئەوانی دیکەش هەڵاتوون، گشت چەک و کەلوپەلی شارەبانی و شتومەکی ئەم فیداییەتان و چەند کەس لە مووچەخۆران کە ماڵیان لە شارەبانیدا بووە، تاڵان کراون و دەرک و پەنجەرەی شارەبانی بەتەواوی لەنێوچووە. ئاغایانی مەنگوڕ، مامەش، پیران فەرماندار و ئەم فیداییەیان لە مەترسی ڕزگار کردووە، لەبەرئەوەی مهاباد تێلێگرافی نییە چاوەڕوانی وەسیلە دەکەم بچمە میاندواو و بەسەرهاتەکەتان بەدووروودرێژی بەعەرز بگەیێنم. ئەفشار پەنا ".

"تێلێگرافی قەرەنی ئاغای مامەش لە سندووسەوە ١ / ١٢ / ١٣٢٣ شەقامی سەعدی چوار ڕێیانی سەید عەلی، کۆڵانی تێلێگرافخانە ژمارە ١٠ بەڕێگای کوڕم عەزیز[١] جەنابی ئاغای فەهیمی وەزیری ڕاوێژکار. بۆ ئاگاداری بەعەرزتان ڕادەگەیێنم ڕۆژی ٢٦ / ١١ / ٢٣ کەسێک بەنێوی عەزیزخانی بەگزادە ئامۆزای ئەحمەد خان[٢] کە ئەویش یەکێک لە هاوکارانی محەمەد ڕەشیدی بانە بووە کە ئێستا لە خاکی عێراقدایە، لە مهاباد دژی دەوڵەت و کاربەدەستان نوتقێکی کردووە و حەشیمەتێکی زۆری لە لاتولووتی مهاباد لە دەوری خۆی کۆ کردووەتەوە و پەلاماری ئیدارەی شارەبانیی مهابادی داوە، پێنج کەس لە پاسەوانەکانی کوشتووە و ئیدارەی شارەبانیی تاڵان کردووە و دەیەویست سەبارەت بەفەرمانداری مهاباد و سەرۆکەکانی ئیدارە دەوڵەتییەکان هێندێک شت بکا. خۆشبەختانە هەمزاغا و حەسەن ئاغا ئامۆزایانی ئەم بەندەیە و ئێلخانی و محەمەد ئاغا برایانی عەولاغای مەنگوڕ سەرۆکی عێلی

١- مام عەزیز کوڕی گەورەی قەرەنی ئاغا بوو، لە سەرەتای پووشپەڕی ١٣٣٥ی هەتاوی لەبەر پێکدادانی ماشین لە ڕێگەی ورمێ - مهاباد مالاوایی لە ژیان کردووە.

٢- بابم دوای وشەی خان کەوانەی کردووەتەوە و تێیدا نووسیویەتی: " مەبەست (ئەحمەدخانی فارووقی) یە کە تاوانبارکرابوو بەکوشتنی سەرتیپ ئەمین لە سەقز و دوای هاتنەوەی هێزی دەوڵەت بۆ کوردستان لە مانگی سەرماوەزی ١٣٢٥، بەڕێزیان لە گەڵ دوو نەفەر لە براکانی و دە دوازدە کەس لە ئامۆزاکانی لە سەقز و بۆکان لە دار دران.

مەنگوڕ و حوسێن ئاغا ئامۆزای باپیراغا و برایم ئاغا برای عەلی خانی نەوزەڕی کە ئێستا لە نێوند (تاران)ن لەگەڵ حەمەدەمین ئاغا و قەرەنی ئاغای پیران کە بۆ کاروباری شەخسیی خۆیان لە مهاباد بوون، دەستبەجێ بڵاوەیان بەعەزیز خان و لاتولووتەکان کرد و پێشیان گرتن، و فەرماندار و داییرەکانی دیکەی دەوڵەتیان پاراست. فەرمانداریش لە ئێوارەی بەرواری ٢٦ داوای یارمەتیی لەم بەندەیە کرد لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەم بەندەیە لەلایەن دەوڵەتەوە ئەمرم پێ نەکرابوو، دەستبەجێ تەگبیری پێویستم بەجێ هێنا، فەرمانم دا بە ئاغایانی عەشیرەتەکانی مامەش، مەنگوڕ، گەورک، پیران بێت و لە لایەن عەزیز خان و لاتولووتەوە هەنگاوێکی دیکە هەڵبهێندرێتەوە بەتوندی بەگژیان دابێنەوە و پێشیان پێ بگرن، بەچەک هەڕەشەیان لێ بکەن و بیانکوژن. دەوێرم بەعەرزتان ڕابگەیێنم ئینتیزاماتی شاری مهاباد کە لە لایەن کاربەدەستانی دەوڵەت دوو ساڵ بەئەستۆی ئەم بەندەیە و ئاغایانی مەنگوڕ و گەورک بوو لەگەڵ ئەوەشدا کە پێشینەی ئەم بەندەیە لە لای کاربەدەستانی دەوڵەت ئاشکرایە دوکتور مەرزبان ئەوکاتەی پارێزگاری ڕەزائییە بوو لەبەر بەرژەوەندی شەخسیی خۆی وەزعەکەی تێک دا کە بەندە زادە عەزیز پێشینەی ئەو بەسەرهاتە دەزانێ و بەعەرزتان ڕادەگەیێنێ. ئێستا چلۆنایەتی شاری مهاباد یەکجار زۆر خراپ و ئاڵۆزە، ئەگەر بێتو کاربەدەستانی دەوڵەت هەرچی زووتر مشوورێک لە وەزعی مهاباد نەخۆن، مانەوەی کاربەدەستان لێرە ئەوپەڕی زەحمەتە و لەوانەیە ببێتە هۆی ئاڵۆزی و بشێوێنی. واژۆ: قەرەنیی مامەش ".

ئەوەی نووسەر لە ڕۆژی پەلامار بۆ سەر شارەبانیدا بەچاوی خۆم دیتم، بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی پێنج شەمۆ [1] (٢٦ / ١١ / ١٣٢٣) بەشەقامی شاپوور بەپێش خانووی ستادی سپا (شارداری ئێستا)دا تێ دەپەڕیم، تەماشا دەکەم هێندێک ڕووتەوپووتە و لاتولووت لە لای بازاڕەوە بەرەو چوار ڕێیانی پەهلەوی، ناسراو بەچوارچرا، دێن. عەزیز خانی کرمانج[2] کوڕی خودالێخۆشبوو

١– لە دەقەکەدا شەمۆ هاتووە و ئەوە هەڵەیە. دوای سەرنجڕاکێشانم لە لایەن کاک سەید محەمەدی سەمەدییەوە شەمۆ کرا بە پێنج شەمۆ و هەڵەکە ساخ کرایەوە (بژارکار – قادری فەتاحیی قازی)

٢– وێنە و کورتەیەک لە شەرحی حاڵی عەزیزخانی کرمانج لە کتێبی: " تاریخ فرهنگ و ادب موکریان " =

گەنجالّی خانی قاتانقوری بەگزادە لە پێشیانەوە دەبیندرا و وا وەبەرچاو دەهات سەرخۆش بێ.

عەزیزخان جارجار لە نێوەڕاست شەقامەکە ڕادەوەستا، هەر کە نێوبراو ڕادەوەستا، گشت حەشیمەتەکە لە دەوری کۆ دەبوونەوە. لەو دەمەدا چوار پایەیەکی دار کە یەکێک هەڵی گرتبوو، لە سەر زەوی دادەندرا و عەزیزخان دەچووە سەری و چەند وشەیەکی دەگوت و گورج لە چوارپایەکە دەهاتە خوارەوە، دوای هاتنە خوارەوەی بەڕێزیان حەشیمەتەکە وەجووڵە دەکەوتەوە. قسەکانی ئەوە بوو کاربەدەستانی ناخۆجێیی نابێ لە شاریدا بمێننەوە و دەبێ نیشتمانی ئێمە بەجێ بهێڵن، ئێمە خۆمان کاروباری خۆمان بەڕێوە دەبەین. ئەو خەڵکەی باسیان کرا هێندێکیان چەکی سارد و گەرمیان پێ بوو و هێندێکیان بێ چەک بوون. لە شێوەی ڕۆیشتنیانڕا دیار بوو بەتەواوی وروژێندراون و هەست دەکرا ڕووداوێکی ناخۆش خەریکە بقەومێ.

بەبرایەکەم حوسێنم گوت کە لە تەنیشتم ڕاوەستابوو، لەبەرئەوەی عەزیزخانی کرمانج دۆستی تۆیە و ئێستا سەرخۆشە و حاڵی ئاسایی نییە، لەوانەیە هەرا و ئاڵۆزییەک بنێتەوە، بۆیە باشترە بچییە لای و هەرچۆنێک بێ لەو خەڵکەی دوور کەیەوە و بیبەیە جێگایەک و سەری گەرم کەی، ئەیش بەڵکو ئەو ئاپۆرایە بڵاوەی لێ بکا و ڕووداوێکی ناخۆش نەقەومێ. برایەکەم حوسێن توانیبووی بچێتە لای و عەزیزخان لە نێو ئاپۆرایەکە بهێنێتە دەرێ و بیباتە شوێنێکی دی، بەڵام بەپێچەوانەی چاوەڕوانی، ئاپۆرای نێوبراو کە وروژابوون بەڕۆیشتنی عەزیزخان بڵاوەیان لێ نەکرد درێژەیان بەجووڵەی خۆیان دا دواجار پەلاماری ئیدارەی شارەبانییان دا.

لەبەر دەرگای ئیدارەی شارەبانی، پاسەوانێکی چەکداری کورد،[1] خەڵکی مهاباد، کە کێشکی دەدا کاتێک دەبینێ ئاپۆرای خەڵک مەبەستیانە پەلاماری شارەبانی بدەن، دەڵێ ئیست و وشیاریان دەکاتەوە نەیەنە پێشێ بەڵام جەماعەتەکە گوێ نادەنە هەڕەشەکەی وی و هێرش دەبەن. پاسەوانی نێوبراو دەستڕێژ دەکا لە یەکەم کەسی پەلاماردەر و کەسە

= (مێژووی کولتوور و ئەدەبی موکریان)، لاپەڕەکانی ٦٦٤ و ٦٦٦دا هاتووە. دانەری کتێب خوالێخۆشبوو میرزا برایمی ئەفخەمی لە بەرواری ١٨ / ١١ / ١٣٧٣دا ماڵاواییی لەم دیارە فانییە کردووە.

١- کاک سەید محەمەدی سەمەدی لە نووسراوەی تایپ کراوی خۆیاندا بەناوی " نگاهی بتاریخ مهاباد" (لاپەڕەی ١٢٥) ئەو کەسە وەک عەبدوڵای جەلالی (خانە خەمیری) دەناسێنێ و دەنووسێ: تا کۆتایی ژیانی لە سەقز ژیا و لە بەرواری ١٨ / ٦ / ١٣٦٤ (ی هەتاوی) هەر لە هەمان شار وەفاتی کردووە.

پەلاماردەرەکە دەستبەجێ دەکوژرێ، ئەو پێشهاتە دەبێتە هۆی ئەوە خەڵکەکە ئەوەندەی دیکەش تووڕە بن و بەگەلەکۆمە هێرش بەرن و لە دەرگا و پەنجەرەوە بچنە نێو خانووەکە و پێنج کەس لە پاسەوانەکان بکوژن. گشت ئەو ڕووداوە زیاتر لە نیو سەعاتی پێ نەچوو.

کاتێک ئاپۆرای خەڵکەکە گەڕانەوە، تەرمی کابرای کوژراوم دی کە یەکێک لە سەر کۆڵی خۆی هەڵی گرتووە. پرسیم ئەوە چ بووە؟ کورتەی ڕووداوەکەیان بۆ گێڕامەوە.

ئەمن دەستبەجێ چوومە ماڵی بابم کە لەوێ نزیک بوو و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕاوە. بەڕێزیان گوتی ئەو ڕووداوانە لەوانەیە درێژە بکێشن و ڕەنگە دەست لە ئیدارەی دوخانیات و ئەنبارەکانیشی بوەشێن و بۆ تۆ کە ئێستا بەشێوەی کاتی سەرپەرست و کەفیلی ئیدارەی دوخانیاتی، لە داهاتوودا زەحمەت و سەرئێشە ساز بێ. باشتر وایە دەستبەجێ سەرۆک عەشیرەتەکان و فەرمانداری لەو ڕووداوە ئاگادار بکەی، بەڵکو ئەوان تەگبیرێکی لێ بکەن و چارەیەک بدۆزنەوە. ئەوە بوو من چووم بۆ ماڵی عەولاغای بایەزیدی سەرۆکی عێلی مەنگوڕ کە دەستی لە پاراستنی ئینتیزاماتی شاردا هەبوو، کاتێک چوومە ژوورێ، دیتم فەرماندار و سەرۆکی شارەبانی و هێندێک کەسی دی لەوێن، وا وێ دەچوو لە ڕووداوی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە بێ خەبەرن و پێیان نەزانیوە، بۆیە زوو ڕووداوەکەم بۆ ئامادەبووان گێڕاوە و وەبیرم هێنانەوە ئیدارەکان و ماڵ و موڵکی دەوڵەت لە مەترسیدان. دوای بیستنی قسەکانی من، ئاغای سەریعولقەلەم داوای لە عەولاغا و ئاغا مەنگوڕەکانی دیکە کرد بۆ پاراستنی کەلوپەل و موڵک و ماڵی دەوڵەت و لەوانە ئیدارەی دوخانیات پیاو بنێرن و حەول بدرێ بۆ بانگکردن و گرتنی ئەوانەی ڕووداوی شارەبانییان لە دەست قەوماوە. بەدووی ئەوەدا ئاغایانی مەنگوڕ هێندێک لە چەکداران و پیاوەکانی خۆیان نارد بۆ هێنانی عەزیز خان و هێندێکیشیان ڕاسپارد بۆ پاراستنی ئیدارەکان و لەوانە ئیدارەی دوخانیات.

لە دوای نیوسەعات ئەوانەی لەگەڵ ئێلخانی برای عەولاغای بایەزیدی بۆ بانگکردن و هێنانی عەزیز خان چووبوون، هاتنەوە و عەزیز خانیش لەگەڵ ئەوان و حەوت هەشت نەفەر لە کەسان و خزمانی خۆی کە هەموویان چەکیان پێ بوو لەگەڵ ئاغایانی مەنگوڕ هاتە ژوورێ، دەرکەوت عەزیز خان بەڕەزایەتی خۆی هاتووە و نەک زۆر و تۆبزی و وادیار بوو مەبەستێتی بەرگریش لە خۆی بکا. هەستم کرد دوور نییە وتووێژی عەزیز خان لەگەڵ فەرماندار یان عەولاغای بایەزیدی ناجۆر بێ و چەپ بکەوێ و لەو ژوورە پچووکەدا پێکدادان و تەقە دەست پێ بکا بۆیە مانەوەی من لەوێ دوور بوو لە مەسڵەحەت، و لەو

فیکرەدا بووم حاجی مستەفای داودی کە ئەویش لەو مەجلیسەدا ئامادە بوو و ڕەنگە وەک منی بیر کردبێتەوە، ڕووی تێ کردم و پێی گوتم، فلانەکەس ئیدی بوونی ئێمە لێرە پێویست ناکا، باشترە بڕۆین. ئەوە بوو من و حاجی مستەفای داودی هەستاین و بەیەکەوە لە ژوورەکە دەرکەوتین.

نووسەر یەکڕاست چوومەوە ئیدارەی دوخانیات. دوای چەند دەقیقە ئەوانەی بۆ پاراستنی ئیدارەی دوخانیات دیاری کرابوون، هاتنە ئیدارە و خۆیان ناساند. چەند نەفەرم لە ئیدارە هێشتەوە و ئەوانی دیکەم نارد بۆ کێشک لێکێشانی ئەنبارەکان کە لە دەرەوەی ئیدارە بوون.

دوای نزیک سەعاتێک شار هێمن بووە وە و دەرکەوت ئەو شۆڕشە ساختە و سازدراو بووە و بەمەبەستێکی تایبەتی گاڵتە بەهەستی خەڵکی کۆڵان و بازاڕ کراوە. دەبێ بزانین ئەودەمی نرخی قەند و شەکر زۆر هەڵچوو بوو و ئەگەر هەڵە نەبم، نرخی کیلۆیەک قەند گەیشتبووە ٦٠ تمەن کە لەو زەمانیدا ئەوە دراوێکی زۆر بوو. کەسی دەستەنگ و نەدار ناچاربوون چایی بەخورما یان کشمیشەوە بخۆن. بەدوای هەڵچوونی نرخی قەند و شەکر، دەوڵەت ناچار بوو، قەند و شەکر لەڕێگای کۆپۆنەوە دابەش بکا. سەبارەت بەڕووداوی شارەبانی ئەو دەنگۆیەی بەهەروای بڵاو بووەوە ئەوە بوو: لە ئاغای حوسێنی فرووهەر ناسراو بەحوسێنی زەرگەری (زێڕینگەران) کە کاربەدەستی دابەشینەوەی قەند و شەکر بوو گوزارشت درابوو و سکالایەکی زۆری لێ کرابوو، بۆ پێڕاگەیشتن بەو مەسەلەیە هێندێک پشکنین و لێپرسینەوە کرابوو و پەروەرندەیەک ئامادە کرابوو، پەروەندەی نێوبراو لە شارەبانیی مهاباد بوو. دەڵێن هەر ئەو حوسێنی فرووهەرە لەگەڵ ژمارەیەک لە ئاغاوەت کە بەرژەوەندییان لەو بەخراپ کەلک لێوەرگرتنەدا هەبوو، بۆ لەنێوبردنی ئەو پەروەندەیەی لە شارەبانیدا بووە، لە عالەمی مەستی و سەرخۆشیدا عەزیز خانی کرمانج هان دەدەن و سمێڵی چەور دەکەن هەرایەکی ئەوتۆ لە ژێر پەردەی ئازادیخوازی و دەمارگرژی نەتەوایەتیدا بنێتەوەو بەدوی ئەوەدا پەلاماری شارەبانی بدرێ و لە ئاکامدا پەروەندەکە لە نێو بچێ.(١)

کاتێک ئەو ڕووداوە لە مهاباد قەوما، خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە سەر بانگهێشتنی

---

١- بڕوانە: نگاهی بەتاریخ مهاباد، دانەر سەید محەمەدی سەمەدی، لاپەڕەی ١٥٨، ساڵی ١٣٧٣، ئینتیشاراتی ڕەهرو، مهاباد (نووسەر هیچ باسی ئەو ڕاستییەی نەکردووە کە لەو سەروبەندەدا حوسێنی زێڕینگەران سەرۆکی کۆمەڵەی ژێکاف یش بووە، تێبینی وەرگێڕی کوردی)

دەوڵەت لە تاران بوو و ئەمن بۆ خۆم لەو خودالێخۆشبووەم بیست لەو ڕووداوە زۆر نارەحەت و بەداخ و دڵتەنگ بووە. دەبێ ئەوە بڵێم: دوای چەند ڕۆژ لە تێپەڕینی ئەو ڕووداوە، ڕۆژێکیان ئاغای میرزا قاسمی قادریی قازی[١]، کوڕی خودالێخۆشبوو قازیی قادر، خەبەری هێنا و گوتی: جەنابی قازیی لە تاران گەڕاوەتەوە و ئێستا لە دێی گوێگجەلی (موڵکی خودالێخۆشبوو ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات)[٢]ـە و بڕیار وایە بەیانی بگەڕێتەوە مەهاباد. بەگوێرەی ئەوەی بیستوومانە دژبەرەکانی بڕیاریان داوە لە ڕێیە بیکوژن، بۆ پێشگیری لە هەموو جۆرە ڕووداوێکی خراپ پێویستە ژمارەیەک تاکو دێی گوێگجەلی بچینە پێشوازی بەڕێزیان. بەو پێیە نووسەر لەگەڵ میرزا قاسمی قادری و چەند کەسی دیکە لە خزمان و دۆستان چەکمان لە خۆمان شەتەکدا دەستبەجێ ماشینی سواریمان بەکرێ گرت و بەرەو میاندواو وەڕێ کەوتین، دوای چەند دەقیقە لادان لە میاندواو، ڕێگای گوێگجەلی مان وەبەرگرت. دوای ئەوەی گەیشتینە گوێگجەلی، خودالێخۆشبوو قازیی محەمەد یەکەم پرسیاری لە نووسەری کرد، مەسەلەی پەلاماردرانی شارەبانی بوو، دوایە بەتووڕەییەوە گوتی بۆ مەهاباد پیاوی تێدا نەبوو پێش بەو ڕووداوە پڕلە پەژارەیە بگرێ؟ بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە لەگەڵ قازی گەڕاینەوە مەهاباد و ژمارەیەک لە چەکداران و نۆکەرەکانی محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازیش تاکو مەهاباد لەگەڵمان هاتن. خۆشبەختانە هیچ ڕووداوێکی خراپ نەقەوما.

تا کۆتاییەکانی ١٣٢٢ی هەتاوی هیچ جۆرە جووڵانەوەیەک کە نیشانەی گوێڕایەڵی نەکردنی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە نێوەند بێ، نەبیندرابوو و نێوانی بەڕێزیان لەگەڵ دەوڵەتی نێوەندی زۆر خۆش بوو، بەچەشنێک هەرکاتێک لە لایەن کاربەدەستانی کاروباری وڵاتەوە بانگ دەکرا بۆ تارانێ، دەستبەجێ سەفەری دەکرد بۆ نێوەند و، جارجاریش بێ ئەوەی بانگی بکەن، دەچوو بۆ تاران و لەوێ چاوی بەکاربەدەستان دەکەوت و متمانە و سرنجی کاربەدەستانی بەتەواوی بەرەو لای خۆی ڕاکێشابوو، بەشێوەیەکی ئەوتۆ خزمەتەکانی بەڕێزیان بۆ پاراستنی ئینتیزاماتی هەرێمی مەهاباد لە لایەن محەمەد ڕەزاشای پەهلەوییەوە تەقدیری لێ کرا و لە لایەن شاوە ئەنگوستیلەیەکی ئەڵماسی درایە

١- میرزا قاسمی قادریی قازی یەکێک لە دامەزرێنەرانی کۆمەڵەی ژ.ک. بوو (تێبینی وەرگێڕی کوردی)

٢-لەو بەرواره دا چەند مانگێک دەبوو سەیفولقوزات مالاوایی لە ژیان کردبوو.(سەیفولقوزات لە ٧ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٢ هەتاوی کۆچی دوایی کردووە و پەلامار بۆ سەر شارەبانی مەهاباد ٢٧ی ڕێبەندانی ١٣٢٢ ڕوویداوە، واتە ٢٠ ڕۆژ دواتر، تێبینی وەرگێڕی کوردی)

که بەڕێگای سپەهبود جەهانبانییەوە ناردرابوو.

سپەهبود جەهانبانی لەگەڵ ژمارەیەکی بیست سی کەسی (ژاندارم) بەماشین لە ورمێ وە هاتە مهاباد و میوانی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد بوو. نووسەر لەو دەمەدا وەزعییەتێکم بینی زۆرم پێ سەیر بوو و ئەویش ئەوەبوو: بۆ بەیانی ئەورۆژەی سپەهبود جەهانبانی هات بۆ مهاباد، ئەو ژاندارمانەی لەگەڵی بوون بۆ کڕینی ئەو شتانەی پێویستییان پێی بوو، دەبوو بچنە بازاڕی، بەڵام نەیاندەوێرا بچن. لێرەدا پێویستە هێندێک بگەڕێمەوە دوایە و بڵێم مەئموورەکانی ژاندارمەری لە سەروبەندی دەستەڵاتی ڕەزا شادا، بۆ ئەوەی بەتۆپزی خەڵک دابدۆشن و دراویان لێ بستێنن زۆر خراپ لەگەڵ خەڵک دەجووڵانەوە و لە هیچ جۆرە کردەوەی پیس و ئازار و جەربەزەدانێک و قسە هەڵبەستن و پەروەندەی درۆ بۆ خەڵک سازکردن دەستیان نەدەگێڕایەوە، ئەوان زۆر بنەماڵانیان بە با دا و تاکوتەرای بێ سووچ و تاوانیان خستە گۆشەی زیندانەوە یان لە داریان دان. نووسەر چیرۆکی زۆرم لە زوڵم و زۆری ئەمنییان بیستووە و دیتووە کە گێڕانەوەی هەموویان دەبێتە هۆی درێژبوونەوەی قسە و سەری خوێنەوەرانی پێ وەژان دێ، بۆیە لێرەدا هەر تەنێ نموونەیەکی بچووک لە کاری ئەمنییان دەگێڕمەوە:

ساڵی ١٣١٦ی هەتاوی نووسەر لە نەغەدە نێوەندی سندووس مەئمووری دوخانیات بووم، هەر لەو ساڵەدا یان ساڵێک دواتر، دەوڵەتی ئێران هێندێکی گەنم بەدەوڵەتی ئیتالیا فرۆشتبوو.[1] ئەو گەنمانە بە کامیۆن بەڕێگای سندووس، لاجان، مامەش، خانێ (پیرانشاری ئێستا) دەبردرا بۆ وڵاتی عێراق و لەوێوە بەڕێ دەکرا بۆ ئیتالیا. ڕۆژێک لە نەغەدە دەنگوباسێک بڵاو بووەوە لە سنووری ئێران و عێراق ڕێگران ڕێیان بەیەکێک لە ئاژۆرەکان گرتووە و بڕێکی کەمیان پارەی نەغد لێ ئەستاندووە. ئاژۆری نێوبراو ئەو ڕووداوە بەسەرپەرستی خۆی دەڵێ و سەرپەرستەکەش بە کەسی ژووردەستی خۆی و دواجار باڵوێزی ئیتالیا لەو ڕووداوە ئاگادار دەکەن. باڵوێزی نێوبراو ئەو بەسەرهاتە بەگوێی وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران دەگەیێنێ و وەزیری کاروباری دەرەوەش ڕەزا شا ئاگادار دەکا. ڕەزا شا بە زانینی ئەو ڕووداوە کە پێوەندیی بەدەوڵەتانی بێگانەوە بوو، زۆر تووڕە دەبێ و فەرمان دەدا بێتو لە ماوەی ٤٨ سەعاتدا دزەکە نەبیننەوە و سزای نەدەن

١- بابم بەدووی ئەو ڕستەیەدا لە نێو کەوانەدا لێی زیاد دەکا: (ئەو دەمی جگە لە دابینکردنی بەکارهێنانی نێوخۆیی، غەلە بۆ دەرەوەی وڵاتیش دەنێردرا، بەپێچەوانەی هەلومەرجی ئێستا کە هەموو ساڵێ گەنمێکی زۆر بەنرخی گران لە دەرەوەڕا دێتە نێو وڵات).

له پێشدا تەشکیلاتی ئەمنییە (ژاندارمەری) لە سەرتاسەی ئێران هەڵدەوەشێنێتەوە، دووەم گشت کاربەدەستانی پێوەندیدار کە لە شوێنی قەومانی ڕووداوەکەدا پاراستنی هێمنییان بەئەستۆوە بووە بەتوندی سزا دەدا. فەرمانی ڕەزا شا ئەولاو ئەملای نەبوو، هەرچی دەیگوت دەبوو جێبەجێ بکرێ. مەسەلەکە لە لایەن ئیدارەی گشتیی ژاندارمەرییەوە بەیەکەکانی ژاندارمەری ورمێ، نەغەدە، مهاباد و خاڵەکانی دیکەی سنووری ئەو هەرێمە ڕاگەیێندرا و جەخت کرایەوە بێتو دزەکە نەبیندرێتەوە، چارەڕەشییەکی گەورە تووشی هەموو مەئموورەکانی ژاندەرمەری دێ. ئاشکرایە لێپرسراوانی ژاندارمەری ئەو شوێنانەی نێوبراو وەحەولەوەلا کەوتن بۆ ئەوەی بەجۆرێک ئەو گرێیە بکەنەوە، چونکو دەیانزانی گرتنی دزەکە لە چیاکانی سنووری ئێران و عێراق کە درێژاییەکەی سەدان فەرسەخە، و لەو کوێستانە بەرز و دۆڵ و دەرە قووڵ و چۆلەدا کە جگە لە ئاژەڵی کێوی چ زیروحێکی دیکەی تێدا نازی محاڵە، با ئێستا پاشماوەی چیرۆکەکە لە زمان ئیستیواری یەکەم س - د[1] سەرۆکی ئۆفیسی ژاندارمەریی نەغەدە ببیسین کە من بۆخۆم بەشەخسە لەوم بیستووە: لە ئاست فەرمانی ڕەزاشادا وڵامی نێگاتیف محاڵ بوو. دوای پرس و بیرورا گۆڕینەوە لە نێوان فەرماندەکانی ژاندارمەریی هەرێم، بڕیار درا هەرچۆنێک بێ دزێکی بەقەستی پەیدا کەین و بیناسێنین و لەبەرئەوەی پێویست بوو ڕێگرەکە کەسێکی نەناسراو و بەپێی دەرفەت خەڵکی کوردستانی عێراق بێ، بەو پێیە، قورعەی فاڵەکە بەنێوی مەلایەکی بێچارە لە خەڵکی کوردستانی عێراق دەرکەوت. نێوبراو بەوەرگرتنی تەزکەرە (پاسپۆرت) لە سنووری نەغەدە و لاجانی مامەشەوە هاتبووە نێو خاکی ئێران بۆ ئەوەی قەرزەکانی پێشووی خۆی وەربگرێتەوە. ئەگەرچی نێوبراو پیاوێکی بەئیمان و نوێژکەر و بەستەزمان و مەزلووم و بەرێژە پیریش بوو، بەڵام بۆ پێشگیری لە توورەیی و غەزەبی ڕەزاشا پێویست بوو ئەو مەلا چارەڕەشە قوربانی بکرێ. بۆیە دەستبەجێ بەتێلێگراف، ژاندارمەری گشتیمان ئاگادار کرد لەسایەی جیددییەت و خۆ بەختکردنی شەو و ڕۆژی تاکوتەرای ژاندارمی سەر سنوور، دزەکە گیراوە و ئێستا لە ژێر لێکۆڵینەوە و محاکەمە دایە. بەو پێیە پێش بەهەڵوەشانەوەی تەشکیلاتی ژاندارمەری و توورەیی و غەزەبی ڕەزا شا گیرا.

کاتێک باسی چارەنووسی ئەو مەلا بێچارەیەم لێ پرسی، لە وڵامدا گوتی: پەروەندەکەمان تەواو کرد و ناردمانە ورمێ و لەوێ حوکمی ئیعدامیان دا و دواجار بێ سووچ و تاوان تیربارانیان کرد. ئەمن لە بیستنی خەبەری ئەو مرۆکوژی و بێ بەزەییە زۆر

---

[1] - بابم ئەو کەسەی هەر بەو شێوەیە ناساندووە.

دڵپەشێو بووم و پرسیم باشە چۆن ئەو چارەڕەشەیان حوکم دا؟ شاهید و هۆ و بەڵگە چ بوو؟ لەوڵامدا گوتی ئەوانەمان هەموویان ساز کرد، بەدانی بڕێک بەرتیل بەو ئاژۆرەی کەوتبووە بەر هێرشی دزەکان[1] پێملیان کردبوو بڵێ ئەو دزەی دراوەکانی وی بردووە هەر هەمان ئەو مەلایە بووە و جگە لەوە چەند نەفەر تریاکی و شیرەکێشیان بەدراوێکی کەم ڕازی کردبوو شاهیدی بدەن ئەو مەلایە زۆرجار ڕووتی کردوون و پێشینەی دزێتی و ڕێگریی هەیە. بەو پێیە کەسێکی بێ سووچ و تاوان بوو بە فیدای ساختەکاریی مەئموورەکانی تەشکیلاتی ژاندارمەری.

بە لەبەر چاوگرتنی ئەو پێشینەیە بوو ژمارەیەکی بیست کەسی لە ئەمنییەکان نەیاندەتوانی بەڕۆژی ڕووناک لە ماڵی خودالێخۆشبوو قازی محەمەدەوە تا بازاڕی مهاباد کە مەودایەکی ئەوەندە زۆریان نییە، بچن بۆیە دوو نەفەر لە چەکدارانی خۆجێیی ژاندارمەکانیان بەدوو ڕیز دابەش کرد و لەگەڵ خۆیان بردیانن بۆ بازاڕ، و دوای کڕینی پێداویستییەکانیان، زەق و زیندوو گەڕاندیاننەوە ماڵی قازی محەمەد. ئەمن کە ئەوەم بەچاوی خۆم دی ئەو ئایە شەریفەم هات دە مێشکییەوە کە دەفەرموێ: " تعز من تشاء و تذل من تشاء" لە دڵی خۆمدا گوتم خودایە گەورەیی و عێزەت تەنێ بۆ تۆیە. لە سەردەمی ڕەزا شادا تاقە ئەمنییەک بەس بوو بەتەنێ مهاباد و بگرە هەموو کوردستان ڕاتڵەکێنی. بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە ئەگەر ئەمنییەک هاتبا ناو ئاوەدانییەکەوە، گشت دانیشتوانی دێیەکە لە ترسان خۆیان دەشاردەوە و ڕایان دەکرد بۆ کێو و سەحرا. بەڵام ئێستا ژمارەیەکی بیست سی کەسی بەڕۆژی ڕووناک ناوێرن بەبێ پاسەوان لە شارێکی هێمن بەسەر شەقامدا بڕۆن و بەدانی دراوی نەغد پێداویستییەکانی خۆیان لە بازاڕ دەکڕن.

بەکورتی تا ئەو سەروبەندە هیچ جۆرە دەنگ و هەرایەکی دژی بۆچوونەکانی کاربەدەستان، لە مهاباد، بەڕواڵەت لە گۆڕێدا نەبوو. خودالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی برای پچووکتری قازی محەمەد وەک نوێنەری خولی چاردەهەمی مەجلیسی شووڕای میللی لە مەڵبەندی مهاباد هەلبژێردرابوو و لە تاران دادەنیشت. خەلیلی فەهیمی، وەزیری ڕاوێژکاری ئەو سەروبەندی لە گوزارشتێکدا کە پێشکێشی مەجلیسی شووڕای میللیی کرد، سەبارەت بەو شتانەی لە سەفەری خۆیدا بۆ کوردستان دیبووی لەمەڕ بارودۆخی مهاباد و قازی محەمەد ڕەزایەتی خۆی دەربڕیبوو. بۆ ئاگاداریی زیاتری خوێنەرەوان بەشێک لە

١- بە دووی ئەو ڕستەیەدا بابم لە نێو کەوانەدا دەنووسێ: " تەماشای کاری خوڵای کە ئەمنییە لە هەموو کەس بەرتیل دەستێنێ، بەڵام ئەگەر خوا بیەوێ دەبێ ئەو بەرتیل بدا بەخەڵکی تر.

قسەکانی بەڕێزیان کە لە ژمارەی ١ی ڕۆژنامەی (کوهستان)، لە بەرواری دووشەمۆ حەوتی مانگی ڕەشەمەی ١٣٢٣دا بلاو کراوەتەوە لە خوارەوە دەگێڕینەوە. (کوهستان) ڕۆژنامەیەک بوو کە لەتاران دوکتور سمایلی ئەردەلان بلاوی دەکردەوە.

"بەڵام لە مەڕ سەبەبی سەفەری من، لە کابینەی ئاغای ساعیددا، شەوێک سەرۆکی ستادی ئەرتەش ئاغای سەرتیپ ڕەزم ئارا تەشریفیان هێنا بۆ هەیئەتی وەزیران، بەئامادە بوونی ئاغای ساعید و بەندە و ئاغای سرووری وەزیری نێوخۆ، ڕاپۆرتێکی زۆر دوور و درێژی خوێندەوە کە مەئموورێک لە مهابادەوە ناردبووی، بەکورتی ئەوەی هەرێمی مهابادی کوردستانی وەکو یەک پارچە ئاور و جیابووەوە لە دەوڵەتی ئێران ناساندبوو. سەرۆکی ستادی ئەرتەش نێوی چەند کەسیشی هێنا کە ئەوانەن بوونەتە هۆی ئەو بارودۆخە کە دیارە من لەگەڵ هێندێک لەوان پێشینەیەکی زۆرم هەبوو و لە مێژ بوو دەمناسین یەکێک لەوان قازی محەمەد بوو. ئاغای قازی محەمەد کەسێکی بەڕێزە کە لە ڕووداوەکانی خەرماناندا کە بەندە چوومە ئازەربایجانێ، بۆ خۆی تفەنگی خستبووە سەرشانی و لەگەڵ ژمارەیەک لە کەسوکاری خۆی مهاباد و ئەو مەڵبەندەی دەپاراست. پاشان لە مەسەلەی ڕەزائیەدا بەندە بەڕێزیان و سەید عەبدوڵا نەوەی شێخ عەبدولقادرم[1] ڕائەسپارد: یەکیان لە لای باکوری دەریاچە و ئەویدییان لە باشووری دەریاچەوە چوون و کۆتاییان هێنا بەبارگرژی و تەنگژەکان و پاشان خزمەتی تریشیان کرد و دوایە بەیەکەوە هاتنە تاران و کاری ئەوتۆیان کرد کە بەندە هیچ ناتوانم لە نیشتمانخوازیی ئەوان دوودڵ بم".[2]

کاتێک پێشڕۆیی دەستەیەک لە هێزەکانی دەوڵەتی لە ژێر فەرماندەریی سەرگورد خاکسار کە بەرێگای سەقز - بۆکاندا بەرەو مهاباد دەهاتن، لە لایەن هێزە شوورەوییەکان لە ڕێگایە، لە دێی قەرەمووسالیان ڕاگیرا و ئەوان ناچار کران بگەڕێنەوە، بیروڕای گشتی خەڵک بۆ پاراستنی بوونی خۆیان بمانەوێ و نەمانەوێ سەرنجی خۆی دا سەر تاقە نێوندی دەستەڵات، واتە ڕووسەکان، چونکو ئەو دەمی ڕووسەکان لە هەرێمدا تەواو بەدەستەڵات

---

١- خوالێخۆشبوو حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەندی کوری شێخ عەبدولقادر بووە نەک نەوەی بەڕێزیان. بیرەوەرییەکانی خەلیل فەتاحی قازی، لاپەڕەی (١). بەرواری کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو حاجی سەید عەبدوڵا ئەفەندی (گەیلانیزادە)، سەرەتای مانگی پووشپەڕی ١٣٤٦ی هەتاوی بووە.(سەرەتای مەنزوومەی کوردیی شێخی سەنعان، لاپەڕەی ١٤). ئەو ڕەقەمی __ لە " ژیناوەری" لاپەڕەی ٧١١ دا دراوە، کۆچی دوایی بەڕێزیانی بە هەڵە ٣ ساڵ هێناوەتە پێشێ.

٢- کۆتایی گوزارشتی ئاغای خەلیلی فەهیمی

بوون و لەبەرئەوەی لەگەڵ خەڵک بەباشی جووڵابوونەوە لە نێو بیروڕای گشتیدا خۆشەویست بوون. مەئمووری تایبەتی ئەوان سەروان عەبدوڵلائۆف بەڕواڵەت لە ژێر پەردەی کڕینی ئەسپ و بارهەڵگر هەمیشە لە نێوان مهاباد - بۆکان - سەقز - سندووس و میاندواو لە هاتوچۆ دابوو. نێوبراو بەڕواڵەت لەسەرەتاوە هیچ دەستی لە کاروبارەکان وەر نەدەدا، بەڵام ئەوکاتەی لەشکری ئاڵمانیی هیتلێری لە رووسیە هێندێک شکا و لاوازی ئەرتەشی ئاڵمان ئاشکرا بوو، ئەفسەری نێوبراو کەم کەم دەستی کرد بەچالاکی تەقریبەن ئاشکرا لە بەرژەوەندی سیاسەتی شوورەوی و حیزبی توودەو لە ژێر پەردەدا، خەڵکی نەدار و پاپەتی لە دەوری خۆی کۆ دەکردەوە و بە دژی خاوەن موڵکان و سەرمایەداران و دەستگای دەوڵەت تەبلیغ و بانگەشەی بۆ دەکردن و ئەگەر کەسێک ویستبای پێشی پێ بگرێ دەکەوتە بەر هەڕەشە و گوڕەشەی. لە ئاکامی ئەو دنەدان و ورووژاندنانەدا بارودۆخی ئینتیزاماتی مهاباد کە تا ئەوکاتی بە پێی بڕیاری کاربەدەستانی دەوڵەت، لە ژێر چاودێریی سەرۆک عەشیرەتەکان (قەرەنی ئاغای مامەش ئاغای دێی پەسوێ و عەولای بایبراغای مەنگوڕ)دا بوو تەقولەق بوو.

لەو سەرویەندەدا حیزبی توودە لە زۆربەی ناوچەکانی وڵات، بەتایبەتی ئەو شوێنانەی وا لەلایەن هێزی شوورەوییەوە داگیر کرابوون، بەهێز بووبوو و ڕێکخراوەیەکی بەرینی دامەزراندبوو، ئەو حیزبە ڕاستەوڕاست دەستی لە کاروباری ناوچەیی وەردەدا و کاروبارەکانی بەدڵی خۆی جێبەجێ دەکرد. لە کردەوەی مەئموورەکانی ئینتیزاماتی دەوڵەتی، جگە لە نێوێکی هڵۆڵ و نێوبەتاڵ نەبێ هیچ نەدەبینرا. لە مهاباد پاسەوانانی ڕەسمیی ئیدارەی شارەبانی ناچاربوون جلوبەرگی خۆجێیی کوردی دەبەر کەن یان هەر نەبێ لە جیات کڵاوی ڕەسمی، پێچ و کڵاوی کوردی لە سەر کەن و ئەوەش هەتابڵێی گاڵتەجاڕی و جێی پێکەنین بوو. پاسەوانەکان بەو سەروقەلافەتە دەیانەویست هەستی بەزەیی خەڵکی لە ئاست خۆیان ببزوێنن و ببنە هاوڕەنگی جەماعەت بۆ ئەوەی کەس پێیان هەڵنەکاڵێ. هەڵبەت ئینتیزامات و پاراستنی شاری و ئیدارەکانی دەوڵەت هەر وەک پێشوو بەدەست دانیشتوان خۆیانەوە بوو.

لە کەشوهەوایەکی ئاوادا حیزبێکی سیاسیی دیکە بەناوی " ژ.ک." واتە ژیانی کورد، کە لایەنگری سەربەخۆیی کوردستان بوو و گۆیا نێوەندی وی لە پاریس بوو و وەک دەیانگوت لە عێراق و سووریە و ترکییەش لکی هەبوو، بەنهێنی و لە بن پەردەدا، بەڵام بەو پەڕی جیددییەتەوە دەستی بەچالاکی و بانگەشە کرد و چەند بڵاوکراوەیەکیشی بەناوی "

نیشتمان" و " گەلاوێژ" بڵاو دەکردەوە و لەبەرئەوەی مەرامی ئەو حیزبە وەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان لە ژێر ئاڵای ئیسلامەتیدا بوو و ڕێزی لە خاوەن موڵکێتی و سەرمایەداری دەنا، چ بەرهەڵستێک بۆ پەرەئەستاندنی لە گۆڕێدا نەبوو و لە ماوەیەکی کورتدا لایەنگرێکی یەکجار زۆری لە نێو خاوەن موڵکان و خەڵکی ناسراوی کوردستاندا پەیدا کرد و ژمارەیەکی زۆر قۆڵیان لە سەر ئەندامەتیی ئەو حیزبە کێشا و سوێندی وەفادارییان بۆ خوارد. هەرکەسێک چووبایە نێو ئەو حیزبەوە، پێویست بوو سوێند بخوا. سوێند خواردن بەقورئانی مەجید بوو لە سەر پارچەیەکی مەخمەری سووریان دادەنا کە وێنەی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی سەرداری بەناوبانگی ئیسلام و سەرکەوتووی ناسراوی شەڕی چەلیپایی بەسەرەوە بوو و لە ژێر پارچەکەشدا نەخشەی کوردستان داندرابوو. کەسێک کە دەبوو بەئەندامی ئەو کۆمەڵەیە، پێویست بوو حەوت جار بڵێ: بەحەقی ئەو قورئانەی کە کەلامی ئیلاهییە و لە لایەن خواوەندی شوێنبەرزەوە بۆ ڕزگاریی بەشەر بۆ پێغەمبەرەکەی مەحەمەدی مستەفا (دروودی خودای لە سەر بێ) هاتووەتە خوارێ و بەشەرەف و گەورەیی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی و ئاڵای پیرۆزی کوردستان، هەموو پیاوی کوردی دنیا بەبرا و هەموو ژنانی کورد بەخوشکی خۆم دەزانم و بەهیچ تاکێک لە تاکوتەرای کورد بەبێ ڕێزپەڕ خیانەت ناکەم، مەگەر ئەو کەسانەی کە خیانەتیان بەم کۆمەڵەیە سوور بووبێتەوە و تا دوایین هەناسە بەگیان و ماڵ ئامادەی فیداکاری دەبم و ڕێزگرتن و گوێڕایەڵی لە حوکمەکانی قورئان و شەریعەتی پاکی ئیسلام بەپێویست دەزانم.

لەبەرئەوەی کوردەکان لە ڕووی مەزەبەوە تا ڕادەیەک دەمارگرژن و لە ڕابردوودا خەڵکی کوردستان لە دەست هێندێک حاکمی ناساڵحەوە ئازار و زوڵم و زۆرییەکی زۆریان چێشتبوو، بۆیە بەتەواوی پێشوازییان لەو کۆمەڵەیە کرد، وەک پێشتر گوترا لە ماوەیەکی کەمدا زۆربەی (خەڵکی) مهاباد و ژمارەیەکی بەرچاو لە عەشیرەتەکان و کەسانی بەنفووز لەو حیزبەدا نێونووسییان کرد و سوێندی وەفادارییان بۆ خوارد. لە ماوەیەکی کورتدا بانگەشە و تەبلیغاتی کەم کەم ئاشکرا بوو.

ڕووسەکان لە سەرەتاوە سەبارەت بەو حیزبەڕەشبین بوون و بەتوندی دژایەتییان دەکرد و لەبەرئەوەی پێیان وابوو نێوەندی ئەو کۆمەڵەیە لە عێراق و یان سووریا و ترکییەیە، ئەویان بەدەسکەلای سیاسەتەکانی دنیای سەرمایەداری و بەتایبەتی ئینگلیزییەکان دەزانی و هەبوونیان بەزەرەری بەرژەوەندی خۆیان دادەنا، بۆیە بەتوندی دژی بوون. دوای ماوەیەک

ڕووسەکانیان تێ گەیاند ئەو کۆمەڵەیە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئینگلیز یان دەوڵەتەکانی تردا نییە و تەنها بەمەبەستی وەدەستهێنانی ئازادی بۆ کوردستان، بەدەست ڕووناکبیرانی کورد پێک هاتووە و دەستی بەچالاکی کردووە و بێتو ڕووسەکان بیانەوێ یارمەتییان پێ بکەن، ئەوان ئامادەن کۆمەک و یارمەتییەکانیان بەسپاسەوە وەربگرن. ڕووسەکان لێ بڕان لەو هەلکەوتە بەقازانجی خۆیان کەلک وەربگرن، بۆیە جگە لەوەی ئیدی دژایەتیی ئەو حیزبەیان نەکرد، بەڵکو بەنهێنی حەولی ڕاهێزاندن و پشتیوانی لێکردنیشیان دا و لەبەر ئەو کۆمەڵەیە بەڕواڵەت دەستیان لە بە هێزکردنی حیزبی توودە لە کوردستان پاراست، چونکو بەباشی دەیانزانی حیزبی توودە لە کوردستان لە بەرانبەر حیزبی (ژ.ک)دا کە حیزبێکی نەتەوەیی بوو، قۆڵی لەسەر سەرمایەداری و مەزەب و خاوەن مولکێتی دەکێشا، برەوێکی نابێ و باشترە جارێ لەگەڵ کۆمەڵە بێنە ڕەدایێ و بەرە بەرە لە ڕێبازی ڕاستەقینەی خۆی بەقازانجی مەڕامی کۆمۆنیستی لای دەن، و هەر واشیان کرد و لەبەر ئەو هۆیە بوو کە کۆمەڵەی ناوبراو لەبەریەک هەڵوەشا و لە نێوچوو.

هەر وەک پێشتر ئاماژەم بۆ کرد، لە مانگی خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاویدا ئێران بەدەست قوشوونی بێگانە داگیرکرا و ئینتیزاماتی وڵات لەبەریەک هەڵوەشا و تێکەولێکەیی و ناهێمنی باڵی بەسەر هەموو ناوچەکانی ئێران و لەوانە کوردستاندا کێشا. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لەگەڵ ئەوەشدا پیاوێکی زۆر ئازادیخواز بوو، تەنانەت لەو بارودۆخ و هەلومەرجانەشدا کە ئاماژەمان پێ دا، لەگەڵ دەوڵەتی نێوەندی پێوەندیی باش بوو، هەروەها خزمەتی زۆر جێی سرنجی بۆ پاراستنی نەزم و هێمنیی مهاباد و دەوروبەری و هەروەها پاراستنی کەلوپەل و ماڵ و دارایی دەوڵەت لە هەمان شاردا ئەنجام دا و نەهێشت ماڵ و داراییی دەوڵەت تەخشان پەخشان بکرێ و هەڵلووشرێ، جگە لەوە ئەو بشێوی و نائارامییانەی لەدەوروبەری ورمێ لە لایەن عەشیرەتەکانی ئەو ناوچانە بەرپا کرابوو، خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لەگەڵ حەزرەتی حاجی شێخ سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی، بەڕێگای کەیخوایەتیدا دای مرکاندنەوە. هەروەها خوداڵێخۆشبوو قازیی محەمەد پێشی بە حەمە ڕەشید خانی بانە گرت بێتە نێو مهابادەوە. جێی ئاماژەیە حەمەڕەشید خان، کوڕی قادرخان بەبنەچەکە ئێرانییە و لە خانەکانی دەوروبەری بانەیە، لە دەوروبەری بانە هێندێک دێی هەیە، نێوبراو لە سەردەمی سەڵتەنەتی ڕەزا شادا ڕاپەڕی بوو کە دواتر لە بەرانبەر سوارەی عەشیرەتە کوردەکان لە زەمانی فەرماندەیەتیی سەرلەشکر عەبدوڵڵاخانی تەهماسبیدا تێک شکا و ناچار ڕای کرد بۆ عێراق و پەنای برد بۆ

عەشیرەتەکانی کوردیی عێراقی کە خزمایەتیی لەگەڵیان هەبوو و بۆماوەیی درێژ لە نێو ئەواندا دەژیا. حەمە ڕەشید خان لە دوای خەرمانانی ساڵی ۱۳۲۰ ژمارەیەک سوار و پیادەی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و چەند جار هەڵی ئەشکاوتە سەر سەقز و هێزی دەوڵەتی شکاند و ژمارەیەک سەرباز و ئەفسەر و لەوانە سەرلەشکر (ئەمین)ی کوشت، دوای ئەو کارانە بە هێزێکی چەکداری دوو سێ هەزار کەسییەوە بەرەو مهاباد وەڕێ کەوت. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد هەروەک پێشتر گوترا، هەرکە بەجووڵانی حەمە ڕەشیدخانی زانی بەرەو مهاباد، ڕووبەڕووی بووەوە و لەدێی خەلیفان لە مەحاڵی یەڵتەمری مەنگوڕ، شەش حەوت فەرسەخیی مهاباد، چاوی پێی کەوت و ئاگاداری کردەوە بۆی نییە بەو هەموو حەشیمەتە زۆرەوە بێتە نێو مهاباد و ئەگەر بیەوێ بە تۆبزی بێتە نێو مهاباد، هەر لێرە چەکدارانی مهابادی بەرەوڕووی دەبنەوە. حەمە ڕەشید خان کە پیاوێکی بە ئەزموون بوو و سارد و گەرمیی ڕۆژگاری چێشتبوو، کاتێک لە بارودۆخەکە تێگەیشت، هەر لە خەلیفانەوە لەگەڵ سوارەکانی بەرەو بانە کشایەوە. بەو پێیە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد پێشی بەهاتنی حەمەڕەشیدخان بۆ مهاباد و لەڕاستیدا پەلاماری وی گرت. پاشان دوای دامەزرانی کۆماری مهاباد، حەمەڕەشید خان گوێڕایەڵی لە قازی محەمەد کرد و هاوکاریی لەگەڵ کرد و لەلایەن قازی محەمەدەوە پلەی ژەنەراڵیی درایە و هێندێک چەکیشی درایە بەڵام نێوبراو دوای وەرگرتنی چەکەکان گەڕاوە عێراق و کەمترین هاوکاریشی لەگەڵ قازی محەمەد نەکرد.

دوای ئەنجامدانی ئەو خزمەتانە، شا بەڕێگای سپەهبود جەهانبانیڕا ئاڵقەیەک ئەنگوستیلەی ئەڵماسی بۆ قازی محەمەد نارد. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، هەرکاتێک لە لایەن کاربەدەستانی کاروبار [ی وڵات] ڕا بانگهێشتن دەکرا بۆ تاران، دەستبەجێ دەچوو بۆ ئەوێ و یان ئەوەی جارجار بەپێی بڕیاری خۆی سەفەری تارانێی دەکرد و چاوی بە شا و کاربەدەستانی پایەبەرزی دی دەکەوت و ئەوانیش ڕێز و حورمەتیان لێ دەنا. یەکێک لە سەفەرەکانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە کۆتاییەکانی ساڵی ۱۳۲۳ ی هەتاویدا کرا. بەهەڵکەوت لەو سەفەرەدا زۆری پێ چوو. کاتێک خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە تارانەوە گەڕاوە بۆ مهاباد، دیتی بارودۆخ لە نەبوونی ویدا بەتەواوی ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە، بەو مانایە دەستەیەک لاتولووت پەلاماری شارەبانییان داوە، چەند پاسەوانیان کوشتووە و دەرکە و پەنجەرەی شارەبانییان دەرهێناوە و شکاندوویانە. وردە ڕیشاڵی ئەو ڕووداوەم پێشتر گێڕاوەتەوە. لەلایەکی دیکەوە کۆمەڵەی (ژ.ک.) بە تەواوی

دەسـتـەڵاتی بەدەسـتـەوە گرتووە و بەپشـتـیـوانیی مـەعنەویی ڕووسـەکـان، بە سـەر باروذوخـەکـەدا زاڵە. لە لایەکی دیکەوە عـێلی بارزانی لە ژێر قـیـادەی مـەلا مـسـتـەفـای بارزانیدا بەهێـزێکی چەکداری دوو هەزار نەفـەرییەوە و هەرئەوەندەش ژن و منداڵ و پیرە پیـاو، دوای زنجیـرەیەک شـەڕی خوێناوی لەگـەڵ ئەرتەشی عـێراق کـە وردە ڕیشـاڵی ئەو شـەڕانە لە کـتـێبی (ڕازەکـانی بارزان)دا لەلایەن دوکـتـور سـمـایلی ئەردەڵانـەوە بەچڕوپڕی نووسـراوە، ڕایان کـردووە بۆ خـاکی ئێـران و ڕژاونەتـە کـوردسـتـانی ئێـران و پەنـایان هێناوە.(١)

ئەو لافـاوی ڕووداوانە، بەتایبـەتی زاڵبـوون و دەسـتـەڵاتی حـیـزبی (ژ. ک.) بەسـەر باروذۆخەکەدا، بیەوێ و نەیەوێ خودالێخۆشبوو قازی محەمەدی هێنایە نێو شەپۆلی توندی سیاسییەوە. قازی محـەمەد دەبینێ حیزبی (ژ. ک.) بەتەواوی بەسەر باروذۆخەکەدا زاڵە و بەهێـزە و ڕووسـەکـانیش لەبنەوە لەگـەڵی ڕێکن، بۆیە دژایەتیکردنی نالوێ و ئەگـەر بیەوێ بێلایەن بمێنێتەوە ناچار دەبێ لە کەسانی بچووک و نەناسراو کە سەرۆکایەتیی کۆمەڵەیان بەدەسـتـەوە بوو، پێـڕۆی بکا و لە ژێر فـەرمـانیـاندا بێ، یان ئەوەی دەبێ یار و دیار بەجێ بهێڵێ بچێتە شارێکی دی یان تاران، هەروەک چۆن زۆربەی کـەسـانی دەوڵەمـەند کردیان، لەوانە عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد و محـەمەد ئاغای عـەبباسی ئاغای دێی سەرا کە ڕەوتی باروذۆخی ناوچەیان بەدڵ نـەبوو، کـۆچیـان کـرد بۆ تاران و لەوێ لێی دانیـشـتن. هەروەها قـازی مـحـەمـەد دەیزانی لەبـەر ئەو خزمـەتە شیاو و فیداکارییانەی خۆی و بنەمـاڵەکەی لە ڕابردوو و هـەنووکـەدا سـەبارەت بەدانیـشـتـووانی هەرێم و بەتایبـەتی خـەڵکی مـهـاباد کردوویانە، بێتو لا لە حیزب (ژ. ک.) بکاتەوە، بەلێبڕاوی دەیکەنە سەرۆکی ئەو حیزبە. بەو پێیە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد بیەوێ و نەیەوێ، بەلەبەر چاوگرتنی ئەوەی سیادەت و ڕێبـەریی خـەڵکی هەرێمی بەمـافی خـۆی دەزانی، ئەو پشکـەی دوایی هەڵبـژارد واتە وڵامی ئەرێی داوە بەبانگەوازی حیزب و هـاوکـاریی لەگەڵ کۆمەڵەی قبووڵ کرد، لە ئاکامدا کردیان بەسەرۆکی کۆمەڵە. بەبوونی قازی بەسەرۆکی کۆمەڵە، کاروباری حیزب هـەتا دەهات برەوی زیاتر دەبوو و چالاکییەکانی ئاشکرا کرد و وەڕووی خست و ئەندامـەکانی کۆمەڵە دەستیان کرد بەخـۆپیشـاندان و میتینگ سـازکردن و هتد. خۆپیشاندانەکانیان جار جار بەشێوەی

١- بەڕواڵەت بارزانییەکان لە دوای گـەڕانەوەی قازی مـحـەمـەد لە تارانەوە هاتنە ئێرانێ. (لە ڕاسـتـیدا بارزانییـەکان ماوەیەک دواتر لەو ڕێکەوتەی نووسـەر باسی لێوە دەکا، هاتن بۆ کوردستـانی ئێران - وەرگێری دەقی کوردی)

کارناڤاڵ بوو کە بەزمانی خۆجێیی پێی دەڵێن "میرمیرێن".

شانۆی " میرمیرێن" لە کۆنەوە لە کوردستان باو بووە، بەتایبەتی لە جێژنان و شاییاندا. و ئەوە بریتییە لەوەی کەسێک کە قەڵافەتێکی بەرز و پاڵەوانانەی هەبێ و خۆش سیما بێ و سمێڵێکی درێژی هەبێ، هەڵدەبژێرن و نێوی دەنێن "میر"[1]. جلوبەرگی پاڵەوانانی کۆنی دەبەر دەکەن، چەند نەفەرێک دڵخوازانە وەکو وەزیر و ڕاوێژکار لەخزمەتیدا دەبن و چەند کەسیش ئەرکی فەڕاشی و چاودێری بە سەر کاروباری بەڕێوەبەری و هێمنی ئەو بەئەستۆوە دەگرن. بە ئاسایی میر لە شوێنێکی بەرز کە دەڕوانێتە سەر شار یان ئاوەدانی لە سەر کورسی دادەنیشێ. وەزیرەکان و ڕاوێژکاران و فەڕاشەکان بەوپەڕی ئەدەبەوە و بێ ئەوەی هیچ بڵێن دەستەونەزەر لە خزمەتی دان و میر هەر فەرمانێک بدا، بێ ئەوەی سێودووی لێ بکەن جێبەجێی دەکەن و بەپێی دابونەریتی لە مێژینە هیچ مەقام و دەستەڵاتێک بۆی نییە لە فەرمانی میر سەرپێچی بکا. میر بەڕێگای فەڕاشەکانیدا حاکمی شار و پیاوماقووڵان و ئەشراف بانگ دەکاتە لای خۆی و وەکو غەرامە بڕە پارەیەکیان لێ دەستێنێ و دوایە مەرەخەسیان دەکا و جارجار کورتانی کەرێیان خەڵات دەکا و هەر ئەو دەمی کورتانەکە لە سەر پشتی حاکمەکە یان کابرای پیاوماقووڵدا دەنرێ و جلی دەکەن و ئەگەر کابرا لەبەری بپارێتەوە ئەو سووکایەتییەی لەگەڵ نەکرێ، دەبێ بڕێکی تر دراو وەک غەرامە بدا. ئەو ڕێوڕەسمە تا حەوتوویەک، دە ڕۆژ، بەردەوام دەبێ. ئەو دراوانەی لە پیاوماقووڵان و دەوڵەمەندان وەکو غەرامە ئەستێندراون لەناو نەداران و ئەو موسیقا ژەنانەی لە مەجلیسی میردا هونەریان نواندووە دابەش دەکرێ. شەخسی میر جگە لەوەی کە دەبێ ئینسانێکی بەخۆوە و سمێڵ ئەستوور بێ، شەرتێکی دیکەشی دەبێ تێدا بێ، ئەویش ئەوەیە لەو ماوەیەدا کە فەرمانڕەوایی دەکا نابێ لە پێش چاوی خەڵکی پێ بکەنێ یان تەنانەت بزەشی بێتە سەرلێوی و هەڵبەت ئەو کارەش هێندە هاسان نییە؛ چونکو لە خزمەت میردا کەسێکیش بەنێوی "ویشکەڕن" هەیە کە تەقریبەن وەک حاجی فیرووزی تارانییەکانە. ئەو کەسە بەگۆڕینی سەروسەکوت و قەڵافەتی خۆی و ئاڕایشتی سەیری وەک سووریێستان و دەبەرکردنی جلوبەرگی عەجایب و هەڵئاواسینی زەنگوڵە و تەنەکە و ئاوێنە بەجلوبەرگەکەیەوە؛ لە مەجلیسی میردا ئەدا و ئەتواری جێی پێکەنین لەخۆیەوە دەنوێنێ، لەگەڵ گشت ئەوانەشدا میر مافی پێکەنینی نییە و ئەگەر بێتو میر پێکەنینی بێتێ، بە شەق لێی دەدەن و لە سەرتەختی لا دەبەن.

---

١- جێی دوودڵییە کە " میر" لە وشەی "ئەمیر"ی عەرەبییەوە داکەوتبێ.

لە دێڕەکانی پێشوودا گوتمان ئەندامانی کۆمەڵەی (ژ. ک.) دەستیان کرد بەخۆپیشاندان و میتینگ و چالاکیی دیکە، لەوانە چەکدارانی مهابادی سوار و پیادە بەڕیزی ڕێکوپێک لە ژێر فەرماندەریی سەرپەرستیی خۆیاندا (هەر گەڕەکەی سەرپەرستێکی هەبوو) لە شەقامەکانی شاریدا لە هاتوچۆدا بوون و جارجار لە لایەن سەردەستەی چەکدارەکانەوە نوتقیش دەکرا سەبارەت بەخراپیی ئیستیعمار و باشیی ئازادی و هێمنی و پەرەپێدانی فەرهەنگ، جار جار هەربژی و برووخێ و بمرێشیان دەگوت، تا ئەوەی بەنهێنی لە لایەن ڕووسەکانەوە لە دووسێ جاردا شەوانە ژمارەیەکی زۆر چەک وەک تفەنگی بڕنوو، موسەلسەلی بچووکی دەستی، موسەلسەلی دژی هەوایی و هەروەها دەمانچە و فیشەکیان دانێ.

ئەو چەکانە لەنێو خەڵکدا دابەش کران، هەروەها هێندێکیشیان دران بەبارزانییەکان و هێندێکیش بەعەشیرەتەکانی دەوروبەری مهاباد. بارزانییەکان هەموو چەکەکانیان لەگەڵ خۆیان برد و ئەوی دیکە دوای هاتنەوەی هێزی دەوڵەت بۆ ئازەربایجان و مهاباد بێ ئەوەی دەنکێکیشی لێ کەم بێتەوە کەوتە دەستی ئەرتەش.

پێویستە ئاماژە بەم خاڵە بکرێ ڕووسەکان لە سەرەتاوە سەبارەت بەبارزانییەکان و شەخسی مەلا مستەفا ڕەشبین بوون و ڕووی خۆشیان پێشان نەدەدان، ڕەنگە ئەوانیان بەجۆرەیەک لە دەسکەلای جێبەجێکردنی تەما و مەبەستی ئیستیعماری زانیبێ، بەڵام کەم کەم بۆچوونیان سەبارەت بەبارزانییەکان گۆڕا و ئەوانیشیان تێکەڵی چالاکییەکانی (ژ.ک.) کرد و داویان لێ کردن هاوکاری قازی محەمەد بکەن. مەلا مستەفا بەپلەی ژەنەڕاڵی و مووچەی مانگانەی چوارهەزار ڕیاڵ دەستی بەکار کرد و خانووبەرەی ئاغای (فەتاحی سوڵتانیان) یان بۆ بەڕێزیان بەکرێ گرت و لە بەر دەستیان نا.

بنەماڵە بارزانییەکان لە سەرەتای هاتنیاندا، وەزعێکی هەتا بڵێی شپڕێو و پەرێشان و خەفەتاوییان هەبوو، نە خۆراکیان هەبوو، نە جلوبەرگ و نە شوێنی لێ دانیشتن، جگە لەوە چارەڕەشییەکی گەورەتریش تووشیان هاتبوو، ئەویش بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تیفۆس بوو لەنێویاندا و هەموو ڕۆژێ چەند کەسیان لەبەر ئەو نەخۆشییە لێ دەمرد. دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەبەر نەخۆشی و بێدەرەتانی و برسێتی لە نێوچوون، دوکتورە ڕووسەکان بۆ چارەکردن و تەداوییان هاتن بۆ مهاباد و تیماریان کردن و بەرەبەرە نەخۆشی لە نێویاندا نەما و وەزعی ژیانی تاکوتەراکی بارزانی لەبەر یارمەتی و کۆمەکی بێ دریخی خەڵکی مهاباد بەتەواوی بووژیاوە. لە سەرەتاوە تاکوتەرای بارزانییەکانیان لە مزگەوتەکان

و كاروانسەراكاندا بنەجێ كران، چەند خێزانێک لە مزگەوتی قازیدا بوون، خواردنی ئەوانیان لە لایەن حیزبەوە هەر لە بەردەگەی هەمان مزگەوت لە مەنجەڵی گەورەدا ئامادە دەکرد و دەیاندانێ. لەبەرئەوەی دەفریان نەبوو بۆ وەرگرتنی خۆراک، ناچار بۆ پەیداکردنی دەفر و زەرف دەچوونە ماڵەکانی دەرو دراوسێ و بە ئەمانەت قاپوقاچاغیان وەردەگرت، لە دوای نانخواردن دەیان شوتن و دەیاندانەوە بەخاوەنەکانیان و دیسان بۆ جەمی نیوەڕۆ و شێو بۆ دەفر و زەرف قەرزکردن دەچوونە ماڵە دراوسێکان. ئەگەر ئەو خێزانانە قاپوقاچاغ و کەوچکیان نەهێنابایەوە و لای خۆیان گلیان دابایە، چ دەرەتانێک نەبوو بۆ ئەوەی لێیان وەربگیرێتەوە؛ چونکو ئەوانەی قاپوقاچاغیان وەردەگرت بۆ دەرودراوسێ نەناسیاو بوون بەڵام قەت کارێکی وایان نەکرد و لەوپەڕی دڵپاکی و ئەمانەت و ئەدەبدا دوای لێبوونەوە لە خواردن، قاپ و دەورییەکانیان دەشوشت و دەیانداوە بەخاوەنەکانیان و سپاسیان دەکردن.

ڕۆژێک لە ماڵی خۆم لە نزیک مزگەوتی قازی، دانیشتبووم. دیتم پیاوێکی بارزانی هات و داوای کرد سەماوەرێکی بەئەمانەت بدرێتێ. پیاوە بارزانییەکە گوتی: یەکێک لە خزمەکانی خۆی بانگ کردووە بۆ چایی خواردنەوە، قەند و چاییمان هەیە، بەڵام سەماوەر و چادانمان نییە. خێزانم ئەوەی پێ گوتم. ئێمە دوو سەماوەرمان لە ماڵێدا بوو و لەبەرئەوەی هەر دووکیشیان بەڕێژە قیمەتی بوون، ئیزنی لێ وەرگرتم، لە دڵی خۆمدا گوتم ڕەنگە ئەو پیاوە سەماوەرەکە ببا و نەیهێنێتەوە، لە لایەکی دیکەشەوە بیرم لێ کردەوە ئەگەر داواکەی وەدوایە دەمەوە، ئەوە دوورە لە مرۆڤایەتی. داواکەییم قبووڵ کرد و بەخێزانم گوت یەکێک لە سەماوەرەکان بەپێداویستییەکانییەوە قەند و چا و ڕەژی بداتێ. سەماوەرەکەیان دایە، پاش دووسەعات کابرا سەماوەرەکەی هێناوە و سپاسی کردین و ڕۆیشت.

دۆستێکم هەیە دەیگێڕاوە و دەیگوت: ڕۆژێک مەئمووری دانی غەلە بەخێزانە بارزانییەکان بووم و ئەفسەرێکی بارزانییان لەگەڵ خستبووم و ئەمن ڕەسیدم لە ئەفسەری نێوبراو وەردەگرت، هەر بنەماڵەیەی سەد کیلۆ گەنمم دەدایە. یەکێک لە بارزانییەکان هاتە لای من و گوتی: بەشە گەنمی ئەو بەنیسبەت ژمارەی ئەندامانی خێزانەکەی زیادییە باشترە هێندێک لە بەشی وی بدەم بەفڵان پیاوی بارزانی کە ژمارەی ئەندامانی خێزانی زۆرە و ئەو ڕادەیە بەشیان ناکا. ئەمن پێم گوت: ئەو کارە لە دەرەوەی ئەرکی منە، فەرمانیان پێ داوم هەرخێزانەی سەد کیلۆ گەنمی بدەمێ، ئەگەر خێزانی تۆ بچووکترە و خێزانی وی گەورەترە، هەرچەندی پێت خۆشە لە بەشی خۆت بدە بەوی. هەڵبەت ئەودەمی گەنم زۆر کەم دەست دەکەوت و گران بوو. مەبەست ئەوەیە هەستی هاودەردی و هاوکاری

لە نێو بارزانییەکان لە ئاست یەکدیدا یەکجار زۆر بوو.

هەرچۆنێک بێ، هاتنی مەلا مستەفای بارزانی بۆ نێو حیزبی (ژ.ک.) ئەوەندەی دیکەش بووە هۆی بەهێزبوون و ئیعتیباری ئەو حیزبە، چونکو مەلا مستەفا نزیکەی دووهەزار نەفەر پیاوی شەڕکەر و شەڕئەزمووی بارزانیی لەبەر دەست دابوو کە باشترین چەکیان (تفەنگی دە تیری ئینگلیسی، ماوزر، برنوو) پێ بوو. مەلا مستەفا بیویستبا نەیویستبا، ناچار بوو گوێڕایەڵی لە قازی محەمەد بکا و بە پێی فەرمانی ئەو بجووڵێتەوە، چونکو دەوڵەتی عێراق مەلا مستەفای بەتۆبزی لە خاکی عێراق دەرکردبوو و پاشملە حوکمی ئیعدامی ئەو و برایەکانی و گشت ئەو ئەفسەرانەی دابوو کە لەگەڵی کەوتبوون، هەروەها مەلا مستەفا لەگەڵ دەوڵەتی ترکییەش پێشینەی دوژمنایەتیی هەبوو، جگە لەوەی ئەگەر قازی محەمەد خواردن و شوێنی حاوانەوەی نەدابا بەبارزانییەکان، ئەوان لە برسان دەمردن و لەبەرئەوەی بارزانییەکان لەگەڵ دەوڵەتی عێراق و ترکییە دوژمن بوون، نەیاندەتوانی لەگەڵ کوردە ئێرانییەکان بەتایبەتی لە قەڵەمڕۆی دەستەڵاتی ڕووسەکاندا هەڵوێستێکی دوژمنکارانەیان هەبێ و بەزۆر و بەهەڕەشە ژیانی خۆیان دابین بکەن، بەو پێیە دۆستایەتیی کوردەکانی ئێرانیان کرد و لەبەرئەوەی حیزبی (ژ. ک.) هێزی چەکداری کافیی لە بەر دەستدا نەبوو و پێداویستییەکی بێ ئەم لاو و ئەو لای بەتاکوتەرای فیداکار و شەڕ ئەزمووی بارزانی هەبوو، بۆیە بەخۆشییەوە بەپیل ئەوانەوە چوو و بەتەواوی حەولی دا بۆ دابینکردنی ژیانیان چ لە ڕێگای کۆکردنەوەی باربوو و چ لە ڕێگای پێدانی ئەو غەلەیەی لە ئیدارەی غەلە و نانی مهاباددا هەبوو، جگە لەوە لە هەموو گوندێک چەندین خێزانی بارزانی دامەزرێندرابوون و بڕیار درا تێچووی ژیانی ئەوان لە لایەن خەڵکی هەمان گوند لەئاغاوە بگرە تا دەگاتە ڕەعیەت دابین بکرێ. مرۆ دەبێ بەئینسافەوە بڵێ لە هەموو گوندێکدا بە باشترین شێوە وەرگیران؛ چونکو ئەوانیان بەئاوارە و سەرگەردان لە ڕێباز و دەپێناو کوردستاندا دەزانی و بارزانییەکانیش کەمترین جاڕزی و سەرگێژەیەکیان بۆ هیچ کەس پێک نەهێنا؛ چونکو بارزانییەکان لە جێدا خەڵکێکی پێمل و بە ئەدەبن و لەلایەکی دیکەشەوە بەڵا دیتوو و غەوارە بوون، بۆیە لە هەرجێیەک بایەن بەپێی پێویست میواندارییان لێ دەکرا.

هەرچۆنێک بێ بەدەم ئەو بارودۆخەوە ڕووسەکان بەخۆشەویستی و دۆستانە لەگەڵ کوردەکان دەجووڵانەوە، بەنرخێکی کەم قەند و پارچەیان بە خەڵک دەفرۆشت، هەروەها دوو سێ جار ژمارەیەک لە پیاوماقووڵانی کوردستانیان لەوانە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد و

پیاوێکی بەناوبانگی موکوریانە ئەم شینەی خوارەوەی بۆ شەهیدانی ڕێگای سەربەستی کورد گێڕاوە.

ئەم ئاسمانە شینە کە وا بەرگی ماتەمە
ئیجادی وا کراوە کە قوببەی هەموو غەمە

بارانی مەرگە، بەفرە کفن، ڕەعدە نەفخی سوور
ئەوڕۆ گرانی قابیزی ئەرواحی عالەمە

سەرتیپی تیپی هەورە شەماڵ، بۆ سەفی قیتال
نارەنجەکیی تەرزەیە، تەییارەیی تەمە

ڕۆژی سیایە، ڕۆژ و شەوی تارە چەرخی پیر
هەوری لەدوودە، ئاهو تەمی وی هەموو غەمە

ئەم چەرخە کۆنە ماشێنەکەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا بەخوێنەکی، سووڕانی عەستەمە

لەم قەرنی بیستەمی مەدەنییەت بەخوێنی کورد
ژەنگی لە سەر نەهێشتووە، هێشتاکە پێی کەمە

تاراندراوە چەرخی ستەم، کارییە
ئەو زوڵم و جەورە قسمەتی هەر شین و زارییە

خاسسە بەخوێنی کوردی شیمالی هەموو زەمین
گوڵزاری خوێنە غونچە سفەت دڵ هەموو غەمین

هەوری خەفەت لە ئەوجی فەرەجدا موسەلەتە
شادی نەبوو لە هیچ دڵێدا نەبێ بەشین

مەحشەر میسالە دەشتی شیمال، کەربەلا سفەت
غەمناکە لەم موسیبەتە سوککانی حەوتەمین

# شێخ ئەحمەدی سریلاوا

حەسەنی قازی

شێخ ئەحمەدی سریلاوا، کوڕی دووەمی قازی شێخ جەلال، برای پچووکتری میرزا جەوادی قازی و مامی محەمەدی قازی، (وەرگێڕی زۆر بەرهەمی بەنێوبانگی ئەدەبی جیهانییە لە زمانی فەرانسییەوە بۆ سەر زمانی فارسی).

بەداخەوە نووسەری کتێب نە لەسەر قازی شێخ جەلال و نەلەسەر کوڕانی زانای دوکتور جەوادی قازی و شێخ ئەحمەدی سریلاو هیچی نووسیوە.

ناوبانگی شێخایەتیی ئەحمەدی قازی، ڕەنگە لەبەر بابی یان لەبەرئەوەی ماڵی خاڵانی لە سادات و شێخان بوون پێی بڕابێ. سریلاوا ناوی ئاوەدانییەکە لەنێوان بۆکان و مهاباد و لەبەرئەوەی شێخ ئەحمەد لەوێ ژیاوە، خەڵک بەو ناوە بانگیان کردووە. ئەحمەدی قازی شاعیر بووە و لە ساڵانی نیوەی کۆتاییی ١٩٤٠ کاندا ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

پارچەیەک لە شێعرەکانی لە کتێبێکی پچووکدا بەناوی ' دیاریی کومەڵەی (ژ.ک) بۆ لاوەکانی کورد' کە لە ساڵی ١٣٢٢ی هەتاوی/ ١٩٤٣ی زاینی لە لایەن کۆمەڵەی (ژێکاف) ڕا بڵاو کراوەتەوە لە بەشی سێیەمدا بەناوی ' دەستە گوڵێکی جوان و بۆنخۆش لە باخی نیشتمانپەروەری' کە بەسەرنووسی بەیتێک لە یەکێک لە شێعرە بەناوبانگەکانی سەیفولقوزات ڕازاوەتەوە: (هەر میللەتێ لە لاوە حەقی خۆی بەدەستەوە/ کوردێک ئەگەر(کە) سەری هەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو) چاپ کراوە.

عەبدولرەحمانی زەبیحی، گەڕێنەندەی گۆواری نیشتمان و چاپەمەنییەکانی کۆمەڵەی ژیانی کورد بەچەند دێڕێک شێخ ئەحمەد و پارچە شێعرەکەی ئاوا ناساندووە:

دوای جەنگی ڕابوردوو کە جمهووریەتی ترکییە سازبوو مەحکەمەیەک بەناوی (مەحکەمەی سەربەخۆیی) (ئیستیکلال مەهکەمەسی) داندرا، جەنابی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و سەید محەمەدی کوڕی دەگەڵ هەندێ لە گەورە و ناودارانی کورد لەم مەحکەمەیەدا محاکەمە کران و هەڵیان ئاوەسین. ئینجا "شێخ ئەحمەدی سریلاوایی" کە

عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد، حاجی بابەشێخی سیادەت، قەرەنی ئاغای مامەش، حاجی هەمزاغای جەلدیان، عەولا ئاغای بایەزیدی، محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی، ئەبولقاسمی سەدری قازی و ژمارەیەکی دیکەیان بانگهێشتن کرد بۆ باکۆ، فابریک و دامەزراوەی فەرهەنگی و پیشەسازییان پێ نیشان دان و بەوانیان گوتبوو ئەگەر پێتان خۆش بێ ئازادی و خۆموختاری وەدەست بهێنن، ئێمە هاوکاریی پێویستتان لەگەڵ دەکەین. لەبەرئەوەی خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد لەچاو ئەوانیدی هەڵکەوتووتر بوو و بەزمانگەلی ڕووسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرانسەیی ئاشنایی هەبوو و بۆ سالانی ساڵ ئاواتی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستانی لە مێشکیدا دەپەروەراند، زیاتر لە ئەوانیتر سرنجی ڕووسەکانی بەلای خۆیدا ڕاکێشا و ئەویان بۆ ڕێبەریی کوردستانی سەربەخۆ لەبەرچاو گرتبوو. ئەوە بوو دوای گەڕانەوە لە باکۆ و وتووێژ بەدەوری خۆموختاری ئازەربایجان، بەشێوەیەک کە کوردستانیش گرێدراوی بێ، بەلام دواجار لەبەر پێکێشی و پێداگریی قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی ڕووسەکان قۆڵیان لە سەر کێشا، کۆماری کوردستان بەجوێ و نەک گرێدراوی ئازەربایجان دابمەزرێندرێ. دەبێ بگوترێ لەبەرئەوەی زۆربەی ئەفسەرانی سیاسی ڕووسەکان لە ئازەربایجانی ئێران، تورکی قەوقازی بوون، ئەو ئەفسەرانە ڕەنگە لەبەر دەمارگرژیی نەتەوایەتی یان لەبەر تێبینییەکی نادیار، پێداگرییەکی سەیریان دەکرد کوردەکان و ئازەربایجانییەکان تەنێ یەک حکوومەتی کۆماری پێک بهێنن و لەبەرئەوەی کوردەکان کەمایەتین دەبێ گوێڕایەڵی ئازەربایجان و لە ژێر فەرمانیدا بن. لە کۆبوونەوەیەکدا کە بەئامادەبوونی ژمارەیەک لە گەورە پیاوانی ئازەربایجان لەوانە، پیشەوەری و سەرکردەکانی کورد لەوانە قازی محەمەد و خوداڵیخۆشبوو محەمەد حوسێن خان و چەند کەسی دی لە تەورێز پێک دێ، ڕووسەکان بەئاشکرا سەرۆک عەشیرەتەکان و گەورە پیاوانی دیکەی کوردستان ئاگادار دەکەنەوە دەبێ گرێدراوی کۆماری ئازەربایجان بن و مافی پێکهێنانی کۆمارێکی جیاوازیان نییە و تەنانەت هەڕەشەیان کردبوو ئەگەر کەسێک لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە سەرپێچی بکا و ملی لێ بادا لە نێو دەچێ. لەو کۆبوونەوەیەدا خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد و خوداڵیخۆشبوو محەمەد حوسێن خان بەتوندی دژایەتییان لەگەڵ ئەو بەرنامە کردبوو، خوداڵیخۆشبوو محەمەد حوسێن خان لەجێی خۆی هەستابوو و لە نوتقێکی گەرم و توندا گوتبووی: ئەگەر بەڕاستی یارمەتیی ئێمە دەدەن، ڕێگامان بدەن ئێمەی کورد حکوومەتێکی نیشتمانی دامەزرێنین و ئەگەر بێتو گوێڕایەڵی ئەوانیدی بین وەک جاران گوێڕایەڵی

فارسەکان دەبین؛ چونکو کورد و فارس هەر دووکیان سەر بەڕەگەزی ئاریان و زمان و پێشینەی مێژووییان لە یەک نزیکە.

قسەکانی خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان دەبێتە هۆی تووڕەیی و غەزەبی زۆری ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە، واتە ئەفسەرانی قەوقازی و پیشەوەری و دەبێ بەهەرا و گوڕە و کۆبوونەکەوە دەشێوێ. قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و کوردەکانی دیکە ئەوێ بەجێ دەهێڵن. کاتی هاتنە دەر لە کۆبوونەوەکە ئاگاداریان دەکەنەوە دەبێ ئامادەبن بۆ گوێڕایەڵی پیشەوەری دەنا لەنێو دەچن، بەڵام قازی محەمەد بەهیچ جۆر ناچێتە ژێر باری قسەکانیان. دوای شێوانی کۆبوونەوەکە، ئەفسەرانی تورکی قەوقازی کە سەرۆکەکانیان ژەنەڕاڵ سەلیم ئاتاکیشی ئۆف و نەمازعەلی ئۆف، بوون بڕیار دەدەن، هەر ئەودەمی قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خان تێرۆر کەن یان بیانترسێنن و بۆ جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە چەند کەسێک مەئموور دەکەن، بەڵام تێرۆریستەکان لەوەدا سەرناکەون، کارێک بکەن.

ئاشکرایە قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خان لە ئاکامی وتووێژەکانی ئەو کۆبوونەوەیە زۆر زویر دەبن؛ چونکو دژایەتی لەگەڵ بڕیاری ڕووسەکان لە ئازەربایجانی ئێران کە ئەوێیان داگیر کردبوو، بەرانبەر بوو لەگەڵ مەرگ و لەنێوچوون، بەدوای ئەوەدا قازی محەمەد بڕیار دەدا خۆی بکوژێ و دەڵێ: ئەمن بەڵێنم بە نەتەوەی کورد دابوو سەربەخۆیی و ئازادییان بۆ وەربگرم، ئێستا کە لەوەدا سەرنەکەوتم، خەڵک پێیان وا دەبێ ئەمن دانەخۆرە کراوم و دەستم لەوە هەڵگرتووە ئازادییان بۆ وەرگرم و وا دەزانن فرۆشتوومن و بەخەتاکار و خائینم دادەنێن و ئیدی ناتوانم چاو لە ڕووی خەڵک بکەم، بۆیە جگە لە ڕزگارکردنی خۆم چارەیەکی ترم نییە. کەسانی دەوروبەری قازی محەمەد لەو بڕیارەی پاشگەز دەکەنەوە و بەسەلاح و پەسندی بەڕێزیان، لە مهاباد و شوێنەکانی دیکەی کوردنشین دەست بەچالاکی دەکەن، میتینگ و خۆپیشاندان بە دژی بڕیاری پیشەوەری و ئەفسەرانی ڕووسی سەبارەت بە وەسەرخستنی کوردستان بۆ سەر حکوومەتی پیشەوەری، پێک دەهێنن، چەندین تۆمار بە ئیمزای خەڵک دەگەیێنن و دەیدەن بەکاربەدەستانی شووڕەوی. بەهەڵکەوت ئەو جۆرە خۆڕاگری و خەباتانە کاری خۆیان دەکەن و کاربەدەستانی سیاسیی شووڕەوی لە ئێران مەسەلەکە بە مەسکەو ڕادەگەیێنن و داوای ڕێنوێنی دەکەن، لە مەسکەوڕا وڵام دێتەوە کە کوردەکان بۆ خۆیان بەجوێ حکوومەتی خۆموختاری دابمەزرێنن.

لەو جەنگەیدا کە خوالێخۆشبوو قازی محەمەد خۆی لە دۆخێکی تەنگانەدا بینیوە و لە نیگەرانیدا بووە، کاربەدەستانی شووڕەوی مزگێنی قۆڵ لە سەر کێشانی مەسکەوی پێ دەدەن بۆ دامەزراندنی حکوومەتی خودموختاری کوردستان، بە بێ ئەوەی لە ژێر چاودێری پیشەوەریدا بێ بەو پێیە تەمی دژبەرێتی و گرژی دەرەوێتەوە و قازی محەمەد بەخەیاڵێکی ئاسوودە و لەسەرەخۆ دەست دەکا بەکاری دامەزراندنی حکوومەتی کۆماری کوردستان، بەدوای ئەوەدا لە بەرواری ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوی[1] قازی محەمەد بەشکۆ و جەلالی هەرچی زیاترەوە بە ئامادەبوونی گشت سەرۆک عەشیرەتە کوردەکانی مهاباد و شنۆ و لاجان و دەوروبەری ورمێ و خۆی و ماکۆ و سەلماس و ڕێزداران و عولەمای کوردستان، لەوانە حاجی شێخ سەید عەبدوڵا ئەفەندی، مەلا مستەفای بارزانی، حاجی بابەشێخی سیادەت، لەکاتێکدا پێشمەرگەی دڵخواز بەجلوبەرگی یونیفۆرمەوە لە مەیدانی چوارچرا بەچەکەوە ڕیزیان بەستبوو، چووە سەر سەکۆیەک کە بەمافوورە و پارچە ڕازێندرابووەوە. دوایە بەدووروودرێژی سەبارەت بەیەکێتی و خێر و بێری ئازادی و سەربەخۆیی و ئەو گیانبازی و ئەو خوێنە زۆرانەی بۆ وەدیهێنانی ئەو ئاواتە بەخت کراون، قسەی کرد. دوای تەواوبوونی قسەکانی بەڕێزیان، پێشمەرگەکان سڵاویان لێ کرد، دەستەی مووزیک سروودی نەتەوەییی کۆماری کوردستانیان پێشکێش کرد، دەنگی هوورا و هەربژی و چەپڵەلێدان لەو کەشوهەوایەدا زرینگایەوە[2]. دوایە محەمەد حوسێن خان هەیئەتی حکوومەتی بەو شێوەیەی خوارەوە بەخەڵک ناساند:

---

١- بابم لێرەدا هێندێک هەڵەی کردووە، چونکو ئەوە ڕێکەوتێکە تێیدا حیزبی (ژ.ک.) نێوی گۆڕیوە بەحیزبی دیموکرات. دامەزرانی کۆماری مهاباد لە دووی ڕێبەندانی هەمان ساڵدا بووە. بڕوانە: نووسراوەی تایپکراوی کاک سەید محەمەدی سەمەدی، لاپەڕەی ١٤، بەناوی " نگاهی دیگر بە ژ. کاف" ئاوڕێکی دیکە بۆ سەر ژ. کاف، مهاباد، پاییزی ١٣٦٣

٢- نووسینی ویلیام ئیگلتن لەمەڕ ئەوەی کە لە ڕێورەسمی ئەو ڕۆژەدا زێرۆ بەگ هێندێک قسەی دژی خوالێخۆشبوو حاجی شێخ سەید عەبدوڵا ئەفەندی (لە سەرەتای پووشپەڕی ١٣٤٦ ی هەتاوی لە ورمێ وەفاتی کردووە) کردووە بەتەواوی بێ بنەمایە (بژارکار). (تێبینی وەرگێڕی کوردی: ئەوەی ئیگلتن باسی کردووە ڕاستە زێرۆ بەگی بەهادوری لە ڕۆژی ٢ی ڕێبەندان دژی سەید عەبدوڵا قسەی کردووە و ئەو ڕۆژە سەید عەزیزی شەمزینی بەنوێنەرایەتیی ساداتی نەهری قسەی کردووە بەڵام ڕاستەو ڕاست وەڵامی زێرۆی نەداوەتەوە، قسەکانی زێرۆ بەگ بێ هێرش بۆ سەر سەید عەبدوڵا، بەسانسۆر کراوی لە ژمارەی ١٥ ی ڕۆژنامەی کوردستان شەممە ٢٧ی ڕێبەندانی ١٣٢٤ی هەتاویدا، و بۆ جاری دووەم هەمان وتار ئەو جار بەو ڕستانەی کە سەید عەبدوڵا تاوانبار دەکا بە هاوکاری لەگەڵ ستادی ئەرتەش لە ژمارەی ٢١ی ڕۆژنامەی کوردستان، شەممە، ١١ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ی هەتاویدا بڵاو کراوەتەوە).

١- جەنابی قازی محەمەد، پێشەوا و ڕەئیسی جمهووری کوردستان

٢- جەنابی حاجی بابەشێخی سیادەت، سەرۆک وەزیر

٣- محەمەد حوسێنی سەیفی قازی، وەزیری هێزی دێمۆکراتی کوردستان

٤- محەمەد ئەمینی موعینی، وەزیری کیشوەر

٥- ئەحمەدی ئیلاهی، وەزیری ئابووری

٦- کەریمی ئەحمەدین، وەزیری پۆست و تێلگراف

٧- حاجی عەبدوڕەحمانی ئێلخانیزادە، وەزیری ڕاوێژکار

٨- مەنافی کەریمی، وەزیری فەرهەنگ

٩- سەدیقی حەیدەری، وەزیری تەبلیغات

١٠- خەلیلی خوسرەوی، وەزیری کار

١١- حاجی مستەفای داودی، وەزیری تەجارەت

١٢- مەحموودی وەلیزادە، وەزیری کشتوکاڵ

١٣- سمایلی ئێلخانیزادە، وەزیری ڕێگا وبان

١٤- سەید محەمەدی ئەیوبیانی مەرکەزی، وەزیری لەشساخی

١٥- مەلا حوسێنی مەجدی، وەزیری داد(١)

لە دوای ڕێوڕەسمی ناساندنی ڕەئیس جمهوور و هەیئەتی وەزیران، دە کەس وەکو خائین بەمیللەت ناسێندران لەوانە میرزا ڕەحمەتی شافیعی، عەلی ئاغای ئێلخانیزادە، عەلی خانی نەوزەڕیی مەنگوڕ، کوڕی قادر مرۆت و میرزا غەفووری مەحموودیان و هەڕەشەیان لێ کرا ئەگەر لە کردەوەی خۆیان پەشیمان نەبنەوە و سوێندی وەفاداری نەخۆن، هەموویان لە مەحکەمەی گەلدا محاکەمە دەکرێن. ئەو ئاگادارکرنەوەیە وەک بۆمب تەقییەوە، کەسانی نێوبراو لە ترسی گیانی خۆیان وەکرڕوکاش کەوتن بۆ ئەوەی چارە و ڕێگای ڕزگارییەک بدۆزنەوە. ژمارەیەک لەوکەسانە کە لە مهاباد بوون، لەوانە عەلی خانی نەوزەڕی، چوونە لای قازی محەمەد و وێڕای دەربڕینی پەشیمانی و پاشگەزبوونەوە، داوای لێبووردن و چاوپۆشییان کرد. ئاشکرایە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد کە لەباری ئەخلاقییەوە کەسێکی گەورە و دژی خوینڕێژی و زەبروزەنگ بەکارهێنان بوو، بەحورمەتەوە

١- نێوی ئەو دووکەسەی دوایی لە لایەن بژارکارەوە لە کتێبی " نگاهی به تاریخ مهاباد" نووسینی سەید محەمەدی سەمەدی لاپەڕەکانی ١٤٩- ١٤٨ وەرگیراوە.

ئەوانی وەرگرت و دڵی دانەوە و چاوپۆشی لە ڕابردوویان کرد و ڕای گەیاند هیچکەس کاری بەسەریانەوە نابێ بەو مەرجەی ئەوانیش ئەوجۆرەی بەڵێنی دەدەن لەوپەڕی دڵپاکی و فیداکاری و ڕاستی و سەفا لەپێناو ئازادیی کوردستاندا هاوکاری بکەن.

بەو پێیە لە خەتا و تاوانی ژمارەیەک بەرهەڵستکار چاوپۆشی کرا. دەبێ ئەم خاڵەش وەبیر بخرێتەوە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، بەڕاستی پیاوێکی ساخ و ئارام و لێبوێر بوو، بە تایبەتی دژی کوشتوبڕ و خوێنڕشتن بوو و لەو باوەڕەدا بوو دەبێ بەڕێگای نەسیحەت و ئامۆژگاری خەڵک ڕێنوێنی بکرێن بۆ ڕێگای ڕاست و تەنانەت لە ملە و خەبات بە دژی دوژمنانیش لەگەڵ شەڕ و خوێنڕشتن نەبوو. وەبیرم دێ جارێکیان بەبۆنەی یەکێک لە جەژنە دینییەکان بۆ عەرزی پیرۆزبایی چووبوومە خزمەت خودالێخۆشبوو قازی محەمەد کە ئەودەمی عینوانی پێشەوایی و سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستانی هەبوو. ئاغای حاجی بابەشێخی سیادەت، سەرۆک وەزیریش لەوێ ئامادە بوو. حاجی بابەشێخ ڕووی لە قازی محەمەد کرد و گوتی: حەزرەتی پێشەوا ئێستا هێزە دەوڵەتییەکان لە سەقز و سەردەشت لە ئاڵقەی گەمارۆی هێزەکانی ئێمەدان، بۆچی حەزرەتی پێشەوا (لە زەمانی هەبوونی پلەی سەرۆکایەتیی کۆماری کوردستاندا خودالێخۆشبوو قازی محەمەدیان بەپێشەوا بانگ دەکرد) ئیزن نادەن هێزەکانی ئێمە هێرش بەرن و ئەو شوێنانە بگرن و هێزە دەوڵەتییەکان دەرپەڕێنن یان هەر نەبێ نابێ ئیزن بدەن، سەربازخانەکانی ئەوێ کە لە ڕووی ئازووقە و خواروبارەوە لە تەنگانەدان، ئازووقە و خواروباریان پێ بگا. خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە وڵامدا گوتی: (ئێمە بەزەبری چەک ناتوانین کارێک بەرەوپێشەوە بەرین، چونکو بێجگە لەوەی هێشتا لە نێوخۆماندا یەکگرتوو و یەکڕەنگ نین، بەڵکو لە بواری تاکوتەرای شەڕکەر، کەسانی خوێندەوار و باری دارای زۆر نەدارین، لە جێیدا چ پیشەسازی و فابریکێکمان نییە، بۆیە دەبێ بە قەڵەم و چاپەمەنی هاواری خۆمان بەگوێی دنیا ڕابگەیێنین و مافی ئازادی وەربگرین.)

کەسێک بۆی گێڕامەوە لە تەورێز کۆبوونەوەیەک بە بەشداریی قازی محەمەد و پیشەوەری پێک هات و ئەو کەسە گوتی، ئەمن بۆ خۆم لە کۆبوونەوەکەدا بووم. پیشەوەری هێندێک نێوی دا بەقازی محەمەد و گوتی: لەبەرئەوەی ئەو کەسانە خائین و دژی ئازادیی ئازەربایجان و کوردستانن، بەپێی پەسندی کاربەدەستانی ڕووسی ئەو کەسانە هەموویان دەبێ ئێعدام بکەی. قازی محەمەد گوتی ئەمن کارێکی وام لە دەست نایە داوای لێبووردن دەکەم. پیشەوەری پرسی بۆچی؟ قازی محەمەد لە وڵامدا گوتی ئەمن کەسێکی موسڵمانم،

لە دینی ئیسلامدا کوشتنی خەڵک بەبێ ئیزن و دەستووری شەرعی سووچێکی گەورەیە. پیشەوەری گوتی: ئەگەر وا نەکەی بۆ خۆت دەکوژرێی. قازی محەمەد وڵامی داوە: (ئەمن کوژرانی خۆمم لا پەسندترە تا ئەوەی هێندێک کەس بەبێ ئەوەی لە باری شەرعییەوە تاوانیان لە سەر سووربێتەوە، بکوژم). ڕێورەسمی ڕاگەیاندنی حکوومەتی کۆماری کوردستان هەر بەوشێوەی باسمان کرد، بەڕێوە چوو. بۆ بەیانی ئەو ڕۆژە خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە هۆڵی خانووی ئێستای ستادی سپای مهاباد، لە شەقامی شاپوور لە تەنیشت مزگەوتی قازی (خانووی شارەداریی ئێستا) دانیشت، خەڵک دەستە دەستە دەچوونە دیدەنی بەڕێزیان، دەستیان ماچ دەکرد، پیرۆزباییی دامەزرانی کۆماری کوردستانیان لێ دەکرد. بازارییەکان دووکان و بازاڕیان بەهەڵکردنی چرا و هەڵاوەسینی پارچەی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندبووەوە و لە شادی و خۆشیی گشتیدا بەشدار بووبوون.

هەر لە هەمان[1] ڕۆژدا تابلۆی سەر دەرگای ئیدارە دەوڵەتییەکان لە لایەن حوسێنی فرووهەرەوە[2] هێنرایە خوارەوە و لە جیاتی ئاڵای شێروخورشید، ئاڵای تایبەتی کۆماری کوردستانیان هەڵدا کە ڕەنگی پارچەکەی هەر وەک ئاڵای ئێران وا بوو، بەڵام شوێنی ڕەنگەکانیان جیاواز بوو: ڕەنگی سەوز لە خوارەوە و سپی لە نێوەڕاست و ڕەنگی سوور لە سەرەوە بوو و لە جیات شێر و خورشیدیش، ئارمێکی دیکە کە بریتی بوو لە دەوات و قەڵەم و بەدەورێوە گوڵەگەنمێک هەبوو نەخشێندرابوو، لەو ڕێورەسمەدا زۆر وتار خوێندرانەوە و پۆلێک لە پێشمەرگان لە دوو بەری شەقامی شاپوور ڕیزیان بەستبوو، بەیەکەوە چەند دەستڕێژیان لە هەوا کرد.

لە دوای دامەزرانی کۆمار، نامە نووسین و نامە گۆڕینەوەی ڕەسمی بەزمانی کوردی لە سەر کاغەز کە مارکی کۆماری کوردستانی پێوە بوو وەباو و وەبرەو کەوت. هەروەها

---

١- مەبەست لە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٤ی هەتاوییە کە لەو ڕۆژە دا هێشتا کۆماری مهاباد ڕانەگەیێندرابوو. کاک سەید محەمەدی سەمەدی لە نووسراوەی " نگاهی دیگر به ژ.کاف، لاپەڕەی ١٤ دا، دەنووسێ: ڕۆژی ٢٦ی مانگی سەرماوەزی ١٣٢٤، خوالێخۆشبوو قازی محەمەد بە ڕەسمی دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان ی ڕاگەیاند و ئاڵای حیزب بە ئارمی تازەوە (جیا لە ئارمی ژ.ک) لە سەر بانی ئیدارەی دادی ئەوکاتی مهاباد لە جیات ئاڵای ئێران هەڵکرا.

٢- (تێبینیی وەرگێڕی کوردی: حوسێنی فرووهەر (زێڕینگەران) ئەندامی ژمارە ١ـی کۆمەڵەی ژیانی کورد و لە کۆمەڵە دا نێوی کاوە ١ بوو و تا ئەو کاتەی ــ پێشەوا قازی محەمەد بوو بەئەندام لە کۆمەڵەدا، سەرۆکی کۆمەڵە بوو. حوسێنی فرووهەر لە ئەفسەرانی کۆماری کوردستان بوو و لە ڕێورەسمی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە مهاباد، نەغەدە، شنۆ و بۆکاندا چالاکانە بەشداریی کرد)

ڕادەیەکی زۆر کاغەزی ڕۆژنامە و دەستگایەکی ماشینی چاپ کە بەکارەبا کاری دەکرد، لە لایەن ڕووسەکانەوە، بەکۆماری کوردستان فرۆشرا و لەو دووکانانەی لە شەقامی شاپوور ڕووبەڕووی کاروانسەری (سەید عەلی)ن دامەزرێندرا و لە ژێر ڕێوەبەری ئاغایانی قادری مودەڕیسی و سەید محەمەدی حەمیدی دەستی بەکار کرد و ئەو چاپخانەیە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی لە چوار لاپەڕەدا بەناوی (کوردستان) و گۆوارێکی حەوتووانەشی هەر بەناوی (کوردستان) چاپ دەکرد[١]. هاوکات لە شاری بۆکانیش گۆوارێک بەناوی (هەڵاڵە)[٢] چاپ و بڵاو دەکرایەوە. بەر لەوانە گۆوارێک بەنێوی (نیشتمان) چاپ و بڵاو دەکرایەوە. گۆواری (نیشتمان) لە گشت چاپەمەنیی کوردی لە ئێران کۆنترە جگە لە ڕۆژنامەیەک نەبێ کە لە سەردەمی سمایل ئاغای شکاک لە ورمێ بڵاو دەبووەوە، دووسێ ساڵ بەرلەوەی کە ماشینی چاپ لە مهاباد دابمەزرێندرێ و چالاکیی حیزبی دێمۆکراتی کوردستانی ئێران[٣] وەڕوو کەوێ و ئاشکرا بێ، ئەو گۆوارە بەنهێنی لە تەورێز یان بەماشینی دەستی لە مهاباد چاپ و بڵاو دەکرایەوە، گۆواری ناوبراو میزاحی و ڕەخنەگرانە بوو و، بەتوندی هێرشی دەکردە سەر خاوەنموڵک و چینی عەشیرەت و خانەکان.

لە دوای ڕاگەیاندنی حکوومەتی جمهووریی کوردستان، لە عێراق و سووریا و شوێنەکانی دیکەی کوردستانەوە، کەسانی جۆربەجۆر کە زۆریان نەناس بوون، بەناوی هەبوونی ڕوحی ئازادیخوازی و نەتەوەپەروەری دەهاتنە مهاباد و لە دەستگای حکوومەتیدا داوای کاریان دەکرد، بەبێ ئەوەی بەوردی لە ناسێنەی ئەوان بکۆڵدرێتەوە، کاریان دەدرایە. پاشان دەرکەوت هێندێک لەوانە سیخوڕ و خراپکار بوون. لەوانە کەسێک بوو بەنێوی "وردی"[٤] کە لە چاپخانە کاری دەکرد و جار جار لە ڕۆژنامەی (کوردستان)یشدا وتاری دەنووسی.

---

١– (تێبینیی وەرگێڕی کوردی: ڕۆژنامەی (کوردستان) دوو ڕۆژ جارێک و جار جار سێ ڕۆژ جارێک بڵاو بووەتەوە و چەند ژمارەی لە ٨ لاپەڕە دا بڵاو بووەتەوە، بە سەر یەکەوە ١١٣ ژمارەی لێ بڵاو بووەتەوە. گۆواری (کوردستان) حەوتووانە نەبووە، بەڵکو " هەر پازدە ڕۆژ جارێک" بڵاو کراوەتەوە.)

٢– بڕوانە: " تاریخ فرهنگ و ادب موکریان"، دانەر ئیبراهیمی ئەفخەمی، لاپەڕەی ٤٧

٣– (تێبینیی وەرگێڕی کوردی: لە سەردەمی جمهووری کوردستان دا " حیزبی دێمۆکراتی کوردستان" وشەی "ئێران"ی بە دواوە نەبوو.)

٤– بە ڕواڵەت نا بەڵکو بە گردبڕی ئەو ئاغای (وردی) یە کە لە مەدرەسەکانی مهابادیش دەرسی دەگوتەوە و هێندێک کتێبیشی نووسیوە سیخوڕ و خراپکار نەبوو بەڵکو ڕووناکبیرێک بوو بیرو ڕا و بۆچوونی ڕووناکبیرانەی خۆی دەردەبڕی. سەبارەت بەو ئاغای (وردی) یە لە کتێبی " چێشتی مجێور" نووسینی هەژار لە لاپەڕەی ٣٩٥ دا باسی زۆر سەرنجڕاکێش هاتووە.

ئەو کەسە لە ڕۆژنامەی (کوردستان)دا وتارێکی نووسیبوو و گوتبووی زۆر لە ئەفسەرانی کۆماری کوردستان، جگە لەوەی هیچ زانیارییەکی عەسکەرییان نییە، بەڵکو بەتەواوی نەزانیشن و تەنانەت ناتوانن ناوی خۆشیان بنووسن و هەروەها زنجیرەیەک ڕەخنەی دیکەشی گرتبوو و لە ڕۆژنامەی (کوردستان)دا چاپی کردبوو.

خوداڵێخۆشبوو محەمەدحوسێن خان کە وەزیری هێزی دیمۆکراتی کۆماری کوردستان بوو، بەخوێندنەوەی ئەو وتارە زۆر دڵمەند و تووڕە بووبوو، وێڕای سەرکۆنەی بەرپرسی ڕۆژنامـــــە، چەند زللەیەکی لە (وردی)دا. بەهەڵکەوت ئەودەمی ئەمن لەوێ بووم. لە خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان کە جگە لە خزمایەتی لەبەر هاوپۆل بوون لە سەردەمی خوێندن و دۆستایەتی لە زەمانی منداڵییەوە، لوتفێکی تایبەتی لە ئاست من هەبوو، پرسیارم کرد بۆچی تووڕە بووی و لەبەرچی زللەت لەو پیاوە غەریبە دا؟ ئەو خوداڵێخۆشبووە لە وڵامدا گوتی ڕۆژنامەی (کوردستان) ئۆرگانی حیزبی دیمۆکراتی کوردستانە و ئەو ڕۆژنامەیە دەگاتە زۆر شوێن. خەڵک کە ئەو جۆرە نووسراوانە لە ڕۆژنامەکەدا ببینن، پێیان وا دەبێ کۆماری (کوردستان) حکوومەتێکی عەشیرەتی و دواکەتوویە و پێی ڕەشبین دەبن.

هەرچۆنێک بێ، خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد نزیکەی ساڵێک بەهەبوونی عینوانی پێشەوایی و سەرۆکایەتیی کۆمار و ڕێبەریی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان حکوومەتی کرد. دەبێ ئەو خاڵە جەخت بکرێتەوە، حیزبی کۆمەڵەی کوردستان لە سەرەتاوە کە لایەنگری دین بوو و ڕەنگی چەپی بەخۆیەوە نەگرتبوو، هەتا بڵێی بەهێز و بەدەستەڵات بوو و مرۆ دەکرێ بڵێ زۆربەی خەڵکی کوردستان بەدڵ لەگەڵی بوون و تەنانەت ئامادەبوون لە پێناو پێشکەوتنیدا گیانی خۆشیان فیدا بکەن. بەڵام کاتێک ناوی لە (حیزبی کۆمەڵەی کوردستان)ەوە بوو بەحیزبی دیمۆکراتی کوردستان و ڕووسەکان دەستیان تێ وەردا و ڕەنگی چەپی بەخۆیەوە گرت، خەڵک بەتایبەتی سەرمایەداران و خاوەن موڵکان و مەلاکان لە دڵەوە لە حیزبی دیمۆکراتی کوردستان هەڵگەڕانەوە، بەڵام بەڕواڵەت بەناچاری و یان بەزۆری لەگەڵی بوون و گوێڕایەڵییان لێ دەکرد. هۆی دژایەتیی ئەوان زۆر ئاشکرا بوو چونکو خاوەن موڵکانی بەدەستەڵاتی کورد کە لە گوندانا هیچ مافێکیان بۆ ڕەعیەتان نەدەسەلماند و خۆیان هەموو شت بوون و خاوەنی گیان و ماڵی ڕەعیەتەکانیان بوون، چۆن ئامادە دەبوون لەگەڵ ڕەعییەتەکانی خۆیان لە هەلومەرجی یەکسان و هاوشانی ئەوان، بەبێ هێچ ئیمتیاز و جیاوازییەک بژین؟ جا بۆیە، ئاشکرایە لە بنەوە و بەنهێنی و لە بن

پەردە هەم لەلایەن خاوەن موڵکانی سەرەکی و هەم لە لایەن کەسانی گومان لێکراو و نەناسراو کە بەناوی لایەنگری لە سەربەخۆیی کوردستان لە وڵاتانی عێراق و سووریاوە هاتبوون، بۆ خاشەبڕکردنی ڕیشەی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان چالاکی دەکرا.

وەبیرم دێ جارێکیان لە لایەن ئیدارەی تەبلیغاتی کوردستانەوە، شانۆیەک لەسەر بانی خانووبەرەی دوخانیات کە بەباستیان بەناوبانگە، ئامادە کرابوو و لە تەواوی سەرۆک عەشیرەتەکان و خاوەن موڵکان و پیاوانی ئاینییان گێڕابووەوە، نووسەریش لەوێ ئامادە بووم، لە ڕیزی یەکەمی بینەراندا، سەرکردە هەڵکەوتووەکانی کوردستان، لەوانە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، مەلا مستەفای بارزانی، حاجی بابەشێخی سیادەت، سەرکردەکانی عەشیرەتەکانی جەلالی، شکاک، زەرزا، مامەش، مەنگوڕ، گەورک، دێبوکری و ژمارەیەکی دیکە لە خەڵکی ناسراو دانیشتبوون. بەرلە پێشکێشکردنی شانۆکە کاتێکیان تەرخان کردبوو بۆ شێعر خوێندنەوە لەلایەن کەسێکەوە ناسراو بە(وردی)[1]. نێوەرۆکی شێعری نێوبراو کە بەزمانی کوردی بوو، سەبارەت بەڕاپەڕینێک بوو کە جووتێرانی ڕووسی لە شۆڕشی بۆلشێڤیکیدا کردبوویان. لەو قەسیدەیەدا بە وردە ڕیشاڵی باسی ئەوە کرابوو چۆن وەرزێرانی ڕووسی بەکێرد و شیر زگی خاوەن موڵکانیان هەڵدڕیوە، سەرودەستیان بڕیون و بە تەناف بەدارەوە هەڵیان ئاوەسیون و ژن و منداڵی ئەوانیان یەخسیر کردووە و ماڵەکانیان تاڵان کردوون و دوایە ئاوریان تێ بەرداون. خاوەن موڵکانی ئامادە بەبیستنی قەسیدەی نێوبراو کە هێشتا نیوەچڵ بوو و تەواو نەبووبوو هەتا بڵێی ترسیان ڕێ نیشتبوو و تووڕە بوون و دەستیان کرد بەبۆڵەبۆڵ و شەرمەزارکردنی ئەو جۆرە قسانە. ئەمن بەدڵپەشێوی و نیگەرانییەوە چاوەڕێ بووم ببینم ئەو شێعرە مەرگاوییە ئاکامی چ دەبێ؟ داخوا ئامادەبووان بێدەنگەی لێ ڕادەکەن یان بەگژی دادەچن؟ لە پڕ دیتم خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە سەر کورسی خۆی هەستا و بەدەنگێکی تووڕە بەسەر خوێنەرەوەی شێعرەکە ئاغای (وردی)دا گوڕاندی بەسە بەسە، ئەم قسە قۆڕانە چییە، بڕۆ ون بە لەبەرچاوم. دوایە خوداڵێخۆشبوو قازی لە ڕیزی بینەران هاتە دەرێ، سەرپەرستی شانۆکەی بانگ کرد و پێی گوت: چ کەسێک ئیزنی داوە بەو کابرایە ئەو قسە قۆڕانە

---

١- بابم بەدووی ئەو ڕستەیە لە نێو کەوانەدا ئاوای نووسیوە: (ئەو ئاغای وردی)یە هەمان کەسێک بوو کە پێشتریش نێویم برد و نووسیم لەبەرئەوەی وتارێکی سەبارەت بە نەخوێندەوار بوونی ئەفسەرانی ئەرتەشی کوردستان لە ڕۆژنامەی (کوردستان)دا بڵاو کردبووەوە، خواڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان شەپلاغەی لێ دا).

ئەویش لە مەجلیسێکی ئاوادا کە گشت خاوەن موڵکان و پیاو ماقووڵانی کوردستان تێیدا ئامادەن، بخوێنێتەوە؟

نێوبراو بێ ئاگابوونی خۆی لەو بارەیەوە ڕاگەیاند. دوایە قازی بەزمانێک کە بۆنی سەرکۆنەی لێ دەهات بەبەرپرسەکەی گوت: بۆ چما ئێوە پێشتر نێوەرۆکی شانۆنامە و شێعر و ئەو شتانەی لە ڕۆژنامەدا بڵاو دەبنەوە ناخوێننەوە؟ ئەو بێ سەر و بەرییە بۆچی؟ بەرپرسەکە چ وڵامێکی نەبوو، بەخودالێخۆشبوو قازی محەمەدی بداتەوە، بەناچار سەری دەبەرەخۆی نابوو. خودالێخۆشبوو قازی محەمەد کە زۆر تووڕە بووبوو، دوای ئەو قسانە گەڕاوە شوێنی خۆی و شانۆ دەستی پێ کرد، بەڵام لە ڕواڵەتی بەپەژارە و تووڕەیی ئامادە بووانڕا دیار بوو قەسیدەی ئاغای وردی کاری خۆی کردووە. هیچ کام لە عەشیرەتەکان و خاوەن موڵکان لەگەڵ ڕێژیمی دێموکراتی کوردستان کە بەڕێژیمێکیان دەزانی بەرەو کۆمۆنیستیی رادەکێشێ، ڕێک نەبوون.

جارێکیان دێبۆکرییەکانی محاڵی (ئێلخانیزادەکان، عەلییارەکان، کوڕانی باپیرئاغای قارەمانی) ڕاپەرینێکیشیان کرد، پردی میراوا لە نزیک بۆکانیان ئاور تێ بەردا و لەشکرێکیان کۆ کردەوە و لە گوندەکانی سەردەرابات و کانیە ڕەش دایان مەزراندن. بەڵام قازی محەمەد لەو بارەیەوە پەرچەکرداری توندی نیشان نەدا. لە پێشدا مەلا محەمەدی لاجانی و دوایە مەلا مستەفای (بارزانی) ڕائەسپارد بەبێدەنگی ئەو غائیلەیە کپ بکەن. لە ئاکامدا مەلا مستەفا بەسەد و پەنجا کەس لە تاکوتەرای پیادەی بارزانی (تاکوتەرای بارزانی بەگشتی پیادە بوون)یەوە چووە بۆکانێ و لەوێ لەگەڵ مەحموود ئاغای ئێلخانیزادە و ڕدێن سپییەکانی دیکەی عێلی دێبۆکری وتووێژی کرد. دێبۆکرییەکان کە مەلا مستەفایان بەهێند دەگرت و حیسابیان بۆ دەکرد، بە ڕواڵەت گوێڕایەڵی خۆیان ڕاگەیاند و ئاشت بوونەوە و سازشتیان کرد. مەحموود ئاغا مەلا مستەفای بانگهێشتن کردبوو بۆ گوندی حەمامیان و چەند کیلۆمیتری بمێنێ بۆ گوندەکە بەرەوپیلی چوو بوو و بەگەرمی پێشوازیی لێ کردبوو و بەحورمەت و ڕێزێکی زۆرەوە بردبوویە نێو گوندەکە و میواندارییەکی شیاوی لێ کردبوو. دێبوکرییەکان لە وتووێژی نهێنیدا بەمەلا مستەفایان گوتبوو قازی محەمەد مەلا و پیاوێکی ئاینییە و بەکاری سەرپەرستی و سەرۆکایەتی کۆماری کوردستان نایە، ئەگەر ئێوە خۆتان سەرپەرستیی نەتەوەی کورد قبووڵ بکەن ئێمە هەموومان بەگیان وماڵ گوێڕایەڵیتان لێ دەکەین. مەلا مستەفا ئەو پێشنیازە وە دوا دەداتەوە و پێیان دەڵێ: حاڵی حازر ئێمە لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئێران و عێراق و ترکییە و دۆستەکانیان دوژمنایەتیمان

هەیە و هیچ دەوڵەتێکیش پشتیوانیی کاریگەر و تەواو لە ئێمە ناکا، بۆیە باشتر وایە بەهەر شێوەیەک بێ، یەکێتی و ڕێکی و دڵپاکیی نێوان خۆمان بە پتەوی بپارێزین، بۆ ئەوەی دژبەرانی بە دەستەڵات و سەرسەختی ئێمە لە بڵاویی ئێمە کەلکی خراپ وەرنەگرن و ورد و نابوودمان نەکەن. لە دوای ئەوەی خەباتی ئێمە گەیشتە پلەی کۆتایی، بەڕوو تێکردن لە بیروڕای گشتی یان پەسندی سەرۆک و ڕدێن سپییەکانی قەومەکەمان، سەرۆک کۆمارێک هەڵدەبژێردرێ.

بەکورتی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، ماوەی ساڵێکی تەواو لە ٢١ی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی تا ٢٠ی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥ بەهەبوونی عینوانی "پێشەوایی" و سەرۆکایەتیی جمهووریی کوردستان، حکوومەتی کرد و بە درێژاییی ئەو ماوەیە لەبەر دژایەتیی هێزە جیهانییەکان، ئینگلیس و ئەمریکا و هەبوونی دژایەتیی زۆری نێوخۆیی کە لە تایبەتمەندییە زاتییەکانی نەتەوەی چارەڕەشی کوردە و وەک شاعیری پایەبەرزی کورد، مەلا مارفی کۆکەیی کە دەفەرموێ:

کوردیش چ کوردە؟ میللەتی خۆخۆرە پێکەوە
بۆ جان و ماڵی یەکدی سمکۆڵ دەکەن لە خۆڵ

و لەبەر گوێڕایەڵی نەکردن و سەمیمی نەبوونی هێندێک لە سەرۆک عەشیرەتەکان، بەتایبەتی بنەماڵەی قەرەنی ئاغای مامەش و عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد و محەمەد ئاغای عەبباسی و بنەماڵەی حاجی بایز ئاغا و مەحموود ئاغای دێبۆکری و دواجار گشت تاکوتەرای عێلی دێبۆکری، خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، نەیتوانی کارێکی گەورە بکا، جگە لە هێنانی چاپخانەیەکی کارەبا و بڵاوکردنەوەی گۆوار و ڕۆژنامە بەزمانی کوردی نەبێ، جێی ئاماژەیە لە سەردەمی دەستەڵاتی خودالێخۆشبوو قازی محەمەددا لە قوتابخانەکانی مهاباد و دەوروبەری خوێندن بەزمانی کوردی بوو و چاپەمەنی، پێوەندی و نووسینیش بە زمانی کوردی بوو.

لەماوەی ئەو یەک ساڵەدا جگە لە چەند پێکدادانی پچووک لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان لە دەوروبەری سەردەشت و شەڕێکی گرینگ لە نزیک سەقز نەبێ، شەڕ و تێکگیرانێکی ئەوتۆ نەقەوما. ئەو شەڕەی نزیک سەقز کە بەشەڕی (مامەشا) ناسراوە، گرینگ بوو. ئەو شەڕە ژمارەیەکی بیست کەسی لە نەفەرەکانی بارزانی لە ژێر فەرماندەریی سەرپۆلی ٢ مستەفا خۆشناودا کردیان.

لێرەدا وەبیرهێنانەوەی ئەو خاڵە پێویستە مستەفا خۆشناو و میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی و عێزەت عەبدولعەزیز، بەکر حەوێزی، خەیروڵلا، محەمەد مەحموود، سەید عەبدولعەزیز(١) کوڕی حاجی سەید عەبدولا ئەفەندی، هێندێک لەو ئەفسەرە کوردانە بوون کە لە ئەرتەشی عێراقدا خزمەتیان دەکرد. دوای ڕاپەڕینی بارزانییەکان لە ساڵی ١٣٢٣ی هەتاوی لە عێراق، ئەو ئەفسەرانە لە سەرەتاوە وەکو ئەفسەری پێوەندی لە نێوان دەوڵەتی عێراق و بارزانییەکان کاریان دەکرد. پاشان ئەو ئەفسەرانە هەموویان لەگەڵ بارزانییەکان کەوتن و هاوکارییان لەگەڵ کردن و ئەرتەشی عێراق ڕاوەدووی نان و وەک کەسی هەڵاتوو بۆ لای دوژمن، پاشملە حوکمی ئێعدامی هەموویانی دەرکرد. ژمارەیەک لە ئەفسەرانی نێوبراو، لەوانە، مستەفا خۆشناو، عێزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد مەحموود کە گەڕابوونەوە عێراقێ، لەوێ گیران و هەموویان ئێعدام کران، بەڵام میرحاج و سەید عەبدولعەزیز و ژمارەیەکی تر لەگەڵ مەلا مستەفا لە ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی دوای زنجیرەیەک پێکدادان و تێکگیران لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتی ئێران و عەشیرەتە کوردەکان وەکو مامەش و مەنگوڕ کە لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان هاوکارییان دەکرد، وەک پەنابەری سیاسی چوونە نێو خاکی رووسیە و دوای کودەتای عەسکەری بەنێوبانگی عێراق لەژێر سەرکردەیی سەرتیپ عەبدولکەریم قاسم کە لە ٢٧ی مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٣٧ی هەتاویدا روویدا و بەکوشتنی مەلیک فەیسەڵ پادشای جەوانی عێراق و نووری سەعید سەرۆک وەزیر و عەبدولئیلاهی وەلیعەهد، تەواو بوو، گەڕانەوە عێراقێ.

ئێستا بابگەڕێینەوە سەر باسی بابەتی شەڕی مامەشای کە ئاوایان بۆمن گێڕاوەتەوە:

لە جەبهەی سەقزدا لە دوو خاڵی نزیک لە یەکدی دوو پۆستی بچووک لە تاکوتەرای بارزانی دامەزرابوون، هەر پۆستەی دە کەس بوون. چەند ڕۆژ بەر لە شەڕەکە، چەند گوردانی پیادەنیزام و چەند دەستگا تانک بۆ مانۆڕدان دەگەنە دەوروبەری ئەو پۆستەی کە لەژێر فەرماندەریی میرحاجدا بوو، و لەوێ دەست دەکەن بەمانۆڕدان و جموجۆڵی سەربازی. میرحاج لەو مانۆڕە نیگەران دەبێ، گومانی نامێنێ ئەوە دەستپێکێکە بۆ هێرش هێنان بۆ سەر پۆستەکەی ژێر فەرماندەریی خۆی، بۆیە دەستبەجێ نامەیەک بۆ مستەفا

---

١- سەید عەبدولعەزیزی گەیلانیزادە ڕۆژی پێنج شەمۆ ٢٧ / ١٢ / ٧٧ ی هەتاوی لە شاری ورمێ ماڵاوایی لە ژیان کرد. (تێبینیی وەرگێڕی دەقی کوردی: سەید عەبدولعەزیزی گەیلانیزادە (شەمزینی) پێشتر لە ئاوریلی ١٩٤٦دا لە گەڵ خوێندکارانی تر، لە لایەن کۆماری کوردستانەوە نێردرابوو بۆ باکۆ.)

خۆشناو دەنووسێ و پێی ڕادەگەیێنێ چەند ڕۆژە ژمارەیەکی زۆر لە هێزەکانی دەوڵەت لە دەوروبەری سەنگەری پێشمەرگەکانی من خەریکی مانۆر دان و تاقیکردنەوەی و ناسینی زەوین و وابزانم بەزوویی پەلامارمان بدەن، بۆیە باش دەبێ ئێوە هەرچی زووتر لەگەڵ ئەو پێشمەرگانەی لەبەر دەستتاندایە لەگەڵ ئێمە کەون و وەفریامان بێن، چونکو هێزی دوژمن بەپشتیوانیی تانکی قورس و فڕۆکە و تۆپخانەی ١٠٥ گەلێک بە هێزە و ئەمن بەو چەند پێشمەرگەیەوە ناتوانم خۆڕاگری بکەم. مستەفا خۆشناو وڵامی دەداتەوە ڕاستە جموجۆڵ و مانۆر لە دەوروبەری پێگەی ئێوە دەکرێ، بەڵام ئامانجی سەرەکی ئەمنم و هێرش دەکەنە سەر من، بۆیە ئێوە خاترجەم بن و بێ نیگەرانی لە شوێنی خۆتان بمێننەوە و مەبزوون و ئەمن لەگەڵ نەفەرەکانم بەرگری دەکەم. سەرپۆلی ٢ مستەفا خۆشناو گێڕابوویەوە لەبەرئەوەی شوێنی تاکوتەرای من پتەو نەبوو و دڵنیا بووم هێرش دەکەنە سەر پێگەکەی من، بۆیە بیرم لە کەڵەکێکی شەڕ کردەوە و بەشەو لە تاریکیدا بێ ئەوەی لای تر هەست پێ بکا، سەدمیتر چووینە پێشەوە و سەنگەری تازەمان لێ دا و گڵی سەنگەری تازەمان بەنێو پنچک و گیاوگۆڵدا بڵاو کردەوە بۆ ئەوەی هیچ شوێنێک لە سەنگەری تازە نەبیندرێ و سەنگەرەکەی پێشوومان کە دوژمن نەخشەی لێ هەڵگرتبوو و بەوردی دەیزانی لە کوێ هەڵکەوتووە چۆڵ کرد. ڕۆژێک دوای هەڵکەندنی سەنگەری تازە بەرەبەیانی یەکێک لە ڕۆژەکانی مانگی پوشپەڕی ١٣٢٥ تاریک و ڕوون، فڕۆکەکانی دوژمن لە ئاسمانەوە و تۆپی ١٠٥ لە زەوییەوە سەنگەرەکەی پێشوویان بە گومانی ئەوەی ئێمەی تێدا دامەزراوین بە شێوەیەکی ئەوتۆ دا بەر تۆپ و بۆمباران کە لە ماوەی چەند دەقیقەدا سەنگەرەکە بوو خەڵووز و بەتەواوی سەروبن بوو و شوێنێکی لێ نەما، بێ خەبەر بوون لەوەی شەوێ چۆڵمان کردووە و نزیکەی سەد میتر بەرەو پێشەوە چووین. دوای کوتانی سەنگەرەکەی پێشوومان، پیادە نیزامی دوژمن بەخەتی زنجیر پەلاماریان داین. ئێمەش بەوپەڕی لەسەرەخۆیی و بێ ئەوەی بپەشۆکێین چاوەڕێمان کردن تا گەیشتنە مەودای سەدمیتریی ئێمە و دوایە بەئاوری موسەلسەلی قورس و سووک دامانگرتن بەشێوەیەک کە سەربازانی پەلاماردەر وەک گەڵای پایزی هەڵدەوەران و دەکەوتنە سەر زەوی و پەلاماردەران بەچەشنێکی وا تووشی ئاوری ئێمە هاتن و خەساریان وێ کەوت بە تەواوی پەشۆکان و چەکەکانیان فڕێ دا و هەڵاتن و ئێمە بەدوویاندا چووین و ژمارەیەکمان لێ بەیەخسیر گرتن، دوایە یەخسیرەکانمان بەردا؛ چونکو ژمارەی یەخسیرەکان پێنج شەش هێندەی ئێمە دەبوون و گوللەشمان زۆر کەم پێ مابوو و لە یەخسیرەکان دڕدۆنگ بووین هێرشمان بکەنە سەری و بەمست و پێلاقە لە

پێمان خەن. بەکورتی هێزی دەوڵەت لەو شەڕەدا زیاتر لە دووسەد کوژراو و برینداری لێ بەجێ ما و لە تاکوتەرای بارزانی تەنێ کەسێک بەنێوی خەلیل خۆشەوی کە یەکێک لە فەرماندەرانی بەنێوبانگ و لە کەسانی نزیکی مەلا مستەفا بوو، شەهید کرا و یەکێکیش بریندار بوو.

ئەو هێرش و شەڕی وەیشوومە بۆ هێزە دەوڵەتییەکان (ناسراو بەشەڕی مامەشا) بە فەرمانی سپەهبود حاجی عەلی ڕەزم ئارا، سەرۆکی ستادی ئەرتەش و پشکنێری بەرزی سەربازی کە بۆخۆی ئەو دەمی لە سەقز بوو، ئەنجام درا و هەر وەک باسمان کرد لەو شەڕەدا خەسارێکی زۆر وە هێزی دەوڵەت کەوت. تاکوتەرای بارزانی و ئەفسەرەکانیان جگە لە ئازایەتی و بوێریی زاتی لەبەرئەوەی زۆرجار مەیدانی نەبەردییان دیبوو و لە عێراق لە زۆر شەڕدا بەشدارییان کردبوو، هەموویان کارامە و لەگەڵ دوایین پرێنسیپی شەڕدا ئاشنا بوون و لە بەرانبەر سەرما، گەرما، برسێتی، تونێتیدا، خۆراگری و دەربردنیان جێی واق ورمان بوو، تەنانەت حاجی عەلی ڕەزم ئارا، سەرۆکی ستادی ئەرتەش خۆی، لە مەجلیسی شوورای میللی وێڕای باسکردنی شەڕی بارزانییەکان، نەیتوانی لە پەسندان و ئافەرینی تاکوتەرای بارزانی خۆی بدزێتەوە و ئەوانی بەباشترین سەربازی دنیا وەسف کرد.[1]

بەڵام بارودۆخ و هەلومەرجی دنیا ڕێگای نەدا حکوومەتی خۆموختاری کوردستان لەوە زیاتر دەوامی هەبێ. شەڕی دووەمی دنیاگرەوە بەشکانی تەواوی ئاڵمانی نازی و هاوپەیمانەکانی ژاپۆن و ئیتالیا کۆتایی هات و سەرکەوتوو و ژێرکەوتوو، ماندوو و فل بووبوون و حەوجێیان بە حەسانەوە و چاککردنەوەی کاولکراوەکان بوو و ئامادە نەبوون لەبەر ئازەربایجان جارێکی دی ئاوری شەڕ هەڵگیرسێننەوە. لە لایەکی دیکەوە، سەرانی سێ دەوڵەتی مەزن ئەمریکا، ئینگلیس و شوورەوی لەو کۆنفرانسەیدا کە لە مانگی سەرماوەزی ١٣٢٢ی هەتاوی لە تاران بەستیان سەربەخۆیی و یەکپارچەیی خاکی ئێرانیان بەرەسمی ناسیبوو و دەستەبەریان کردبوو و بەو شێوەیە دیارە حکوومەتی پیشەوەری لە تەورێز و حکوومەتی کوردستان لە مهاباد نەیاندەتوانی دەوام بهێنن. چونکو

---

١- لە دوای هاتنەوەی هێزی دەوڵەت بۆ هەرێم، ڕەزم ئارا لە لایەن (مەجلیسی شوورای میللی)یەوە خرایە بەر لێپرسینەوە (أستیضاح) کە بۆچی دەرپەڕاندنی ژمارەیەک پایەتی (مەبەستی قسەکەر، بارزانییەکان بوو) ئەوەندەی درێژە کێشا؟ ڕەزم ئارا لە وەڵامدا گوتی: ئەوانە پایەتی نین، بەڵکو بەباشترین سەربازی دنیا دەژمێردرێن.

بۆ خۆیان لە وزەیاندا نەبوو خۆیان بپارێزن و کەسیش نەیدەتوانی بەئاشکرا پشتیوانییان لێ بکا، هەروەها ئەحمەدی قەوامولسەڵتەنە سیاسەتمەداری کۆنەکار کە سەرۆک وەزیری ئێران بوو، بەڕواڵەت لەگەڵ ڕووسەکان سەبارەت بەوەی ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی باکوریان بداتێ ڕێککەوتبوو بەو مەرجەی ڕووسەکان دەست لە کاروباری ئازەربایجان و کوردستان وەرنەدەن و کارشکێنی نەکەن و هێزەکانی خۆیان بەرنە دەرەوە. دووەم پەیماننامەی نەوت کاتێک شیاوی جێبەجێکردن بێ کە مەجلیسەکانی شوورا و سەنا[1] پەسندی بکەن و قۆڵی لە سەر بکێشن و دوایە شا واژۆی بکا. ڕووسەکان ئەو مەرجانەیان قبووڵ کرد، لەگەڵ ئەوەشدا بۆ چۆڵکردنی ئازەربایجان و لێ دەرکەوتنی پێ دزیلکەیان دەکرد، تا ئەوەی کە دەوڵەتی ئێران لە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەککگرتووەکان شکایەتی لێ کردن. لە ئاکامی گوشاری نەتەوە یەککگرتووەکاندا، ڕووسەکان ناچاربوون ئازەربایجان بەجێ بهێڵن. دوای ڕۆیشتنی ڕووسەکان هێزی دەوڵەتی نێردرا بۆ ئازەربایجان.

دوایە ڕووسەکان داوایان، لە قەوامولسەڵتەنە کرد، نێوەڕۆکی پەیماننامەی دانی ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی باکور جێبەجێ بکا. قەوامولسەڵتەنە بەپێی بەڵێنێکی دابووی، لایحەکەی ئامادە کرد و بردی بۆ مەجلیسی شووڕای میللی، بەڵام لایحەی نێوبراو لەلایەن نوێنەرانەوە بەتایبەتی خوالێخۆشبوو دوکتور محەمەدی موسەدیق بەتوندی دژایەتیی لەگەڵ کرا و لایحەی گۆڕین بۆ هەمیشە چاڵ کرا.

هێزە دەوڵەتییەکان دیسان سەرتاسەی کوردستان و ئازەربایجانیان داگیرکردەوە، ژمارەیەک لە سەرهەڵداوانیان ئێعدام و هێندێکیان خستە بەندیخانەوە. خوالێخۆشبوو قازی محەمەدیش یەکێک لەو کەسانە بوو کە بەتاوانی داوخوازی سەربەخۆیی و جوداییخوازی و گۆڕینی ئاڵا و دواجار پێکهێنانی کۆماری کوردستان، لەو دادگە عەسکەرییەی لە مهاباد پێک هات، محاکەمە کرا. خوالێخۆشبوو قازی محەمەد و برایەکەی خوالێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی و ئامۆزایەکەی خوالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی، بە ئێعدام حوکم دران و لە مەیدانی بە نێوبانگی چوارچرا، هەر ئەو شوێنەی پێشتر لەوێ خوالێخۆشبوو قازی محەمەد بەڕەسمی حکوومەتی جمهووریی کوردستانی ڕاگەیاند بوو، لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەمۆ دەی

---

[1]- لەو ڕێکەوتەدا هێشتا مەجلیسی سەنا دانەمەزرابوو. ئەو مەجلیسە وێڕای هێندێک گۆڕان لە قانوونی بنچینەییدا، لە لایەن مەجلیسی موئەسەسان (دامەزرێنەران)ە وە پێک هات.

مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی لە سێدارە دران.

وردە ڕیشاڵی هاتنەوەی هێزەکانی دەوڵەت بۆ کوردستان و گیران و محاکەمەی خودالێخۆشبوو قازی محەمەد و ئەوانیدی بە شێوەی خوارەوەیە:

لە سەرماوەزی ١٣٢٥ی هەتاوی (دیسامبری ١٩٤٦) کە هێزە دەوڵەتییەکان بۆ داگیرکردنەوەی کوردستان وە جووڵە کەوتن، لە دوو قۆڵەوە دەستیان بەپێشڕەویی کرد، قۆڵێکیان لە سەقز و تیکانتەپەوە، لە ژێر فەرماندەریی سەرتیپ همایوونی، لەگەڵ سوارەی هەموو تایفە دێبۆکرییەکان (ئیلخانیزادە، عەلییار، عەباسی و دێبۆکرییەکانی مەحاڵی شارویران بەبێ ڕێزبەر). ستوونی دووەم لە قۆڵی سەردەشتەوە لە ژێر فەرماندەریی سەرهەنگ ئایروم، دەستیان بەپێشڕەویی کرد لەگەڵ سوارەی عەشیرەتەکانی مەنگوڕ، گەورک و هەروەها عەشیرەتەکانی دیکەی دەوروبەری سەردەشت کە لە سەر ڕێیە لەگەڵیان کەوتن و بەرەو مهاباد هاتن.

لەو سەروبەندیدا تاکوتەرای خێڵی بارزانی بەتەواوی گوندەکانی دەوروبەری مهاباد، سەقز، سەردەشت و میاندواودا بڵاو بووبوونەوە. ئەوان لەژێر سەرپەرستیی مەلا مستەفای بارزانیدابوون و سەرۆکی ڕۆحانیشیان، شێخ ئەحمەد برا گەورەی مەلا مستافا بوو. ژمارەیەک لە بارزانییەکان چەکدار بوون و ئامادەییی شەڕ و دەستکردنەوەیان لە هەمبەر هێزی دەوڵەتیدا هەبوو، ئەوانی دی بریتی بوون لە پیرە پیاو و ژن و منداڵ کە لە گوندەکان دامەزرابوون و ژیانیان لە لایەن خاوەن موڵکان و دانیشتووانی ئەو گوندانەی لێیان بوون، دابین دەکرا.

دوای پێشڕەویی ستوونەکانی هێزی دەوڵەتی و چریکی عەشیرەتی هاوڕێیان، خێزانە بارزانییەکان بەرە بەرە بەرەو مهاباد پاشەکشەیان کرد و لەبەرئەوەی بارزانییەکان کەسانی ئازا و شەڕکەر بوون، هێزە دەوڵەتییەکان دەیانەویست تا ئەو جێیەی دەکرێ بێ تووشهاتنی بارزانییەکان و شەڕ و خوێنڕشتن بێنە نێو مهابادەوە. هێزە دەوڵەتییەکانی (قۆڵی سەقز- بۆکان) لە ڕۆژی ٢٦ی سەرماوەزی ١٣٢٥ی هەتاوی هاتنە نێو بۆکان و بەتەلەفون پێوەندییان کرد بەخودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە مهاباد. قازی محەمەد بۆ چاوپێکەوتنی همایوونی بەرەو بۆکان چوو و لەوێ چاوی بە سەرتیپ همایوونی کەوتبوو. سەرتیپ همایوونی، بۆ ڕواڵەت پارێزی بەوپەڕی حورمەتەوە لەگەڵ قازی محەمەد جووڵابووەوە و گوتبووی: دەوڵەت چ نییەتی خراپی لەگەڵ کەس نییە و لێخۆشبوونی گشتی ڕاگەیاندووە و لە جەنابی بەڕزتان داوا دەکا کە کارێکی وا بکەن، هێزی دەوڵەتی بەخێرایی

و هاسانی بێتەوە نێو مهاباد و زەمینەی دەرپەڕاندنی بارزانییەکان لەوێ ئامادە بکەن.

سەرەڕای قسەی سەرتیپ هومایوونی، ئاشکرا بوو، ئەرتەش سەبارەت بەخودالێخۆشبوو قازی محەمەد نییەتێکی باشی نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا نەیروو نەهاتبووە نێو مهابادەوە و کەسانی شەڕکەری بارزانی لە مهاباد و دەوروبەری دامەزرابوون و چەکوچۆڵ و موهیمماتێکی زۆرلە بەردەست بارزانی و خەڵکی مهاباددا بوو، سەرتیپ هومایوونی لەو دەمیدا جگە لە هێوری و لەسەرەخۆ جووڵانەوە هیچ چارەیەکی دیکەی نەبوو، لە کاتێکدا بەدڵ پێی خۆش بوو، عەشیرەتەکان بەبێ دەستێوەردانی ئەرتەش بە دژی خەڵکی مهاباد هێندێک کار بکەن و، هەر بۆیەش لە گوندی حەمامیان هێندێک وتووێژی نهێنیی لە نێوان فەرماندەرانی ئەو هێزانەی لە لایەن دەوڵەتەوە ناردرابوون و ئاغاکانی دێبۆکری بەڕێوە چووبوو و لەوانە قسەی ئەوە هاتبووە گۆڕێ هەر لەوێ (گوندی حەمامیان) قازی محەمەد بکوژن و دوایە سوارەی دێبۆکری بەر لە هاتنی نەیروو بۆ نێو مهاباد، هێرش بکەنە سەر ئەو شارە، بەڵام هێندێک لە هەمان ئاغایانی دێبۆکری (لەوانە ئاغای جەعفەری کەریمی کە بۆ خۆی سەرۆکی ستادی هێزی حکوومەتی کوردستان بوو) دژایەتیی ئەو بۆچوونە دەکەن و ڕادەگەیێنن هەنگاوێکی ئەوتۆ بەمەسڵەحەت نییە، چونکو مهابادییەکان چەکدارن و بێتو لە لایەن عەشیرەتەکانەوە هێرش بکرێتە سەر گیان و ماڵیان، بەرگری لە خۆیان دەکەن و ئاکامی ئەوەش دەبێتە کوشتوبڕ و خوێنڕێژی. جا بۆیە دەست لەو فیکرە هەڵدەگرن و ئەو هێزەی ناردرابوو لە بۆکانەوە هاتە نێو میاندواوەوە.

بەگەیشتنی هێز بۆ میاندواو ژمارەیەک لە پیاوماقووڵانی مهاباد و دەوروبەر لەوانە مارفاغای ئەمیرعەشاییریی خاوەنی دێی شاوەلێ، بایزی عەزیزاغای گەورک، شێخ حەسەنی شەمسی بورهان ئاغای کولیجە، حاجی مستەفای داوودی، محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی چوون بۆ چاوپێکەوتنی هێزی دەوڵەتی لە میاندواو و لەبەرئەوەی هێشتا تاکوتەرای بارزانی لە دەوروبەری مهاباد و نێوخۆی مهاباد مابوونەوە، بۆیە ئەورۆژەش هێزی دەوڵەتی بەرەو مهاباد نەبزووت و هەرلە میاندواو مایەوە. کاتێک ئەو هەیئەتە لە میاندواوڕا گەڕانەوە مهاباد، ئەمن نووسەری ئەم دێڕانە بۆئاگاداربوون لە هەلومەرج چوومە لای محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی، نێوبراو تا ڕادەیەکی زۆر خۆشبین وەبەر چاو دەهات و تەنانەت پێی گوتم یەک لە ئەفسەرانی ئەرتەش کە ناوی موساوات بوو و پلەی سەروانی هەبوو، لە پێش من هەمیشە بەحاڵەتی خەبەردار ڕادەوەستا و زوو زوو بۆ ڕێزنواندن دەستی هەڵدەهێنا.

هەرچۆنێک بێ لەبەرئەوەی بارودۆخەکە زۆر نادیار و شێواو و جێگای دڵەڕاوکێ بوو، هەر ئەوی شەوێش چوومە مەحکەمەی قازی محەمەد (مەحکەمە جگە لەوەی شوێنی پێڕاگەیشتن بەداد و دۆزی خەڵک بوو و کارو باری قەزایی لەوێ جێبەجێ دەکرا، شوێنی میوانداری لە میوانانیش بوو). مەلا مستەفای بارزانی و هێندێک لە ئەفسەرەکانی و چەند کەسی دیکەی خەڵکی ئێرە و ئەوێش لە مەحکەمەی قازی ئامادەبوون. چەند دەقیقەی پێ نەچوو، تەلەفۆن زەنگی لێ دا. سەرتیپ هومایوونی لە میاندواوەوە بەتەلەفۆن لە خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی پرسی داخوا بارزانییەکان لە مهابادن یان نا؟ خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان وڵامی ئەرێیی دایەوە. دوایە محەمەد حوسێن خان قسەکان و بۆچوونی سەرتیپ هومایوونیی لەگەڵ مەلا مستەفا هێنایە گۆڕێ. مەلا مستەفای بارزانی لە وڵامدا گوتی ئەگەر ئێوە موافەقەت بکەن ئەمن پێشی قوشوونی دەوڵەتی دەگرم و شەڕیان لەگەڵ دەکەم. خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان گوتی: گریمان چەند ڕۆژێکیش خۆڕاگری بکرێ، ئاخری تێک دەشکێین و دەوڵەت شاری بۆمباران دەکا و هەموو جێیەک کاول دەبێ و ژن و منداڵی بێ تاوان دەکوژرێن. مەلا مستەفا لە وڵامدا گوتی: جا ئەگەروا بێ، ئەمن دەڕۆم و چەک دانانێم و تەسلیمی دوژمن نابم، بەڵام ئێوە کە خۆتان تەسلیم دەکەن، دوایە پەشیمان دەبنەوە، لێتان یەقین بێ، بەزەییان پێتاندا نایە و هەڵبەت من کاتێک دەڕۆم تەنانەت تاقە بزنە شەلێکی خێڵی بارزانیش بەجێ نەمێنێ، کاتێک کە گشت تاکوتەرا و شتومەکی ئەوان لە ناوچە چووە دەرەوە و شتێک نەما، ئەو دەمی ئەمن وەڕێ دەکەوم. ئەو کۆبوونەوەیە تا نیوە شەو درێژەی کێشا. لای نیوەشەو یەکێک لە نزیکانی بارزانی خەبەری هێنا گشت کەسان و خێڵی بارزانی بە جلک و سیپاڵ و شتومەکی خۆیانەوە لە مهابادەوە بەرەو سندووس وەڕێ کەوتوون و ئیدی کەسێک و شتێک نەماوەتەوە. مەلا مستەفا هەر کە ئەو خەبەرەی بیست لە جێی خۆی هەڵستا و گوتی ئێستا ئیدی من دەڕۆم و لەکاتێکدا فرمێسکی بەچاویدا دەهاتە خوارێ لە گشت ئەوکەسانەی لە مەجلیسەکەدا بوون ماڵاوایی کرد. بەر لە هەمووان مەلامستەفا خوداحافزی لە قازی محەمەد کرد. بەدەم خوداحافزی و ڕووماچکردن لەگەڵ خودالێخۆشبوو قازی محەمەد، مەلا مستەفا بۆ چەندەمین جار دیسان بەقازی محەمەدی گوت: حەزرەتی پێشەوا وەرە بیکە بۆ خاتری خودا لەگەڵم وەرە، دڵنیا بە تا ئەوکاتەی ئەمن زیندوو بم، ناهێڵم سەختت لێ بگوزەرێ، قەدەمت لەسەر چاوم، شان و شەوکەت و ڕێزی ئێوە هەمیشە دەپارێزرێ و ئێمە وەکو خزمەتکارێکی بە وەفای ئێوە دەمێنینەوە. ئەگەر ئێوە

لەگەڵ ئێمە بن لە ژێر ئاڵای کوردستانی ئازاددا درێژە بەخەبات دەدەین و دنیا خەبات و شەڕەکانی من بەوەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی دادەنێ، بەڵام ئەگەر ئێوە لەگەڵ نەبن نێوی ئاژاوە گێڕی و ڕێگری لە خەباتەکەمان دەنێن و لە کاتێکدا خودا بۆ خۆی گەواهە جگە لە پساندنی زنجیری یەخسیری و ئیستیعمار و وەدەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی بۆ هەموو کوردستان مەبەستێکی دیکەم نییە و ئەگەر مەبەستم لە پلەوپایە و ژیانی ئاسوودە با، دەکرا لەگەڵ فەرمانڕەوایان و جڵەوکێشانی عێراق پێک بێم و وەکو سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان جیرە و مواجب و دراوێکی زۆر وەربگرم و لەوپەڕی ئاسوودەیی و ئێروویدا خۆم و عێل و عەشیرەتەکەم بژین، بەڵام ئەمن جگە لە ئازادی و سەربەخۆیی قەومی کورد ئامانجێکم نییە و بێجگە لەوە، ئیدی شتێکی دیم ناوێ و، لێی زیاد کرد، ئەگەر حەزرەتی پێشەوا لێرە بمێنێتەوە ببڕ ببڕ دەتانکوژن. بەبیستنی دواین ڕستەی قسەکانی مەلا مستەفا، هەموو حازران و مەلا مستەفا خۆشی لەبەر پەرۆشی زۆر وەگریان کەوتن. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد، قسەکانی مەلامستەفای بە زمانێکی خەفەتاوی و بەگریانەوە تەئییدکرد و بەبەرزی نرخاند و ڕای گەیاند پێم باشترە لە نیشتمانی بابوباپیرانی خۆم بکوژرێم و خەڵک لە ناخۆشی و تەنگانەدا بەتەنێ بەجێ نەهێڵم.

پاشان خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد چەند بەرگ کتێب و نەخشە و ئاڵای تایبەتی سەرۆکایەتیی جمهووریی کوردستان و وێنەی سەلاحەدینی ئەیووبی دا دەست مەلا مستەفای بارزانی و گوتی: هیوادارم سەرکەوتوو بی و نەهێڵی ئەم ئاڵا نەتەوەیییەی ئێمە سەرەونخوون بێ. ئەمانە بپارێزە ڕۆژێک بەکارت دێن.

مەلا مستەفا کتێبەکان و ئاڵا و نەخشەکەی وەرگرت، و دای بەسەرهەنگ ۲ میرحاج کە لە تەنیشتی ڕاوەستابوو. میرحاج کە موسەلسەلێکی دەستی پچووک و ساکێکی پێ بوو، شتەکانی لە نێو ساکەکە نا، پاشان مەلا مستەفا لەگەڵ خەڵکەکەی دیکەش دەستی لێ داوە و لە مەحکەمەی قازی محەمەد وەدەرکەوت و لەگەڵ عیدەیەکی ۷۰ نەفەری کە هەموویان بارزانی و پیادە بوون، لەو شەوە ڕەش و تاریکەی سەرماوەزی ۱۳۲۵ی هەتاویدا لەچۆمی مهاباد پەڕییەوە و بەپێیان چووە گوندی کەرێزەی شێخان کە لەیەک فەرسەخیی سەرووی ڕۆژئاوای مهاباد هەڵکەوتووە.

مەلا مستەفا ئەو شەوە لە کەرێزە دەمێنێتەوە و بۆ بەیانی لەگەڵ تاکوتەرای خێڵەکەی بەرەو نەغەدەی سندووس چووبوو.

بەهەڵکەوت ئەو شەوە زۆر تاریک بوو و نم نم باران دەباری، ژمارەیەک لە پیاوماقووڵان و لەوانە حەزرەتی شێخ محەمەد کوڕی شێخی بورهانیش لە مەحکەمەی خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد بوون و لە مەجلیسەکەدا باسی هاتنەوەی هێزی دەوڵەتی و چلۆنایەتیی جووڵانەوەی ئەوان لەگەڵ خەڵک دەکرا، لەوێ ئیستیخارە کرا بەقورئانی مەجید و مەسنەوی مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی، بەهەڵکەوت وڵامی هەردووکیان زۆر خراپ بوو، لە جێدا ئەو شەوە ئەوەندە بە پەشێو بوو دەتگوت لە زەوی و ئاسمانەوە بەڵا و تێماویی و چارەڕەشی دەبارێ، گێژیی و واقوڕمانێکی تێکەڵاو بەترس و پەژارەیەکی زۆر هەموو حازرانی داگرتبوو، لە دەرەوەی مەحکەمە چەند سەگی بەرەڵڵا ڕوویان لە ئاسمان کردبوو و دەوەڕین و بە دەنگی شوومی نەبڕاوی خۆیان کە بە پێی باوەڕی هەرەمەی خەڵک نیشانەی گۆڕانی هەلومەرج و هاتنی بەڵا و تێماویی و چارەڕەشییە هەر دەکڕووزانەوە، هەرچی لێیان وەدەر دەکەوتن و دووریان دەخستنەوە دیسان دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان و دەکڕووزانەوە.

چەند دەقیقە لە دوای چوونی مەلا مستەفا، بە تەلەفۆن بە سەرتیپ هومایوونی خەبەر درا، ئەوەبوو کە بۆ بەیانی ئەو شەوە یان بۆ دووبەیانی، لای نیوەڕۆیە، هێزی دەوڵەتی و سەرتیپ هومایوونی بە بێ هیچ ڕووداو و هەرایەک هاتنە نێو مهاباد. (ئەو دەمی گوترا قازی بۆ ئەوەی چاودێریی بە سەر هێزی دەوڵەتیدا هەبێ، تا میاندواو چوو و لەگەڵ نەیروو گەڕایەوە مهاباد). سەرتیپ هومایوونی خۆی چەند شەوان میوانی ماڵی قازی محەمەد بوو.

مەئموورانی عەسکەریی حکوومەت دوو سێ ڕۆژێک دوای هاتنەوەیان بۆ نێو شاری کاریان بەکەس نەبوو، تەنها خەریکی کۆکردنەوەی چەکوچۆڵ بوون. دوای کۆکردنەوەی چەک و پاش ئەوەی مەلا مستەفا جارێکی دی بە پێی فەرمانی کاربەدەستانی ئەرتەش هاتەوە بۆ مهاباد، شەوی دووی بەفرانباری ١٣٢٥ هەتاوی (دیسامبری ١٩٤٦ی زایینی) بەبیانووی پێراگەیشتن بەژمارەی ئەو چەکوچۆڵانەی کۆکرابوونەوە، سەرتیپ هومایوونی کۆمیسیۆنێکی بەبەشداریی سەرهەنگ فیووزی و سەرهەنگ ئایروم و گشت ئەندامانی کارامەی حیزبی دێموکراتی کوردستان، لەوانە خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد، حاجی بابەشێخی سیادەت، سەرۆک وەزیری حکوومەتی جمهووری کوردستان، خودا لێخۆشبوو محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و هێندێک کەسی دی پێک هێنا.

لە سەرەتای ئەو کۆبوونەوەیەدا سەرتیپ هومایوونی لەو کەسانەی کە ئامادەبوون، ناو و پاشناو و پلەیان لە دەستگای حکوومەتی کوردستاندا دەپرسێ. ئاشکرایە لە وەختی ئاوادا

خەڵک لە ترسی ڕاوەدوونران و سزا، کار و پلەی ڕاستەقینەی خۆیان نادرکێنن. سەرتیپ هومایوونی چاو لە یادداشتێک دەکا کە گۆیا پێشتر ئاغای "م" سەبارەت بەدەستنیشانکردنی ناو و پاشناو و کار و پلەی هەرکام لە ئەندامانی ناسراوی حیزب ئامادەی کردبوو و نووسیبووی (بابم بەدوای ئەو ڕستەیەدا لێی زیاد دەکا: (گۆیا ئاغای "م" کە یەکێک لە ئەندامە کاریگەرەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، بەڵێنی پێ درابوو بێتوو ڕیزی چەکوچۆڵ و زانیاریی دیکە بە وردی لە بەر دەست ئێرانییەکان بنێ، لێی خۆش دەبن و سزا نادرێ)، و هەر کە هەست پێ دەکا ئەو کەسەی لێی دەپرسێ نکوڵی لە بەرپرسیارەتیی خۆی لە حیزبدا دەکا یان ئاگادارییەکی بەپێچەوانە لە سەر خۆی دەدا، دەستبەجێ بەئاغای "م" دەڵێ پیشە و پلەوپایەی ڕاستەقینەی ئەو کەسە بڵێ. ئاغای "م" یمیش لە ڕووی نوسخەیەکی تری یادداشتەکە کە لەبەردەمیدا دەبێ قسەکانی ئەو کەسەی کە وڵامی ناڕاستی داوەتەوە وەدرۆ دەخاتەوە.

هەرچۆنێک بێ، دوای زنجیرەیەک پرسیار و وڵام، هومایوونی و هاوکارانی لە " ف.خ" یەکێک لە ئەفسەرانی هێزی کوردستان، دەپرسن دەفتەری چەکوچۆڵ و موهیمماتی بە فەرمانی چ کەسێک ئاور تێ بەرداوە؟ ناوبراویش دەڵێ بەفەرمانی ئاغای "م" کە جێگری ستادی هێزی کوردستان بوو و ئێستاش لەم مەجلیسەدا حازرە. لە ئاغای "م" دەپرسن بەپێی چ فەرمانێک ئەو کارەت کردووە؟ ئەویش دەڵێ بەپێی فەرمانی محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی وەزیری جەنگی حکوومەتی کوردستان. خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان هەر لە بەرچاوی خۆی وەدرۆی دەخاتەوە و دەڵێ ئەو فەرمانێکی ئەوتۆی نەداوە. پاشان ئاغای "م" دەڵێ ئاغای محەمەد ئەمینی شەڕەفی لە لایەن حیزبی دێمۆکراتی کوردستان و بەپێی فەرمانی محەمەد حوسێن خان ئەو دەستوورەی داوە. لە محەمەد ئەمینی شەڕەفی دەپرسن، ناوبراویش قسەکانی ئاغای "م" وەدرۆ دەخاتەوە. پاشان بە" ف.خ" (بابم کەمتر بەیادداشتەکانی خۆیدا دەچووەوە. وەکو بینیمان پێشتر لەو کەسە پرسیار کرابوو، بابم بەهەڵە دووکەس بەیەک نێو هەڵدەدا و یان ئەوەی – ف.خ. دیسان لەوبارەیەوە پرسیاری لێ کراوەتەوە و ئەو وڵامێکی جیا لە وڵامی یەکەم دەداتەوە – بژارکار) کە ئەنبارداری چەکوچۆڵ بووە دەڵێن و لێی دەپرسن ئەتۆ کە بەرپرسی ئاگاداری لە چەکوچۆڵ و پاراستنی کاغەز و سەنەد و بەڵگەی لە مەڕ چەک بووی، بۆچی و بەفەرمانی کێ دەفتەرەکانت سووتاند؟ ناوبراویش دەڵێ بەفەرمانی ڕاستەوڕاستی وەزیری جەنگ محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی ئەو کارەم کردووە و هەروەها لێی زیاد دەکا ئەمن

دەستم لە دەفتەرەکان و بەڵگەکان نەدەدا و نەمدەسووتاندن بەڵام محەمەد حوسێن خان بۆ خۆی بە دەمانچە هەڕەشەی لێ کردم و ئەمنیش لە ترسی گیانی خۆم دفتەرەکان و بەڵگەکانم لە پێش چاوی خۆی ئاور تێ بەردا. خودا لێخۆشبوو قسەکانی ئەو کەسە وەدرۆ دەخاتەوە و دەڵێ هۆی ناڕاستیی قسەکانی ئەوەیە دەڵێ من بۆ خۆم لەوێ ئامادە بووم و چەکم لێ هەڵکێشاوە و هەڕەشەم لێ کردووە لەکاتێکدا من پیاو و خزمەتکاری شەخسیم هەبوو و دەکرا ئەو کارە بەدەستی نۆکەرەکانم جێبەجێ بکەم، چوونی خۆم بۆ کارێکی ئەوتۆ بەلێبڕاوی پێویست نەبوو. لێرەدا سەرتیپ هومایوونی تووڕە دەبێ و بەشڵەژاوی و بەکارهێنانی وشەی ناخۆش ڕووەو خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان دەڵێ گشت ئەو گووکاری و سەگبابییانە تاوانی تۆیە کە دەفتەر و بەڵگەکانت لەنێو بردووە تا ئەو کاتەی چەندوچۆنی چەکەکان ڕوون نەبێتەوە، هیچ کام لە ئامادەبووان بۆیان نییە لەم هۆدەیە دەرکەون و گشتتان لە ژێر چاوەدێریدان.

لە دوای قسە سووکەکانی سەرتیپ هومایوونی، خودالێخۆشبوو قازی محەمەد لە جێی خۆی هەڵدەستێ و بەتووڕەییەکی زۆرەوە کە لە سیمای دەردەکەوێ، ڕووەو سەرتیپ هومایوونی دەڵێ: ئەم کەسانەتان بۆ هێناوەتە ئێرە ؟ ئەوانە هیچ تاوانێکیان نییە، هەرچی کراوە و کردوویانە، هەمووی بە فەرمانی شەخسی من بووە ئەگەر پێتان وایە خیلافێک کراوە یان هەرچییەکی دیکەی ئێوە نێوی لێ دەنێن، هیچکەس تاوانبار نییە و ئەو کارە بە فەرمانی من بووە سەرباقی ئەوەش مادام دەوڵەتی ئێران مەئمووری بێ حەیسییەت و بێ شەرەفی وەکو تۆ کە کەرامەتی خەڵک لە بەرچاو ناگرن، بنێرێتە مەنتەقەی کوردستان، خەڵک لە دەست مەئموورەکانی خائین و تالانچی و ملهوڕ کە ڕێز لە گیان و ماڵ و کەرامەتی کەس ناگرن، وەگیان دێن، ناچار دەبن سەرتان وەبەر نەهێنن و لێتان هەڵتەزێننەوە، ئەگەر ئەمن و کەسانی وەک منیش لەم ڕێگایەدا لە نێو بچین تا ئەوکاتەی ئەو شێوەیەی بێ ڕێزی بە مافی خەڵک بەرقەرار بێ، وەجەکانی دوای من هەر کەمترین دەرفەتێکیان بۆ هەڵکەوێ، تۆڵەی ئەو زۆرداری و جینایەتانە دەستێننەوە.

دوای تەواوبوونی قسەکانی قازی محەمەد، بێدەنگییەکی مەرگاوی و ترسێنەر، باڵ بەسەر ژووری کۆبوونەوەکەدا دەکێشێ (ئەو کۆبوونەوەیە لە خانووی حاجی حەمەدەمینی ڕەحیمزادە بووە کە ئێستا (بانکی میلیی تێدایە)، دوای چەند دەقیقە بێدەنگی، ئاغای حاجی بابەشێخی سیادەت کە لە سادات و عالمە پایە بەرزەکانی کوردستان و سەرۆک وەزیری جمهووریی کوردستان بوو و پشتاوپشتی خەریکی ئیرشاد و ڕێنوێنی خەڵک بوون

له شوێنی خۆی هەڵدەستێ و دەڵێ: کەلام واحید، قسەیەکە، و بەزمانێکی ئارامتر وتەکانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد دووپاتە دەکاتەوە و دەڵێ ئاغای سەرتیپ هومایوونی ئەگەر لە ئاکامی شەڕی دووەمی جیهانی و نەمانی دەستەڵاتی دەوڵەت لەم ناوچەیەدا هێندێک کار کراون لەبەر ناچاری و مەسڵەحەت و لەبەرژەوەندی موڵک و میللەت بووە، حەق وایە مەئموورینی دەوڵەت، خەریکی دڵدانەوە و ڕازیکردنی خەڵک بن، نەک ئەوەی دیسان زۆرداری لە خەڵک بکەن و گۆشاریان بۆ بێنن و تا ئەو کاتەی مەئموورەکانی وەک ئێوە مامەڵەکردنی خۆتان لەگەڵ خەڵک نەگۆڕیوە، دەبێ هەمیشە چاوەڕوان بن ئەو ڕووداوانە دووپاتە ببنەوە.

دوایە سەرتیپ هومایوونی لە جێی خۆی هەڵدەستێ و بەو کەسانەی لە کۆبوونەوەکەدا حازربوون دەڵێ لەبەرئەوەی وەزعی چەکوچۆڵ ڕوون نەبووەتەوە، ئاغایان مافی دەرکەوتن لەم ژوورەتان نییە و دەستبەجێ چەند سەرباز و ئەفسەری چەکدار دێنە بەردەرگە و داڵان و سەرپلیکانەکان و پێش بەدەرکەوتنی حازران جگە لە حاجی بابەشێخ دەگرن. حاجی بابە شێخی سیادەت ئەو شەوە مەرەخەس دەکرێ، بەڵام چەند ڕۆژ دواتر ئەویش دەگرن و دەیخەنە زیندانەوە. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خان لەژێر چاوەدێرییدا دەبەن بۆ ژوورەکانی خانووبەرەی عەدلییە (خانووبەرەی میرزا عەبدوڵای کەریمی کە لە شەقامی شاپوور ڕووبەڕووی دوخانیات هەڵکەوتووە) و لەوێ دەستبەسەر و زیندانییان دەکەن، و خەڵکەکەی دیکەش دەنێرن بۆ زیندانی شارەبانی. ئەوە بووە سەرەتای گیرانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خان کە دەستبەجێ لە لایەن ئەفسەرانی ئەرتەش لە مهاباد بەدزی و بەنهێنی محاکەمەیان دەستی پێکرد.

خوداڵێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی لە کاتی پێشڕۆیی هێزی دەوڵەتی بەرەو ئازەربایجان، لە مهاباد بوو. کاتێک قوشوونی دەوڵەتی هاتە نێو تەورێز، ناوبراو بەپەلە چوو بۆ تاران تا بەڵکو ئەحمەدی قەوام، سەرۆک وەزیری ئەوکاتە کارێکی ئەوتۆ بکا مەئموورە نیزامییەکان سەبارەت بەکوردان بەگشتی و قازییەکان بە تایبەتی، نەرم بجووڵێنەوە و توندوتیژی بەکارنەهێنن. خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی چەند ڕۆژێک لە تاران لە حەول و تێکۆشاندا بوو بەڵام نەیتوانی هیچ بکا. دواجار ئەویشیان لە تاران گرت و لە ژێر چاودێریدا هێنایانەوە مهاباد و ئەویشیان لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و محەمەد حوسێن خان لە پێشدا لە نێو شاریدا (خانووبەرەی عەدلیە، موڵکی میرزا عەبدوڵای کەریمی) و دوایە لە سەربازخانە زیندانی کرد.

ڕەوتی محاکەمەی خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی کە لە مانگی بەفرانباری ساڵی ١٣٢٥ی هەتاویدا لە مەهاباد بەڕێوە چوو، بەتەواوی نهێنی بوو و هیچ کەس ئاگای لێی نەبوو، بەڵام ئەو جۆرەی لە نووسراوەکانی نێو کتێبی (مهابادی خوێنین) و ڕۆژنامەکان دەردەکەوێ، ئەو تاوانانەی وەپاڵیان دابوون زیاتر لەمەڕ سازکردنی حکوومەتی سەربەخۆی کوردستان و جیابوونەوە لە وڵاتی ئێران و گۆڕینی ئاڵا و سەفەر بۆ بادکووبە بوون.

خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد لە بەرگریکردنەکانیدا گوتبووی: دوای ڕووداوی خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی کە هێزەکانی دەوڵەتی لە مهاباد لە لایەن هێزی بێگانەوە چەک کران و هێز و دەستەڵاتی دەوڵەت لە سەرتاسەری کوردستاندا لە نێوچوو، ناچار بووین بۆ دابینکردنی هێمنی و ئاسایشی خۆمان دەست بدەینە چەک و جگە لەمە هیچ چارەیەکی ترمان نەبوو. هەروەها خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد، ئیرادی لە لێوەشاوەیی دادگەی نیزامی گرتبوو و گوتبووی بۆ ئەوە نابێ ئەو محاکەمە بکا، چونکو ئەو کەسێکی نانیزامی و مەدەنییە و دەبێ دادگەکانی عەدلییە بەدۆزەکەی ڕابگەن، بەڵام دادگەی زەمانی شەڕ بەسەرۆکایەتیی سەرهەنگ پارسی تەبار و داواکاری گشتی، سەرهەنگ فیووزی بەرگریکردنەکانی وییان قەبووڵ نەکرد و هەر سێ کەسیان بەئێعدام مەحکووم کرد. ڕەوتی محاکەمە بە تاران ڕاگەیێندرا و داوای فەرمان کرا. لە نێوەندەوە دەستەیەک بۆ پێداچوونەوە بەسەرۆکایەتی سەرهەنگ نەجاتوڵای زەرغامی و ئەندامەتیی سەرهەنگ نیکووزاد لە بەرواری هەشتەمی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی گەیشتە مهاباد. دادگەی پێداچوونەوەش ئەوانی بەئێعدام مەحکووم کرد. لە نیوە شەوی دووشەمۆ دەهەمی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانیان یەک بە دوای یەکدا بەبیانووی ناردن بۆ تاران لە سەربازخانە دەهێننە دەرێ و بەکامیۆنی پڕ لە سەربازی چەکدار دەیانهێنن بۆ خانووبەرەی ستادی لەشکر (شارەداریی ئێستا). لە پێشدا خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد دەبەن بۆ ژوورێک کە لەوێ سەرۆکی ئیدارەی لەشساخی و داواکاری لەشکری و خوداڵیخۆشبوو مەلا سەدیقی لێ دەبێ بەوەکالەتی قازی لەشکر، خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد هەست پێ دەکا کە چ دەقەومێ. مەلا سەدیق پێشنیازی پێ دەکا ئەگەر وەسییەتێکی هەیە بیکا. قازی محەمەد لە چەند پەڕەیەکدا وەسییەتی خۆی دەنووسێ. ئەو وەسییەتنامەیان نەدا بەبنەماڵەکەی لەبەرئەوەی گۆیا مەبەستگەلی سیاسیشی تێدا بووە. دوایە دوو ڕکاعەت نوێژ دەکا و

ڕادەگەیێنێ براکەی سەدری قازی بێ گوناحە، ئەگەر ئەو ئازاد بکەن، خوێنی من حەڵاڵتان بێ، بەڵام گوێ نادەنە قسەکانی، دوایە دەیبەنە پای دار کە لە گۆڕەپانی چوارچرا بەرپایان کردبوو. (خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەدیان هەر لەو شوێنە لە سێدارە دا کە کۆماری کوردستانی لێ ڕاگەیاندبوو). خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە پای سێدارە بەدەنگی بەرز لەو نیوە شەوەدا بەیاناتێک سەبارەت بەئازادی و سەربەخۆیی کوردستان دەکا. دوایە لە سێدارەی دەدەن و کۆتایی بە ژیانی دەهێنن، دەبێ ئەو خاڵەش وەبیر بهێنرێتەوە لە پای سێدارە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە دادئەستێن داوا دەکا تیرەبارانی بکەن، پێی دەڵێ لە داردان لە ئیسلامدا مەکرووهە. دادئەستێن لە وڵامدا دەڵێ لەبەرئەوەی ئێوە نیزامی نین، دەبێ بەلە داردان ئیعدام بکرێن. خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لە وڵامی دادئەستێن دەڵێ: ئەگەر من نیزامی نەبووم، ئەی بۆچی لە مەحکەمی نیزامیدا محاکەمەتان کردم؟ پاش ماوەیەک خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان دەهێنن بۆ ئەو ژوورەی باسی لێوە کراوە. داوای لێ دەکەن ئەویش وەسییەتی خۆی بنووسێ. بەڕێزیان بەو پەڕی ئازایەتی و بێ ئەوەی بشڵەژێ چەندین لاپەڕە وەسییەت دەنووسێ و وردەڕیشاڵی ئەو قەرزەی لای خەڵکی هەیە و ئەوەی قەرزدارە بەخەتی خۆی دەنووسێ و ئیمزای دەکا، دوایە دەیبەنە پای سێدارە. کاتێک چاوی بەپەیکەری بێ گیانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لەسەر دار دەکەوێ، بێ ئیختیار دەست دەکا بەگورە و هاوار دەکا: بژی بژی کوردستان، بژی پێشەوای موعەزەمی کوردستان و دوایە هێرش دەکاتە سەر ئەو ئەفسەر و سەربازانەی دەیانەوێ تەنافی دار بخەنە ئەستۆی و چەند مستیان لێ دەدا، بەڵام دواجار هەرچۆنێک بێ تەنافەکەی دە ئەستۆی دەکەن، دوای دەمێکی کەم کە لەسەر دار بووە، تەنافەکە دەپسێ، بەڵام گرێی دەدەنەوە و بەم پێیە کۆتایی بەژیانی ئەویش دەهێنن. دوای خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان، سەدری قازی دەهێننە پای سێدارە و لە داری دەدەن. بەم پێیە لە نیوە شەوی دووشەمۆ دەهەمی خاکەلێوەی ١٣٢٦ی هەتاوی (٣٠ ی مارسی ١٩٤٧) کۆتایی درا بەژیانی سێ کەس لە سەرکردە هەڵکەوتووەکانی بنەماڵەی قازی. ڕۆژنامە و چاپەمەنیی نێوخۆ چ ئەو دەمی و چ دواتر سەبارەت بەچارەنووسی قازییەکان هێندێک وتاریان بڵاو کردەوە. لە نێو ئەوانەدا وتارێکە لە گۆواری ژمارە ٥٠ ی ئیتیلاعاتی مانگانەی ساڵی ١٣٣١ (ی هەتاوی) بەقەڵەمی ئاغای سلێمانی.ح.

دەبێ ئەم خاڵە وەبیر بهێنرێتەوە لەبەرئەوەی کاربەدەستانی کاروباری نیزامی لە مهاباد بە ئیعدامکردنی قازی محەمەد، کە بەڕێزیان لە نێو خەڵکی مهاباددا ئەوپەڕی خۆشەویست

بوو، لە کـاردانەوەی خـەڵک دەترسـان، بۆیە بۆ پێشگرتن لە هەمـوو جـۆرە ڕووداو و پێشهاتێک، پێشبینی پێویستیان کردبوو. جگە لەوەی ئەوانیان بێ ئەوەی لە پێشدا ڕای بگەیێنن و بەنهێنی ئێعدام کرد، لە کاتێکدا کە خەڵک دەخەودا بوون، لە سەربانەکانی گشت خانووەکانی نزیک لە شوێنی ئیعدام، کەسانی نیزامی چەکداری موسەلسەل بەدەست و تفەنگ بە دەستـیـان دامـەزراندبوو کـە چاویان بەسـەر وەزعـەوە هـەبێ و ئامـادە بن بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەرجۆرە ڕووداوێک، هـەڵبەت هیچ نەقـەوما، بەڵام خـەڵکی شاری سەرلەبەیانی کە بەخەبەری ئێعدامی خوداڵێخۆشبوو قازی محـەمـەد و سەدری قازی و محەمـەد حوسێن خانی سەیفی قازییان زانـی، ڕژانە کۆڵانەکان و وەک ئەوەی قـیامـەت ڕابووبێ، هەمـوویان دەسـتـیـان کـرد بەگـریان و شین و شـەپۆڕ و فـرمـێـسکی داخ و حـەسـرەتیـان لە چاوان باراند، دەرەجـەی هەست دەربڕینی خـەڵک و پەژارەی ئاپۆرای خـەڵکەکـە ئەوەندە زۆر بوو سـەربازەکـان و هێندێک لە ئەفسـەرەکـانیش کـەوتبـوونە ژێر کاردانەوەی شـینی خـەڵک و ئەوانیش دەسـتـیـان کردبوو بەگریان. مـەیتـەکـان تا یەک دوو سـەعـات دوای تاوهەڵات بەسـەر دارەکانەوە مـابوونەوە، دوایە ئەوانیـان دە تـابووتان نا و لە حەوزی مزگەوتی حاجی ئەحمەد شوشتیانن و لە گۆڕستانی مەلاجامی کە لە بن چیای داشامەجید هەڵکەوتووە، هەر سێکیان بەتەنیشت یەکدییەوە بەخاک سپاردن.

بەر لە ئێعدامی قازییەکان، ژمارەیەک کە بەئەنگوستانی دەست دەژمێردران، بە فـەرمانی کـاربەدەسـتـانی نیـزامی بەڕێگای نووسین و ئیـمـزاکـردنی هێندێک نامـە دەستـیـان کـرد بەچالاکی بە دژی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمـەد. ئەوانە نووسراوەکانی خۆیان بە هەڕەشە لێکردن و ترساندن یان بە تکا و ڕەجـا بە ئیـمـزای هێندێک کـەس گـەیاندبوو. یەک لەو نووسـراوانە بەڕێگای شێخ عەبدولرەحـمـان کـوڕی شێخ عـەبدورەحـیـمی شـەمسـەدینی و کەسێکی دی دەبردرێتە لای خوداڵێخۆشبوو عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەدی ئێلخـانیزادە (عـەلیـیـار). کـەسـێک کـە بۆ خـۆی حـازر و شـاهـیدی ئەوە بووە گـوتی: ئەو دەمی کـە خـوداڵێخـۆشبـوو قازی مـحـەمەد و سـەدری قازی و مـحـەمـەدحوسێن خـان لە زینداندا بوون، خوداڵێخۆشبوو عەلی ئاغا نەخۆش بوو و لە ماڵی میرزا ڕەحمەتی شافیعی لە مهاباد، لە جێدا کەوتبوو، ئەمن هـەر وەک عـادەتە بۆ سـەرلێدان و ئەحـواڵپرسـی چووبوومـە لای عـەلی ئاغـا، چەند دەقـیـقـەیەک تێپـەڕ نەبووبوو، دیتم عـەبدورەحـمـانی کـوڕی شـێخ ڕەحـیـمی شـەمسـەدینی لە کاتێکدا کـاغەزێکی بەدەستـەوە بوو وەژوور کـەوت و سڵاوی کرد و بەعـەلی ئاغـای گـوت: بابم سـڵاوتـان دەگـەیێنـێ و عـەرزی کـردن تکام ئەوەیە ئەو کـاغـەزە ئیـمـزا

بفەرموون. خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا پرسیاری کرد بابەتی نامەکە چییە؟ وڵامی داوە بابەتی نامەکە داوخوازی ئیعدامی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازییە. خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا بەبیستنی ئەو قسەیە ناڕەحەت بوو و برۆی تێک نا، پاش هێندێک ڕامان بەکوڕەکەی برایماغای کوت کە لە تەنیشتی دانیشتبوو: برایم ئەو کاغەزە وەرگرە و بیخوێنەوە، با بزانین چییان نووسیوە؟ کاتێک برایم ئاغا نامە چەند دێڕییەکەی خوێندەوە کە بەتەواوی بریتی بوو لە بەدگۆیی و پێویستیی ئیعدامی قازییەکان، خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا کوتی: بەسە، بەسە، بەم جۆرە قسە قۆڕانە سەرم وەژان مەهێنە، ئەمن قەت کاغەزی ئەوتۆ واژۆ ناکەم و خۆم تووشی بێ ئینسافییەکی وەها ناکەم، ئەمن بەلێبڕاوی لێم سوورە دەوڵەت قازییەکان ئیعدام دەکا، جا چ ئەم نامەیە ئیمزا بکەم یان نەکەم، کە وابێ چ خودا بەردارە وە باڵی ژن و منداڵی ئەوان بخەمە سەر ئەستۆی خۆم و ئێستا کە بۆ خۆم لاقم لە لێواری گۆڕ نزیکە خۆم بکەمە بەرپرسیار و هاوبەشی قەتڵی ئەوان. یەک لە ئامادە بووانی مەجلیسەکە و لە کەسانی نزیکی عەلی ئاغا وەبیری هێنایەوە: کاربەدەستانی کاروباری نیزامی لەو بارەیەوە زۆر سەختی دەگرن و ئەگەر ئێوە ئەم کاغەزە واژۆ نەکەن، لەوانەیە ببێتە هۆی دڵئێشە و ڕەنجانی ئەوان و ڕەنگە هێندێک دڕدۆنگیش لە سەر ئێوە ساز کا و کێشەتان بۆ ساز بێ. خودالێخۆشبوو لە وڵامی ئەو کەسەدا کوتی: ئەگەر ئێستا لە جیاتی قازی محەمەد ئەمن ئێعدام کەن، دیسانیش ئەم کاغەزە ئیمزا ناکەم و پاشان لە قسەکانی زیاد کرد و گوتی ڕاستە ئەمن لەگەڵ قازی محەمەد و برایەکەی دوژمنم و ئەگەر دەستهەڵاتم هەبووبا بۆخۆم دەمکوشتن، بەڵام لە هەمان حاڵدا بەکوشتنی ئەوان بەدەستی دەوڵەت پەرۆش و ناڕەحەتم، چونکو بنەماڵەی قازی لە کوردستان خانەدانێکی گەورە و بەڕێزن و ئەلحەق پشت و پەنای نەدار و لێقەوماوانن و ئەمن هیچ کات لە دڵەوە پێم خۆش نییە دەوڵەت ئەوەندە زاڵ و بەدەستهەڵات بێ، بتوانێ ئەو جۆرە کەسە بەڕێز و گەورە و گرانانەی کورد ئێعدام بکا. ئەمڕۆ ئەگەر ئەوانە کە لە گەورە پیاوانی کوردستانن ئیعدام بکا، سبەینێ ئەگەر من و کەسانی وەک من تووشی کەمترین لادان و هەڵە بێین یان مەئموورینی خۆجێیی لەبەر غەرەزی شەخسی ڕاپۆرتێکی بەدرۆ لە سەرم بنووسن، بێ ئەملاو و ئەولا ئەمنیش ئێعدام دەکەن و حورمەتی کوردەکان لە چاو کاربەدەستانی دەوڵەتدا لە نێو دەچێ و درێژەدان بەژیان بەو وەزعەوە دژوار دەبێ. دوایە کاغەزەکەی لە دەستی برایم ئاغای کوڕی وەرگرت و بەتووڕەیی و غەزەبەوە بەرەو کوڕی شێخ ڕەحیمی فڕێی دا و کوتی: بڕۆ بەبابت بڵێ ئەمن ئەو جۆرە قسەقۆڕانە ئیمزا ناکەم.

ئەو ئاکارە گەورەیە واتە دەستگێڕانەوەی عەلی ئاغا لە ئیمزاکردنی ئەو کاغەزە گۆڕینە، ئەگەرچی هیچ شوێنێکی لەسەر چارەنووسی قازییەکان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک هەستی ڕێز و پێزانینی بۆ خوداڵێخۆشبوو عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد لە نێو بنەماڵەی قازیدا ساز کرد و هەمیشە لە دانیشتن و مەجلیسەکانی خۆیاندا بەڕێز و گەورەییەوە یادیان لە عەلی ئاغا دەکردەوە و دەکەن.

دوای هاتنەوەی هێزی ئەرتەش بۆ ئازەربایجان و داگیرکرانەوەی مهاباد و کۆکردنەوەی چەکوچۆڵ و گیرانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و کاربەدەستەکانی دیکەی حکوومەتی کوردستان، ژمارەیەک لە پیاوانی ئاینی و سەرۆک عەشیرەتەکانی مهاباد بۆ دەربڕینی سەروەبەرهێنان و وەفاداری، چوونە تارانێ. لە سەرۆک عەشیرەتەکان ئەم کەسانەی خوارەوە بوون:

١- مەحموود ئاغای ئێلخانیزادە، خاوەن موڵکی دێی حەمامیان و ڕدێن سپیی خێڵی دێبۆکری.

٢- حاجی بایزاغای برای مەحمووداغای ئێلخانیزادە

٣- برایم ئاغای قارەمانی ڕدێن سپی و ئەرشەدی ئەولادی تایفەی قارەمانیی دێبۆکری

٤- قادرئاغای قارەمانی برای برایم ئاغای قارەمانی[1]

٥- عەبدوڵا ئاغای قادری سەرۆکی تایفەی قادریی مامەش

٦- مام عەزیزی ئەمیر عەشایری کوڕی خوداڵێخۆشبوو قەرەنی ئاغای ئەمیر عەشایری سەرۆکی تایفەی ئەمیر عەشایریی مامەش

٧- کەریم ئاغای قوم قەڵایێ دێبۆکری

٨- بایزئاغای عەزیز ئاغا، سەرۆکی خێڵی گەورکی موکری

٩- عەوڵا ئاغای بایەزیدی، سەرۆکی خێڵی مەنگوڕ

لە پیاوە ئاینییەکان:

١- شێخ عەبدوڕەحیم کوڕی خوداڵێخۆشبوو شێخ یووسفی شەمسی بورهان، بەنێوبانگ بەشەمسەدینی.

---

١- لێرە دا بابم لە نێو کەواندا نووسیویە: (وردە ڕێشاڵی وتووێژەکانی ئەو کەسانە لەتاران هەر ئەو (قادرئاغا قارەمانی)یە کە بۆخۆی لەو مەجلیسە دا ئامادە بووە بۆ نووسەری گێڕاوەتەوە).

قازی شێخ موحسین(١)

– مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ(٢)

تاجرەکانی مهاباد:

میرزا ڕەحمەتی شافیعی خاوەن موڵک و تاجری مهابادی

میرزا عەبدوڵای کەریمی خاوەن موڵکی دێی قەمتەرێ و ق تاجر

ەید جامیی جەعفەری و چەند کەسی دی

ڕۆژەی بڕیار بوو ئەو ئاغایانە بۆ چاوپێکەوتنی شا بچن بۆ کلووبی ئەفسەران، ک بەنێوی خەلعەتبەری کە بەداخەوە نێوی بچووکی ئەو کەسە دیار نییە چ بووە و ە پیاوەگەورەکانی بەڕێزی تاران بووە، بەئامادەبوونی ئەو کەسانە ئەم قسانەی ان بۆ دەکا:

ئەمن قازی محەمەد هێندە ناناسم بەڵام (سەدری قازی) م لە تاران و ئەوکاتەی ا نوێنەر بوو، دیتووە و تا ڕادەیەک دەیناسم. ئەو کەسە واتە سەدری قازی بە یمان و نیشتمان خۆشەویست و بێ گوناح دەزانم، ئەگەریش کەم تازۆر کردبێ، لەبەر پێداویستییەکانی شەڕی دوویەمی جیهانی و لەیەک هەڵپسانی و هێمنی و لە ڕووی ناچاری و مەسڵەحەتی کات و مەسڵەحەتی ناوچە بووە و ێ ئەم بنەماڵەیە لە ڕابردوودا خزمەتی بە نرخیان کردووە بۆ پاراستنی ە و ئاسوودەییی خەڵک، ئەگەر خەتایەکیشیان کردبێ، خەتاکەیان لە ئاست یچ نییە و شیاوی چاو لێ پۆشینە. بەڕێزان ئێستا کە ئێوە وەکو نوێنەرانی کوردستان هاتوون بۆ نێوەند، هەڵبەت کە لە ژێر پەنای خاوەن شکۆ و ایەکی بیکەن بێ ئەملاو ئەولا لێتان قبووڵ دەکرێ، جا بۆیە باشتر وایە اوەن شکۆ شەرەفی حزوورتان پەیدا کرد، داوای لێ بکەن لە تەقسیری بێ و لێیان ببوورێ. دوای تەواو بوونی قسەکانی خەلعەتبەری، ئاغای خانیزادە (برای عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد) کە پێشینەی دۆستایەتی لەگەڵ خودالێخۆشبوو سەیفی قازی (سەیفولقوزات) بابی

---

کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ٩

لی گۆڕەومەڕ" لە نێو کەواندا دەنووسێ (ئەم کەسە بەدژی گۆڕینی جلوبەرگ
ردستان وەڕێخست کە وردە ڕیشاڵی بەجێ نووسراوەتەوە)

خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان و مامی ئاغایانی قازی محەمەد و سەدری قازی
هەبوو، بە لە دوودانی قسەکانی خەلعەتبەری، بەدوور و درێژی قسە دەکا و قول لە سەر
ئەوە دەکێشێ ئەو بنەماڵەیە و بەتایبەتی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات خزمەتی بەنرخیان
بەخەڵکی کوردستان و وڵات کردووە و تکاکردن بۆ لێخۆشبوونیان بەجێ و واجبە، دوا
ئاغای خەلعەتبەری لە هۆڵەکە دەچێتە دەرێ.

دوای دەرکەوتنی ئاغای خەلعەتبەری، شێخ عەبدورەحیمی شەمسی بورهان کوڕی خ
لێخۆشبوو شێخی بورهان کە لە دژبەران و دوژمنانی سەرسەخت بەڵام لە خ
بنەماڵەی قازی بوو، لە بەرانبەر قسەکانی ئاغای خەلعەتبەری و حاجی بایز ئ
ئێلخانیزادە بەتوندی دژ دەردەکەوێ و دەڵێ بێتو ئەم قازییانە ئێعدام نەکرێن، بوون
و ماڵی ئێمە دەمەترسیدا دەبێ و ئێمە ناچارین هیجرەت بکەین بۆ خاکی
بەلێبڕاوانە نابێ سەبارەت بە ئازادکران و بەخشینی ئەوانە هیچ بکوترێ، ئەگە
شکۆ و دەوڵەتیش بیانەوێ بەنەرمی لەگەڵیان ببزوونەوە، ئێمە دەبێ دژ دەر
داوخواز بکەین ئیعدامکردنیان وەپەلە بکەوێ. بەم پێیە کاتی چاوپێکەوتنی
رەحیم بەپێکێشییەوە داوخوازی ئیعدامی ئەوان دەکا و گوتبووی: بێتو ئەو
زووترە لە نێو نەچن، خاوەن شکۆ دەبێ هەموو سەعاتێک چاوەڕێی ئاڵۆزی و
تازە لە کوردستان بکا و دواجار کوردستان لە ئێران جوێ دەبێتەوە، بۆیە چ
میللەت لەوە دایە ئەم قازییانە هەرچی زووتر بە ئیعدام سزا بدرێن و تیرەبا
ئەمە تکای گشت خەڵکی کوردستانە لە دەرکانەی شاهانە. بەو شێوەی
هیچیان نەگوت و ئاشکرایە بەو قسانە ئەو دەرفەتە لەبارە بۆ ڕزگارییان
خراپ و دوژمنایەتی لەخۆڕای شێخ ڕەحیم لە دەست چوو و ئەوەی نەدەبوو
هەر سێکیان وەکو پێشتر گوتمان لە بەرواری دووشەمۆ دەی مانگی خ
١٣٢٦ لە مهاباد لە دار دران. جگە لەو سێ کەسە ئەم کەسانەش لە خوا
خەڵکی مهاباد بوون، لەبەر دەبەرکردنی جلوبەرگی ئەفسەری حکوو
حەوتوویەک دواتر، هەر لە هەمان شوێنی کە قازییەکانیان ئیعدام کرد،

١- محەمەدی نازمی
٢- عەبدوڵای ڕەوشەنفکر
٣- حامیدی مازووچی
٤- ڕەسووڵی نەغەدەیی

بفەرموون. خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا پرسیاری کرد بابەتی نامەکە چییە؟ وڵامی داوە بابەتی نامەکە داوخوازی ئیعدامی قازی محەمەد و سەدری قازی و سەیفی قازییە. خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا بەبیستنی ئەو قسەیە نارەحەت بوو و بڕۆی تێک نا، پاش هێندێک رامان بەکوڕەکەی برایماغای کوت کە لە تەنیشتی دانیشتبوو: برایم ئەو کاغەزە وەرگرە و بیخوێنەوە، با بزانین چییان نووسیوە؟ کاتێک برایم ئاغا نامە چەند دێڕییەکەی خوێندەوە کە بەتەواوی بریتی بوو لە بەدگۆیی و پێویستیی ئیعدامی قازییەکان، خودالێخۆشبوو عەلی ئاغا کوتی: بەسە، بەسە، بەم جۆرە قسە قۆڕانە سەرم وەژان مەهێنە، ئەمن قەت کاغەزی ئەوتۆ واژۆ ناکەم و خۆم تووشی بێ ئینسافییەکی وەها ناکەم، ئەمن بەلێبڕاوی لێم سوورە دەوڵەت قازییەکان ئیعدام دەکا، جا چ ئەم نامەیە ئیمزا بکەم یان نەکەم، کە وابێ چ خودا بەرداره وە باڵی ژن و منداڵی ئەوان بخەمە سەر ئەستۆی خۆم و ئێستا کە بۆ خۆم لاقم لە لێواری گۆڕ نزیکە خۆم بکەمە بەرپرسیار و هاوبەشی قەتڵی ئەوان. یەک لە ئامادە بووانی مەجلیسەکە و لە کەسانی نزیکی عەلی ئاغا وەبیری هێنایەوە: کاربەدەستانی کاروباری نیزامی لەو بارەیەوە زۆر سەختی دەگرن و ئەگەر ئێوە ئەم کاغەزە واژۆ نەکەن، لەوانەیە ببێتە هۆی دڵئێشە و رەنجانی ئەوان و رەنگە هێندێک دردۆنگیش لە سەر ئێوە ساز کا و کێشەتان بۆ ساز بێ. خودالێخۆشبوو لە وڵامی ئەو کەسەدا کوتی: ئەگەر ئێستا لە جیاتی قازی محەمەد ئەمن ئێعدام کەن، دیسانیش ئەم کاغەزە ئیمزا ناکەم و پاشان لە قسەکانی زیاد کرد و کوتی راستە ئەمن لەگەڵ قازی محەمەد و برایەکەی دوژمنم و ئەگەر دەستهەڵاتم هەبووبا بۆخۆم دەمکوشتن، بەڵام لە هەمان حاڵدا بەکوشتنی ئەوان بەدەستی دەوڵەت پەرۆش و نارەحەتم، چونکو بنەماڵەی قازی لە کوردستان خانەدانێکی گەورە و بەڕێزن و ئەلحەق پشت و پەنای نەدار و لێقەوماوانن و ئەمن هیچ کات لە دڵەوە پێم خۆش نییە دەوڵەت ئەوەندە زاڵ و بەدەستهەڵات بێ، بتوانێ ئەو جۆرە کەسە بەڕێز و گەورە و گرانانەی کورد ئێعدام بکا. ئەمرۆ ئەگەر ئەوانە کە لە گەورە پیاوانی کوردستانن ئیعدام بکا، سبەینێ ئەگەر من و کەسانی وەک من تووشی کەمترین لادان و هەڵە بێین یان مەئموورێنی خۆجێیی لەبەر غەرەزی شەخسی راپۆرتێکی بەدرۆ لە سەرم بنووسن، بێ ئەملاو و ئەولا ئەمنیش ئێعدام دەکەن و حورمەتی کوردەکان لە چاو کاربەدەستانی دەوڵەتدا لە نێو دەچێ و درێژەدان بەژیان بەو وەزعەوە دژوار دەبێ. دوایە کاغەزەکەی لە دەستی برایم ئاغای کوڕی وەرگرت و بەتوورەیی و غەزەبەوە بەرەو کوڕی شێخ رەحیمی فڕێی دا و کوتی: برۆ بەبابت بڵێ ئەمن ئەو جۆرە قسەقۆڕانە ئیمزا ناکەم.

ئەو ئاکارە گەورەیە واتە دەستگێڕانەوەی عەلی ئاغا لە ئیمزاکردنی ئەو کاغەزە گۆرینە، ئەگەرچی هیچ شوێنێکی لەسەر چارەنووسی قازییەکان نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک هەستی ڕێز و پێزانینی بۆ خوداڵێخۆشبوو عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد لە نێو بنەماڵەی قازیدا ساز کرد و هەمیشە لە دانیشتن و مەجلیسەکانی خۆیاندا بەڕێز و گەورەییەوە یادیان لە عەلی ئاغا دەکردەوە و دەکەن.

دوای هاتنەوەی هێزی ئەرتەش بۆ ئازەربایجان و داگیرکرانەوەی مهاباد و کۆکردنەوەی چەکوچۆڵ و گیرانی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی و کاربەدەستەکانی دیکەی حکوومەتی کوردستان، ژمارەیەک لە پیاوانی ئاینی و سەرۆک عەشیرەتەکانی مهاباد بۆ دەربڕینی سەروەبەرهێنان و وەفاداری، چوونە تارانێ. لە سەرۆک عەشیرەتەکان ئەم کەسانەی خوارەوە بوون:

١- مەحموود ئاغای ئێلخانیزادە، خاوەن موڵکی دێی حەمامیان و ڕدێن سپیی خێڵی دێبۆکری.

٢- حاجی بایزاغای برای مەحمووداغای ئێلخانیزادە

٣- برایم ئاغای قارەمانی ڕدێن سپی و ئەرشەدی ئەولادی تایفەی قارەمانیی دێبۆکری

٤- قادرئاغای قارەمانی برای برایم ئاغای قارەمانی(١)

٥- عەبدوڵا ئاغای قادری سەرۆکی تایفەی قادریی مامەش

٦- مام عەزیزی ئەمیر عەشایری کوڕی خوداڵێخۆشبوو قەرەنی ئاغای ئەمیر عەشایری سەرۆکی تایفەی ئەمیر عەشایریی مامەش

٧- کەریم ئاغای قوم قەڵایێ دێبۆکری

٨- بایزئاغای عەزیز ئاغا، سەرۆکی خێڵی گەورکی موکری

٩- عەوڵا ئاغای بایەزیدی، سەرۆکی خێڵی مەنگوڕ

لە پیاوە ئاینییەکان:

١- شێخ عەبدوڕەحیم کوڕی خوداڵێخۆشبوو شێخ یووسفی شەمسی بورهان، بەنێوبانگ بەشەمسەدینی.

---

١- لێرە دا بابم لە نێو کەواندا نووسیویە: (وردە ڕێشاڵی وتووێژەکانی ئەو کەسانە لەتاران هەر ئەو (قادرئاغا قارەمانی)یە کە بۆخۆی لەو مەجلیسە دا ئامادە بووە بۆ نووسەری گێڕاوەتەوە).

٢- قازی شێخ موحسین[١]

٣- مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ[٢]

لە تاجرەکانی مهاباد:

١- میرزا ڕەحمەتی شافیعی خاوەن موڵک و تاجری مهابادی

٢- میرزا عەبدوڵای کەریمی خاوەن موڵکی دێی قەمتەرێ و ق تاجر

٣- سەید جامیی جەعفەری و چەند کەسی دی

ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو ئەو ئاغایانە بۆ چاوپێکەوتنی شا بچن بۆ کلووبی ئەفسەران، کەسێک بەناوی خەلعەتبەری کە بەداخەوە نێوی بچووکی ئەو کەسە دیار نییە چ بووە و یەکێک لە پیاوەگەورەکانی بەڕێزی تاران بووە، بەئامادەبوونی ئەو کەسانە ئەم قسانەی خوارەوەیان بۆ دەکا:

بەڕێزان ئەمن قازی محەمەد هێندە ناناسم بەڵام (سەدری قازی) م لە تاران و ئەوکاتەی لە پارلماندا نوێنەر بوو، دیتووە و تا ڕادەیەک دەیناسم. ئەو کەسە واتە سەدری قازی بە پیاوێکی بەئیمان و نیشتمان خۆشەویست و بێ گوناح دەزانم، ئەگەریش کەم تازۆر هێندێک کاری کردبێ، لەبەر پێداویستییەکانی شەڕی دوویەمی جیهانی و لەیەک هەڵپسانی ڕشتەی نەزم و هێمنی و لە ڕووی ناچاری و مەسڵەحەتی کات و مەسڵەحەتی ناوچە بووە و وەک دەردەکەوێ ئەم بنەماڵەیە لە ڕابردوودا خزمەتی بە نرخیان کردووە بۆ پاراستنی هێمنیی ناوچەکە و ئاسوودەیی خەڵک، ئەگەر خەتایەکیشیان کردبێ، خەتاکەیان لە ئاست خزمەتەکانیان هیچ نییە و شیاوی چاو لێ پۆشینە. بەڕێزان ئێستا کە ئێوە وەکو نوێنەرانی چینەکانی خەڵکی کوردستان هاتوون بۆ نێوەند، هەڵبەت کە لە ژێر پەنای خاوەن شکۆ و دەوڵەتدان، هەر تکایەکی بیکەن بێ ئەملاو ئەولا لێتان قبووڵ دەکرێ، جا بۆیە باشتر وایە کاتێک لە خزمەت خاوەن شکۆ شەرەفی حزوورتان پەیدا کرد، داوای لێ بکەن لە تەقسیری ئاغایانی قازی خۆش بێ و لێیان ببوورێ. دوای تەواو بوونی قسەکانی خەلعەتبەری، ئاغای حاجی بایزئاغای ئێلخانیزادە (برای عەلی ئاغای ئەمیر ئەسعەد) کە پێشینەی دۆستایەتی و نزیکییەکی زۆری لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو سەیفی قازی (سەیفولقوزات) بابی

١- بڕواننە شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ٩

٢- بابم بەدوای " مەلا خەلیلی گۆڕەومەڕ" لە نێو کەواندا دەنووسێ (ئەم کەسە بەدژی گۆڕینی جلوبەرگ شۆڕشێکی گەورەی لە کوردستان وەڕێخست کە وردە ڕیشاڵی بەجوێ نووسراوەتەوە)

خودالێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان و مامی ئاغایانی قازی محەمەد و سەدری قازی هەبوو، بە لە دوودانی قسەکانی خەلعەتبەری، بەدوور و درێژی قسە دەکا و قوڵ لە سەر ئەوە دەکێشێ ئەو بنەماڵەیە و بەتایبەتی خودالێخۆشبوو سەیفولقوزات خزمەتی بەنرخیان بەخەڵکی کوردستان و وڵات کردووە و تکاکردن بۆ لێخۆشبوونیان بەجێ و واجبە، دوایە ئاغای خەلعەتبەری لە هۆڵەکە دەچێتە دەرێ.

دوای دەرکەوتنی ئاغای خەلعەتبەری، شێخ عەبدورەحیمی شەمسی بورهان کوڕی خودا لێخۆشبوو شێخی بورهان کە لە دژبەران و دوژمنانی سەرسەخت بەڵام لە خۆڕای بنەماڵەی قازی بوو، لە بەرانبەر قسەکانی ئاغای خەلعەتبەری و حاجی بایز ئاغای ئێلخانیزادە بەتوندی دژ دەردەکەوێ و دەڵێ بێتو ئەم قازییانە ئێعدام نەکرێن، بوون و گیان و ماڵی ئێمە دەمەترسیدا دەبێ و ئێمە ناچارین هیجرەت بکەین بۆ خاکی دەرەوە، بەلێبڕاوانە نابێ سەبارەت بە ئازادکران و بەخشینی ئەوانە هیچ بکوترێ، ئەگەر خاوەن شکۆ و دەوڵەتیش بیانەوێ بەنەرمی لەگەڵیان ببزوونەوە، ئێمە دەبێ دژ دەرکەوین و داوخواز بکەین ئیعدامکردنیان وەپەلە بکەوێ. بەم پێیە کاتی چاوپێکەوتنی شا، شێخ ڕەحیم بەپێکێشییەوە داوخوازی ئیعدامی ئەوان دەکا و گوتبووی: بێتو ئەوانە هەرچی زووتره لە نێو نەچن، خاوەن شکۆ دەبێ هەموو سەعاتێک چاوەڕێی ئاڵۆزی و شۆڕشێکی تازە لە کوردستان بکا و دواجار کوردستان لە ئێران جوێ دەبێتەوە، بۆیە چاکەی ملک و میللەت لەوە دایە ئەم قازییانە هەرچی زووتر بە ئیعدام سزا بدرێن و تیرەباران بکرێن. و ئەمە تکای گشت خەڵکی کوردستانە لە دەرکانەی شاهانە. بەو شێوەیە کەسانی تر هیچیان نەگوت و ئاشکرایە بەو قسانە ئەو دەرفەتە لەبارە بۆ ڕزگارییان لە بەر نییەتی خراپ و دوژمنایەتی لەخۆڕای شێخ ڕەحیم لە دەست چوو و ئەوەی نەدەبوو بقەومێ قەوما و هەر سێکیان وەکو پێشتر گوتمان لە بەرواری دووشەمۆ دەی مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ لە مهاباد لە دار دران. جگە لەو سێ کەسە ئەم کەسانەش لە خوارەوە نێویان دێ کە خەڵکی مهاباد بوون، لەبەر دەبەرکردنی جلوبەرگی ئەفسەری حکوومەتی کوردستان حەوتوویەک دواتر، هەر لە هەمان شوێنی کە قازییەکانیان ئیعدام کرد، لە سێدارە دران:

١- محەمەدی نازمی

٢- عەبدوڵای ڕەوشەنفکر

٣- حامیدی مازووچی

٤- ڕەسووڵی نەغەدەیی

هەروەها یازدە کەسیش لە بۆکان و سەقز لە مەزنان و بەگزادەکانی تایفەی فەیزوڵڵابەگی لەوانە ئەحمەد خانی فارووقی کە لەمەڕ کێشەی سەقز تاوانبار کرابوو، بەکوشتنی سەرلەشکر ئەمین ئێعدام کران.

جگە لەو کەسانەی ئێعدام کران، ژمارەیەکی زۆریش لەبەر هاوکاری لەگەڵ حکوومەتی کوردستان، گیران و خرانە ژێر چاودێری و محاکەمە کران و هەرکامێکیان حوکمی ساڵانی درێژی زیندانییان بۆ برپاوە، بەڵام دوای دووساڵ بە پێی پێشنیاز و تکای ئاغای سەید حەسەنی تەقیزادە سەناتۆری ئازەربایجان پارلمان قانوونێکی پەسند کرد گشت ئەو زیندانە سیاسییانەی لە پێوەندی لەگەڵ کێشەی ئازەربایجاندا گیرابوون، جگە لەو کەسانەی بە قەتڵ تاوانبار کرابوون لە زیندان ئازادکران.

ئەو خاڵەش دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ دوای گەڕانەوەی قووشوونی دەوڵەتی بۆ ئازەربایجان، قانوونێک لە مەجلیس پەسند کرا، بڕیار درا گشت موڵک و ماڵی سەرهەڵداوان بە دژی دەوڵەتی نێوەندی، بۆ دەوڵەت دەستیان بەسەردا بگیرێ و تەنانەت فەرمانی بەڕێوەبردنی ئەو قانوونە سەبارەت بە موڵک و ماڵی جێی سرنجی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی بە ئیدارەی داراییی مهاباد و مەراغەش ڕاگەیێندرابوو، بەڵام سپەهبود شابەختی کە ئەو دەمی ئەستانداری ئازەربایجان بوو، نامەیەکی بۆ نێوەند نووسیبوو و تکای کردبوو لەبەرئەوەی دەوڵەت سەرپەرستی ئەو بنەماڵانەی ئێعدام کردووە لە دەستبەسەرداگرتنی مڵک و ماڵیان چاو بپۆشێ. داوخوازی سپەهبود شابەختی کاری خۆی کرد و دەوڵەت لە دەستبەسەرداگرتنی مڵک و ماڵی قازییەکان و خەڵکی دی دەستی پاراست. لە کاتێکدا کە سپەهبود شابەختی حەولی دەدا بۆ باڵکێشان بە سەر منداڵانی سەغیری قازییەکان و کەسانی دیکە، بەپێی نووسراوەی ژمارەی... (بابم ژمارەی گۆوارەکەی نەنووسیوە و بەبەتاڵی بەجێی هێشتووە) گۆواری (خواندنیها) کە بۆخۆم خوێندوومەتەوە، کابرایەک بەناوی هەمزە خەلیل یەکێک لە وردە خاوەن موڵکانی محاڵی شارویران کە لەو کاتەدا چووبووە تاران گوتبووی: ئەمن لە سەردەمی قازی محەمەددا دژایەتیم کردووە و لەگەڵ پێشمەرگەکانی شەڕم کردووە و چەند کوژراوم داوە و چەند کەسێکیشم لێ کوشتوون، پاشان لەبەرئەوەی خۆم پێ نەدەپارێزدرا هەلاتم و دارایی و موڵک و ماڵی من لە لایەن قازی محەمەدەوە دەستی بەسەر داگیرا، ئێستا بەجێیە دەوڵەت بۆ قەرەبووکردنەوەی دژایەتییەکانی من لەگەڵ قازییەکان مڵک و ماڵی وان بدا بەمن. هەڵبەت ئیددیعای ئەو کابرایە بێ بنج و بناوان بوو. ڕاستییەکەی ئەوە

بوو ئەو کەسە لەگەڵ دراوسێکانی مڵکەکەی خۆی کە خزمایەتیشی لەگەڵیان هەبوو، کێشەی لێ پەیدا بوویوو و شەڕیان کردبوو و لەهەر دوو لا چەند کەس کوژرابوون، دەیەویست ئەو مەسەلەیە بەئەستۆی قازی محەمەددا بهێنێ. دەوڵەت لەو بارەیەوە هێندێک لێکۆڵینەوەی کرد و ڕاستیی بابەتەکە ڕوون بووەوە و گوێی نەدرایە داوخوازی بێ بنەمای ئەو کابرایە.

هەر وەک پێشتر باسمان کرد، ئەو دەمەی کە هێزە دەوڵەتییەکان هاتنە نێو مهابادەوە، تاکوتەرای بارزانی بەرەو سندووس و شنۆ پاشەکشەیان کرد. لەوکاتەدا کاربەدەستانی عەسکەری لە مهاباد بە مەبەستی ئەوەی بە شێوەیەک گرێوگۆڵی بارزانی هێمنانە یەکلا بکەنەوە و خۆیان لە کۆڵ ئەو تاکوتەرا شەڕدیتوو، شەڕکەر و سەرسەختانە بکەنەوە و کاری نێوان ئەوان و ئەرتەش نەگاتە شەڕ و خوێنڕێژی، لەگەڵ بارزانییەکان لە پێوەندی و وتووێژدا بوون. بۆیە مەلا مستەفایان لەگەڵ دوو نەفەر لە ئەفسەرەکانی بەنێوی میرحاج و عێزەت عەبدولعەزیز، بەنێوی وتووێژ و میوان بانگ کرد بۆ مهاباد. دوایە مەلا مستەفا و هاوڕێیانی بۆ وتووێژی ئاشتی چوون بۆ تاران، بەڵام لایەنەکان نەسازان. (لە کتێبی "زندگی سیاسی قوام السلطنه" (ژیانی سیاسی قەوامولسەلتەنە)، نووسینی جەعفەری مێهدی نیا، لاپەڕەی ٥٣٦دا هاتووە: مەلا مستەفا لە بەرواری ڕۆژی نۆی بەفرانباری ١٣٢٥ی هەتاویدا گەڕاوەتەوە مهاباد - بژارکار. پێویستە ئاماژەی پێ بکرێ جەعفەری مێهدی نیا زۆربەی باسی سەبارەت بەکوردستانی لەو کتێبەدا دەقاودەق لە کتێبی ئیگلتن وەرگرتووە، بێ ئەوەی نێوی بهێنێ، تێبینیی وەرگێڕی کوردی) دە وان ڕۆژاندا، دەنگۆی ئەوە بڵاو بوویووەوە مەلا مستەفا بڕیاری داوە، بە هەر شێوەیەک بۆی بکرێ قازییەکان لە بەندیخانە ڕزگار بکا، بەڵام جێبەجێکردنی ئەو بڕیارە لە بەر ئەو کوشتوکوشتارەی بارزانییەکان لە عێلی مامەشی لاجانیان کرد، سەری نەگرت. وردەڕیشاڵی ئەو ڕووداوە دڵتاوێن و پڕ لە پەژارەیە ئاوایە:

لەبەرئەوەی بارزانییەکان پێیان وانەبوو بتوانن لە بەرانبەر قوشوونی دەوڵەت و سوارەی عەشیرەتەکان خۆ بگرن و ئامراز و وەسیلەی خۆپاراستنیان لە بەرانبەر تانک و تۆپ و فڕۆکەدا نەبوو و لە لایەکی دیکەوە نەیاندەتوانی بگەڕێنەوە عێراق و زۆر لە سەرکردەکانیان لەوانە مەلامستەفا خۆی لە عێراق پاشملە محاکەمە کرابوون و حوکمی ئیعدامیان بۆ بڕابووەوە و لەگەڵ دەوڵەتی ترکییەش پێشینەی نێوانناخۆشی و دوژمنایەتییان هەبوو، سەرمای توفی زستان، بەفری ئەستوور، نەبوونی ئازووقە و خواروبارو نەبوونی پەناگە و

پۆشاک بە توندی تەنگی پێ هەڵچنیبوون، بۆیە دەیانەویست، بە بێ چەکدانان و بێ تەقە و ڕەقە و بەبێ ئەوەی سەختیی زۆرتر بچێژن بەرە بەرە بەرەو ئەو سنوورانەی پاشەکشە بکەن کە بەڕوویانەوە داخرابوون، ئەو ڕێگایەی کە هەمووی کوێستان بوو و بەفر دای پۆشیبوو، و لەبەرئەوەی بۆ گوێستنەوەی ژن و منداڵ و ئەو برە کەمە کەلوپەلەی کە هەیانبوو پێداویستییەکی زۆریان وەسیلەی خێرای کوێستانی لە گوێن ئەسپ و ئێستر هەبوو و هەروەها لەبەرئەوەش لەگەڵ بەشێک لە مامەشەکانی لاجانێ، کە لە سەر ڕێی پاشەکشەی ئەوان بوون نێوانیان خۆش نەبوو و لەوە نیگەران بوون نەکا هێرشیان بۆ بێنن، بۆیە بارزانییەکان بڕیار دەدەن لە یەک ڕۆژ و لەیەک سەعاتدا بەدەستە دەستەی بچووکی دە پازدە کەسی لە تاکوتەرای بژاردە و کارامەی خۆیان سەرتاسەری گوندە سەرەکییەکانی لاجانی مامەش، بە تایبەتی گوندەکانی تایفەی ئەمیرعەشایری چەک بکەن و دەست بەسەر ئەسپ و ئێسترەکانیاندا بگرن کە بۆ ئەوان پێداویستیی مان و نەمان بوو و ئاسانکارییەکی گەورە بوو بۆ ڕاگوێستنی خاو و خێزانیان، بەو پێیە دەستەکانی نێوبراو لە یەک ڕۆژدا جەنگەی نیوەڕۆیە، دەچنە نێو گوندەکانی گردک سیپان، شاوەلێ، سێڵوێ، لە پێشدا چەند کەس لە تاکوتەرای هەر دەستەیەک ئاوەدانییەکە گەمارۆ دەدەن و چەند نەفەریش بەموسەلسەلی دەستییەوە دەچنە ماڵی ئاغای هەر گوندێک و بەزەبری چەک و هەڕەشەی کوشتنیان داوای ئەسپ و چەکیان لێ دەکەن و لەبەرئەوەی ئەو کردەوەیەی بارزانییەکان یەکدابەدوو و بەپێچەوانەی چاوەڕوانی بوو و کەس باوەڕی نەدەکرد لە هەلومەرجێکی ئاوا دژواری کە تێیدابوون دەستدرێژی بکەنە سەر عەشیرەتێکی بە توانای وەک مامەش، بۆیە ئەو شوێنانە بەتەواوی خافڵگیر بووبوون، عەمەلیاتی چەککردن و ئەستاندنی ئەسپ و ئێستر لە چەند ئاوەدانییان بێ تەقە و ڕەقە بەکۆتا هاتبوو و بارزانییەکان هێندێکیان ئەسپ و چەک وەگیر هێنابوو، بەڵام لە گوندی سێڵوێ، عەمەلیاتی چەککردنی مامەشەکانی ئەمیر عەشایری بە کوشتوکوشتار و خوێنڕێژی تەواو بوو. کورتەی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە بەو جۆرەی کە دەیگێڕنەوە ئاوا بووە:

هەرکە بارزانییەکان دەگەنە قەراغ گوندی سێڵوێ، مڵکی حوسێنی محەمەدئاغای ئەمیر عەشایری کە لە سەرکردە و پیاوانی ناسراو و ئازای تایفەی ئەمیرعەشایری بوو، ژمارەیەک لەوان بەنهێنی و بێ تەقەوڕەقە گوندەکە گەمارۆ دەدەن و حەوت هەشت کەسیش کە موسەلسەلی دەستییان پێ دەبێ لە دیوەخانی ئاغا وەژوور دەکەون. (دیوەخان ژووری میوانداریيە لە نێو عەشیرەتە کوردەکاندا)، لە دوای سڵاوکردن و بەخێرهێنانیان،

ژمارەیەک لەوان لەلایەکی مەجلیسەکە دادەنیشن. دوایە یەکێک لە بارزانییەکان ڕوو لە حوسێنی محەمەد ئاغا، خاوەن موڵکی دێی نێوبراو دەکا و دەڵێ ئێمە بەئەمری مەلا مستەفا هاتووین، دەبێ هەرچی ئەسپ و چەک و ئێستری هەتانە بماندەنێ لەگەڵ خۆمانی بەرین. حوسێنی محەمەدئاغا کە پیاوێکی نەترس و دلێر بوو، دەڵێ: مەلا مستەفاش وەک ئێمە عەشیرەتە، ناتوانێ ئێمە چەک بکا. بارزانییەکان لە وڵامدا دەڵێن: ئێمە ئەو قسانەمان بەگوێدا ناچێ، ئێمە ڕاسپاردەمان ئەوەیە یا ئێوە چەک بکەین یان بکوژرێین. مام وسێن کە دەبینێ شەپکە توندە، لە وڵامدا دەڵێ ئێوە لە ڕێگای دوورەوە هاتوون و دەبێ ماندووش بن، باش وایە هێندێک بحەسێنەوە و نانی نێوەڕۆ بخۆن، دوایە فکرێکی لێ دەکەینەوە. بارزانییەکان دیسان قسەی پێشووی خۆیان دووپاتە دەکەنەوە و لێی زیاد دەکەن، ئێمە تەنانەت دەقیقەیەکیش ئیزنی سەبر و وەخرانی ڕاسپاردەکەی خۆمان نییە. ئامادە بووانی مەجلیسەکە کە لە خزمان و نزیکانی مام وسێنی محەمەد ئاغا بوون و بە هەڵکەوت هەر ئەو ڕۆژە بۆ دیدەنی وی هاتبوون، چاوێک لە یەکدی و چاوێک لە مام وسێن دەکەن بۆ ئەوەی بزانن چ بکەن. لەو هەلە ناسک و بە مەترسییەدا یەکێک لە حازرانی مەجلیس کە گۆیا سلێمانی کوڕی حوسێنی محەمەد ئاغا بووە دەست دەبا بۆ دەمانچەکەی. (بابم لە کەوانەدا لێی زیاد دەکا: "دیار نییە بەچ مەبەستێک ئەو کارەی کردووە داخوا مەبەستی دەستکردنەوە بووە یان ویستوویە دەمانچەکەی خۆی بدا بەبارزانییەکان؟")، یەکێک لە بارزانییەکان کە بەپێوە دەبێ، بێ ئەوەی سێ و دووی لێ بکا قامک لە پەلەپیتکەی موسەلسەلەکەی دەبزێوێ و دەستڕێژی لێ دەکا. ئەو کەسەی نێو براو بەلەشی دابێژ دابێژ لە سەر مافوورەی ژوورەکە لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ. لەو کاتەدا وسێنی محەمەد ئاغا لەجێی خۆی ڕاست دەبێتەوە هاوار دەکا مەکەن، مەکەن، هەرچی بتانەوێ دەیکەین. بەڵام تازە کار لە کار دەترازێ و ئەوەی نەدەبوو ببێ، دەبێ. بارزانییەکان گوێ نادەنە هاواری و بەدەستڕێژی موسەلسەلەکانی خۆیان گشت ئامادەبووانی مەجلیسەکە جگە لە یەکێکیان نەبێ کە وەبن تەرمەکان دەکەوێ و بریندار نابێ و هاوار دەکا بۆخاتری مەلا مستەفا مەمکوژن لە چاوترووکانێکدا قەتڵی عام دەکەن. دوای چەند سانییە مام وسێن و دوو کوڕی و چەند کەس لە برازا و ئامۆزاکانی بەگشتی چاردە کەس هەر لەو ژوورەدا بێ گیان دەبن. (بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ١٠).

لە کۆتاییی کارەکە دا، بارزانییەکان هەرچی ئەسپ و چەکی لەماڵی مام وسێندا دەبێ هەمووی لەگەڵ خۆیان دەبەن. لەو کوشتوکوشتارەدا لە بارزانییەکان تەنێ یەک نەفەر

ئەویش بەگوللەی موسەلسەلی خۆیان، بە سووکی بریندار دەبێ. یەکێک لە نۆکەرەکانی مام وسێن لە قەراغ گوندەکە چەند گوللە بەئاسمانەوە دەنێ، بارزانییەکان یەکێک لە خەڵکی دێیەکە دەنێرنە لای نۆکەری نێوبراو و حاڵیی دەکەن چ قەوماوە، کابرا دەست لە تەقە هەڵدەگرێ، بارزانییەکان نۆکەری نێوبراو جارز ناکەن و هەر تەنێ تفەنگەکەی لێ دەستێنن. لەبەر قەومانی ئەو پێشهاتە خوێناوییە بارزانییەکان نەیانتوانی نەخشەی ئازادکردنی قازییەکان لە بەندیخانە جێبەجێ بکەن.

هەر وەک پێشتر باسمان کرد، قازییەکان لە بەرەبەیانی ڕۆژی دووشەمۆ دەی مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی لە شاری مهاباد ئێعدام کران. ئەوان لە گۆڕستانی ناسراو بەمەلاجامی کە لە ڕۆژهەڵاتی مهاباد لە بناری کێوی داشامەجید هەڵکەوتووە، بەخاک ئەسپێردراون. خەڵکی مهاباد لەبەر ئیخلاس و ئیرادەتێکی سەبارەت بەو گەورە پیاوانە لە خۆیاندا هەست پێدەکەن، زۆرجار دەچنە سەر مەزاریان و بەفاتیحا خوێندن و نزا و پاڕانەوە ڕۆحیان شاد دەکەن. گۆڕستانی نێو براو لە ساڵی ١٣٣٧ی هەتاوی لە لایەن کاربەدەستانی عەسکەرییەوە بەمەبەستی سازکردنی خانووبەرەی فەرهەنگی بە تەواوی تەخت کرا و شوێنەواری گۆڕستانەکە لە نێوچوو، ئاشکرایە کە گۆڕی خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد و سەدری قازی و محەمەد حوسێن خانی سەیفی قازی نەپارێزرا. (مەزاری هەر سێ قازییەکان پارێزراوە - ئەحمەدی قازی).

لە گۆڕستانی مەلاجامی، بەتایبەتی لە مەزاری دێبۆکرییەکان، زۆر کێلنووس هەبوون کە لەسەریان بەبەرزترین شێوەی خەتی نەسخ و نەستەعلیق ناو و پاشناو و ڕێکەوتی کۆچی دوایی خاوەن گۆڕەکە و شێعری لەباری شاعیرە کۆنەکانی ئێران نووسرابوون، بەداخەوە ئەو کێلانە کە نیشانەی زەوق و هونەری خەڵکی مهاباد بوون، تێک شکێندران و لە نێویان بردن (بڕوانە: گورستان ملا جامی در مهاباد، بەانضمام گوشەیی از تاریخ مهاباد، نوشتەء قادر فتاحی قاضی، تبریز، خرداد ماه ١٣٥٩ (گۆڕستانی مەلاجامی لە مهاباد، لەگەڵ گۆشەیەک لە مێژووی مهاباد، نووسینی قادری فەتاحیی قازی، تەورێز، مانگی پووشپەڕی ١٣٥٩ی هەتاوی)

خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە بەنێوی عەلی قازی کە بە" کوڕی ڕەش" بەنێویانگە. نێوبراو ئێستا بەخەرجی دەوڵەت لە وڵاتی ئاڵمان خەریکی خوێندنە، هەروەها کچان و هاوسەری خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد مانگانە دەهەزار ڕیاڵیان مووچە بۆ بڕاوەتەوە. هاوسەری خوداڵێخۆشبوو لە دوای شەهیدکرانی قازی،

ژیانی هاوسەریی پێک نەهێناوەتەوە و خەریکی سەرپەرشتیی مولک و منداڵەکانیەتی و ئێستا لە تاران دادەنیشێ. (بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ، ١١)

خوداڵێخۆشبوو ئەبولقاسمی سەدری قازی، دوو کوڕی هەیە بە نێوی کەماڵ ئاغا و عەبدوڵاخان. کەماڵ ئاغا ئێستا بەخەرجی خۆی لە وڵاتی ئاڵمان خەریکی خوێندنە لە بواری پزیشکیدا.

عەبدوڵڵاخان لە تاران دەخوێنێ. هاوسەری خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی، سوڵتان خانم لە دوای شەهیدکرانی خوداڵێخۆشبوو سەدری قازی، ژیانی هاوسەریی پێک نەهێناوەتەوە و خەریکی سەرپەرشتیی منداڵەکانی و پەروەردەی ئەوانە.

خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان، سێ کوڕی هەیە بەناوی فەتاح خان کە بەهمەن خانیشی پێ دەڵێن و عەلی خان و مەحموود ئاغا و دوو کچیشی هەیە. هاوسەری خوداڵێخۆشبوو محەمەد حوسێن خان واتە شازدەخانم فەرۆخلەقا خانمی مەلیک قاسمی لە دوای ئەو خوداڵێخۆشبووە ژیانی هاوسەریی پێک هێنا. (یای حاجی فەرۆخلەقای مەلیک قاسمی (حاجی شازدە خانم) لە بەرواری چوارشەمۆ (٣)ی مانگی بەفرانباری ساڵی ١٣٦٥ لە شاری تەورێز ماڵاوایی لە ژیان کردووە.)

ئاماژەکردن بەو خاڵە پێویستە کە خوداڵێخۆشبوو قازی محەمەد لەو ماوەیەدا کە کاروباری ئینتیزاماتی مهاباد لە لایەن سەرۆک عەشیرەتەکانەوە (قەرەنی ئاغای مامەش، عەوڵڵاغای بایەزیدیی مەنگوڕ، عەلی ئاغای عەلییار) و دواتر لە لایەن بەرێزیانەوە، بەڕێوە دەچوو، هیچ کات پێوەندی خۆی لەگەڵ تاران و کاربەدەستانی کاروبار نەبڕی و هەر کاتێک کاربەدەستانی پایەبەرزی وڵات بانگیان دەکرد، دەستبەجێ دەچوو بۆ نێوەند و جارجاریش بێ ئەوەی بانگهێشتنێک لە گۆڕێدا بێ، بۆ خۆی دەچوو بۆ تاران و چاوی بەکاربەدەستانی کاروبار دەکەوت و تەنانەت یەک دوو جاریش چاوی بە شا کەوتبوو. ڕۆژنامەی دنیا لە ژمارەی ٣٨٥ی خۆیدا ڕێکەوتی ٢٦ی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٣٤ ی هەتاوی وتارێکی سەبارەت بەسەفەری قازی محەمەد بۆ تاران لە سەردەمی سەرۆکایەتیی کۆماردا بڵاو کردووەتەوە کە لەخوارەوە هێندێک بەشی ئەو وتارە بۆ زیادکردنی زانیاریی خوێنەرەوانی ئەم یادداشتانە دەنووسینەوە:

"سەفەری قازی محەمەد سەرۆک کۆماری کوردستان بۆ تاران لە ڕووداوە گرینگەکانی زەمانی حکوومەتی قەوامولسەلتەنە بوو. ئێمە بۆ ئاگاداری لە هۆی ئەو سەفەرە و شێوەی

هاتنی قازی بۆ تاران و ڕەوتی چاوپێکەوتن و وتووێژەکانی لەگەڵ قەوامولسەلتەنە و ڕەزم ئارا، پێرێ شەوێ لە ماڵی یەکێک لە نوێنەرانی مەجلیس کە ژمارەیەک لە نوێنەرانی کوردستان و ئازەربایجان لەوێ بوون و ئەو دەمی ئاگایان لەو دیدارانە بووە، پێوەندیمان کرد و ئەم زانیارییانەمان وەرگرت کە بەتەواوی جێی باوەڕن و بۆ یەکەمین جار چاپ و بڵاو دەکرێنەوە:

دوای ئەوەی پیشەوەری و ئەندامانی میسیۆنەکەی لە تاران ڕۆیشتن قەوامولسەلتەنە بیری لێ کردەوە داوا لە قازی محەمەد بکا بێ بۆ تاران بۆ ئەوەی لەبیر و بۆچوونەکانی ئاگادار بێ. تازە چەند ڕۆژێک بوو سەدری قازی برای قازی محەمەد کە نوێنەری خولی چاردەیەمی مەجلیس بوو لە کوردستانەوە هاتبووە تاران. سەدری قازی تا دوایین دەمەکانی مەجلیسی چاردەیەم کە ڕۆژی ٢٠ی ڕەشەمەی ١٣٢٤ ئەو خولە کۆتایی هات دژی بیروڕای براکەی قازی محەمەد بوو و زۆرجار ئەو بابەتەی وەبیر نوێنەرانی مەجلیس، وەزیرەکان و کاربەدەستانی ئەرتەش دەهێناوە، بەڵام لە دوای کۆتاییهاتنی خولی مەجلیس، کۆماری ئازەربایجانی شوورەوی ژمارەیەک لە کەسایەتییەکانی ئێران و لەوانە مەلیکوشوعەرای بەهار و مەشکووتی بانگهێشتن کرد بۆ ئەوەی چەند ڕۆژێک سەردانی باکۆ بکەن و سەر لە دامەزراوە کولتوورییەکانی ئەو کۆمارە بدەن. یەک لەو کەسانەی کە بانگهێشتن کرابوو هەر هەمان سەدری قازی بوو کە دوای گەڕانەوەی لە سەفەری بادکووبە بە تەواوی بیروڕای خۆی گۆڕی و هەتا دەهات زیاتر لە برایەکەی نزیک دەبووەوە.

قەوامولسەلتەنە لە یەکێک لە ڕۆژەکانی جۆزەردانی ١٣٢٥ سەدری قازی بانگ کرد بۆ کۆشکی وەزارەتی کاروباری دەرەوە و ڕای گەیاند خراپ نییە قازی بۆ جێبەجێکردنی مەسەلەی کوردستان بێتە تاران و لێرە ناکۆکییەکان چارەسەر بکا.

سەدری قازی ئەو فیکرەی پەسند کرد و لەوبارەیەوە تێلگرافێکی بۆ برای خۆی نارد و قازی محەمەد دوای ئامادەکردنی سەرەتاکانی کارەکە چووە تەورێز و دوای دیدار لەگەڵ پیشەوەری بە فڕۆکەی شیرکەتی ڕێبوارگوێستنەوەی شوورەوی کە دە وان ساڵاندا لە خەتی تەورێز و تاراندا هاتوچۆی دەکرد، نزیک سەعات دەی بەیانی ڕۆژی چوارشەمۆ پێنجەمی تیر مانگ (پووشپەڕ) گەیشتە تاران. لە فڕۆکەخانەی مێهراباد سەدری قازی پێشوازیی لە براکەی خۆی کرد و بەپێی بەرنامەیەکی دیاریکراو قازی محەمەدیان برد بۆ میوانخانەی دەربەند و لەوێ دابەزی. یەکەم کەسی کە چووە دیداری قازی محەمەد، ئێلخانیزادە (بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ١٢- بژارکار) نوێنەری

هەنووکەی مەهاباد لە مەجلیس بوو کە ئەو دەمی پیشەی پێوەندیکاری نێوان قەواموسەلتەنە و ڕەزم ئارای هەبوو. ئێلخانیزادە لە دۆستانی نزیکی قازی محەمەد بوو و بەر لە ڕووداوەکانی کوردستان هاتبووە تارانێ و پێوەندی خۆی لەگەڵ قازی محەمەد بریبوو.

ئێلخانیزادە لە یەکێک لە دیوەکانی نهۆمی سەرەوەی هۆتێل دەربەند چاوی بەقازی محەمەد کەوت. قازی محەمەد دەیزانی ئێلخانیزادە لەگەڵ دەوڵەتی نێوەندی هاوکاری دەکا و لەبەرئەوەی لە تافی لاوەتییەوە لەگەڵی دۆست بوو و لە ژیاندا هیچ خراپەیەکی لێ نەدیتبوو، ئیزنی دا ئێلخانیزادە چاوی پێی بکەوێ. لەو دیدارەدا ئێلخانیزادە بێ ڕوو دەربایستی بە قازیی گوت، هەتا زوویە بۆ ڕزگارکردنی خۆت لەو گرفتە گرینگە چاوت بە شا بکەوێ و دەستی هاوکاری بدە بە دەوڵەتی نێوەندی و ئەگەر دەترسێی لە کوردستان لە لایەن کاربەدەستانی بێگانەوە ئازارێکت پێ بگا دەتوانی جارێ لە تاران نەچییە دەرەوە یان بەپێی مەسڵەحەتی شا سەفەر بکە بۆ ئەمریکا و دوای ئەوەی کە کوردستان هاتەوە نێو ئێران بگەڕێوە مەهاباد. قازی محەمەد پێی دەڵێ، چۆن دەکرێ من دەست لە ئابڕوو و حەیسییەتی خۆم هەڵگرم و هەموو زەحمەتەکانم بە با بچێ. داوات لێ دەکەم جارێکی دیکە ئەم قسەیە دووپاتە نەکەیەوە کە من ئامادە نیم بیبیستم.

ئێلخانیزادە دیسان لەسەری دەڕوا و قازی محەمەدی پێ پێمل نابێ. سەعاتێک دواتر ئێلخانیزادە بەهیوای دیداری دووەم لە لای قازی دەڕوا و دەستبەجێ دەچێ بۆ ستادی ئەرتەش و ڕەزم ئارا لە نێوەرۆکی دیداری خۆی لەگەڵ قازی ئاگادار دەکا. ڕەزم ئارا دەستبەجێ ژمارە تەلەفۆنی تایبەتی قەواموسەلتەنە دەگرێ کە ئەو دەمی لە سەفارەتی هاوینەی ئاڵمان دەژیا و سەرۆک وەزیر ئاگادار دەکا ئێلخانیزادە هەڵگری زانیاریی گرینگە سەبارەت بەقازی محەمەد، ڕێگا بدەن با هەر ئێستا بێ بۆ دیدەنیتان. قەوامیش دەڵێ، باشە بابێ.

ئێلخانیزادە دەچێتە کۆشکی سەرۆک وەزیری، لە دیوی چاوەڕوانی سپەهبود ئەحمەدی وەزیری شەڕ و دوکتور ئیقباڵ دەبینێ کە چاوەڕێی دیداری قەواموسەڵتەنە بوون. سپەهبود ئەحمەدی هۆی دیداری ئێلخانیزادە دەپرسێ و ئێلخانیزادەش کورتەی بابەتەکە بە ئاگاداریی وەزیری شەڕی کابینەی قەوام دەگەیێنێ. نیو سەعات دواتر محەمەدی قەوام، سەرۆکی دەفتەری سەرۆک وەزیر ڕێگای چوونە ژوورەوە بەئێلخانیزادە دەدا و ئەویش دەچێتە دیوی کاری قەواموسەڵتەنە و ناوەڕۆکی دیداری خۆی لەگەڵ قازیی محەمەد موو

بەموو بۆ قەوامولسەڵتەنە دەگێڕێتەوە. لە کۆتاییدا ئێلخانیزادە ئیزن دەخوازێ برِوا و قەوام پێی دەڵێ، بەیانی زوو بێتەوە بۆ دیداری. ئێلخانیزادە لە کاتی دەرکەوتن لە دیوەکە وەبیری دێتەوە مەبەستێکی گرینگی بە قەوامولسەڵتەنە نەگوتووە، دیسان دەگەڕێتەوە دیوەکە و دێتە پێش مێزی نووسینی قەوام و دەڵێ: "داوخوازم لە حەزرەتی ئەشرەف ئەوەیە کاتی دیداری قازی محەمەد، ئیزنی هاتنی سەدری قازی نەدەن، لە پێشدا قازی محەمەد وەربگرن و بۆخۆتان وتووێژی لەگەڵ بکەن و دوای ئەوەی لە بیروڕاکانی قازی ئاگادار بوون، ئیزن بدەن سەدری قازی بێتە ژووری." قەوام ئەو فیکرەی لا پەسند دەبێ و دەڵێ هەر وا دەکەم.

کاتێک ئێلخانیزادە (لێرەدا بابم ئێلخانیزادە دەناسێنێ و لەبەرئەوەی نێوبراو لە کۆتایی ئەم کتێبەدا لە بەشی شیکرنەوەکاندا ناسێندراوە (ژمارەی ١٢)، ئیدی دووپاتەکردنەوەی لێرەدا پێویست ناکا - بژارکار) لە خانووی یەک نهۆمیی کۆشکی کوێستانی دێتە دەرێ لە پێش خانووی دەفتەری موزەفەری فیرووز دەبینێ قازی محەمەد لەگەڵ براکەی بەرەو خانووی شوێنی نیشتەجێی قەوامولسەڵتەنە دەچن. قازی محەمەد هەر کە چاوی بە ئێلخانیزادە دەکەوێ بەزمانی کوردی پێی دەڵێ: " فلانەکەس چووبووی بۆمان تێ چێنی!؟" ئێلخانیزادە وڵام دەداتەوە" دڵنیا بە هەموو قسەکانم بەقازانجی تۆ بوون، ئێستا دەچی و دەبینی".

ئێلخانیزادە دەبینێ سەعید خانی هومایوون ئاجودانی قازی محەمەد، بەجلوبەرگی ئەفسەری کوردستانەوە بەدوای قازیدا دێ، بە قازی دەڵێ شایستەی تۆ نییە ئەو کەسە بەو جلوبەرگەوە لە تەک تۆدا بێ، چونکو قەوامولسەڵتەنە پیاوێکی یەکدەندە و وشکە، بۆ ڕاکێشانی خۆشەویستیی وی سەعید خان لەگەڵ خۆت مەبە. قازی محەمەد هەر لەوێوە سەعید خانی هومایوون دەنێرێتەوە دەرەوەی باخ کە ئۆتۆمۆبیلی قازی محەمەد لەوێ ڕاگیرابوو.

قازی محەمەد دوای ماڵاوایی لە ئێلخانیزادە دەچێتە نێو خانووی سەرۆک وەزیر. محەمەدی قەوام دەستبەجێ قەوامولسەڵتەنە لە هاتنی قازی محەمەد ئاگادار دەکا. قەوامولسەڵتەنە زەنگ لێ دەدا، ئەکبەرخان کە پێشخزمەتی تایبەتی قەوامولسەڵتەنە بوو، بانگ دەکا و ئیزنی هاتنە ژووری قازی محەمەد دەدا و کاتێک سەدری قازی بەدوای براکەیدا دێ، ئەکبەرخان پێشی دەگرێ و دەڵێ چەند دەقیقەیەک تەشریفتان لە دیوی چاوەڕوانی بێ، تاکو ئیزن وەربگرم، سەدری قازی لە ژووری چاوەڕوانی دەمێنێتەوە و ٢٠

دەقیقە دواتر بانگ دەکرێ. لەو دیدارەدا قەوامولسەڵتەنە وا بەسەدری قازی دەنوێنێ کە ئامادەی هاوکارییە لەگەڵیان چونکو دڵی بە سیاسەتی شوورەوییەوەیە. ئەو دیدارە تەقریبەن لایەنی تەشریفاتی هەبوو و بڕیار درا بۆ بەیانیی ئەو ڕۆژە دیداری دووەم سەر بگرێ و هەروەها قەوامولسەڵتەنە سەدری قازی ئاگادار دەکا، دوکتور جاوید کە تازە بووەتە ئەستانداری ئازەربایجان لە تارانە و ئەو بۆ جێبەجێکردن و تەرتیبی تەشکیلاتی کوردستان پێوەندیتان لەگەڵ دەکا و چاوی پێتان دەکەوێ.

بۆ بەیانی زوو ئێلخانیزادە دەچێتەوە دیداری قەوامولسەڵتەنە و قەوام بە ئێلخانیزادە دەڵێ: لەمڕۆ دەبێ لەگەڵ کوردستانییە بەنێوبانگەکانی دانیشتووی تاران وەکو حاجی عێزولەمالیکی ئەردەلان و ئاسەف، پێوەندی بگری و کارێکی وا بکەی بچنە دیدەنی قازی محەمەد و لە ڕاستییەکانی بارودۆخ ئاگاداری کەن (وا وێ دەچێ قەواموسەڵتەنە یان ئیدی پێشتر هێندێک ڕاسپاردە و ئامۆژگارییان دابێ بەو کەسانە - بژارکار). ئێلخانیزادە بەڵێنی دەداتێ و پاشان دەڵێ: دوێنێ شتێکم لە بیرچووبوو بەعەرزتان بگەیێنم و ئەویش ئەوەیە کە قازی محەمەد گوتبووی مەبەست لە سەفەری بۆ تاران وەرگرتنەوەی سەردەشت و سەقز و بانەیە کە ئێستا بەدەست هێزە دەوڵەتییەکانەوەن. قەواموسەڵتەنە توورە دەبێ و دەڵێ ئەو قسانە چییە؟ ببڕ ببڕ سەفەری قازی بۆ ئەو شتانە نەبوو. چونکو دوێنێ دیداری وی لەگەڵ من لایەنی تەشریفاتیی هەبوو، هەر ئێستا بچووە لای قازی و دۆستانە پێی بڵێ سەبارەت بە سەردەشت و سەقز و بانە وشەیەکیش چییە نەڵێ، چونکو ئەوە دەبێتە هۆی بڕینی وتووێژەکان.

ئێلخانیزادە دەستبەجێ بەرەو دەربەند دەچێ و کاتێک دەچێتە نێو هۆتێل دوکتور سەلامولڵای جاوید ئەستانداری ئازەربایجان خەریکی وتوویژ دەبێ لەگەڵ قازی محەمەد. ئێلخانیزادە بۆ ئەوەی سرنجی دوکتور جاوید بەرەو لای خۆی ڕانەکێشێ خۆی لە تەلەفۆنخانەی هۆتێل دەربەند دەغافڵێنێ. نیو سەعات دواتر لەلایەن پێشخزمەتەوە ئاگادار دەکرێ کە دوکتور جاوید ڕۆیشتووە، دەستبەجێ لە پلیکانەکان سەردەکەوێ و دەچێتە خزمەت قازی محەمەد. ئێلخانیزادە پاشماوەی قسەکانی دوێنێی درێژە پێ دەدا، و قازی لە وڵامیدا دەڵێ: دوێنێ قەواموسەڵتەنە نیشانی دا بەتەواوی بە دەردی دڵمان ئاشنایە. ئێلخانیزادە پاشماوەی قسەی سەرەکی دادەکوژێنێ و دەڵێ: بۆچی دیداری سەرلەشکر ڕەزم ئارات وەدوایە خست؟ خراپ نییە بچییە دیدەنی ئەویش. قازی بەو قسەیە نێوچاوانی تێک دەنێ و دەڵێ ڕەزم ئارا دەبێ بێتە دیتنی من، ئەگەر چوومە دیداری قەواموسەڵتەنە

لەبەر ئەوە بوو قەواموڵسەڵتەنە دوو کراسی لە من زیاتر دڕاندووە و لە باری تەمەنەوە لە من گەورەترە. دوایە ئێلخانیزادە ماڵاوایی لێ دەخوازێ و هوتێل دەربەند بەجێ دەهێڵێ.

ئێلخانیزادە لە هۆتێل دەربەندەوە دەچێتە ستادی ئەرتەش و چاوی بەڕەزم ئارا دەکەوێ و ڕەزم ئارا ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ لە شوێنێکی دی (نە لە ستادی ئەرتەش و نە لە هۆتێل دەربەند) چاوی بەقازی محەمەد بکەوێ. ئەو شوێنە دوای موافەقەتی قازی محەمەد دیاری دەکرێ. قازی محەمەد و سەدری قازی زیاتر لە دوو سەعات لەگەڵ ڕەزم ئارا دادەنیشن و ڕەزم ئاراش وەکو قەواموسەڵتەنە لە وتووێژەکاندا پای رووسەکان ناهێنێتە گۆڕێ. دوای ئەو دیدارە ڕەزم ئارا بە ئێلخانیزادە دەڵێ، وەدووی جێبەجێکردنی پێشنیاری قەواموسەڵتەنە کەوێ و دیداری کەسایەتییە کوردستانییەکان لەگەڵ قازی محەمەد ڕێک بخا.

لە کوردستانییەکانی دانیشتووی تاران زۆریان چوونە هۆتێلی دەربەند و بەشێوەی خسووسی چاویان بەقازی کەوت، لە سەرووی ئەو جۆرە کەسایەتییانەدا ئاسەفی کوردستانی، حاجی عێزولەمالیکی ئەردەڵان و دوکتور زەنگەنە بوون. فەهیمولمولکیش چەند جار بەشەخسە دیداری لە قازی کرد و ڕۆژێک قازیی بانگ کرد بۆ نانی نیوەڕۆ، و قازی محەمەد لە پارکی ئەمینودەولە کە فەهیمولمولک بەکرێی گرتبوو، نانی لەگەڵ دەخوا و، گۆیا سەر لە ماڵی حاجی عێزولەمالیکیش دەدا لە دێزئاشیب.

وتووێژەکانی کوردستانییەکانی دانیشتووی تاران لەگەڵ قازی محەمەد زیاتر لایەنی دۆستانەی هەبوو و تەنێ ئاسەف و ئەردەڵان و فەهیمولمولک، قازی تێ دەگەیێنن پێڤاژۆ ئەو جۆرە نییە کە ئەو پێی وایە و وەزعی وی لەگەڵ پیشەوەری جیاوازە. پیشەوەری خاوەنی ماڵ و هێلانە و فامیل (لەوان ڕۆژاندا وشەی " فامیل " کە وشەیەکی فەڕانسەییە، لە چاپەمەنی و مەجلیس و هتاد.دا برەوی هەبوو. هەروەها کوتەی هەزار فامیل زۆر بەسەر زارانەوە بوو و زۆر دووپاتە دەکراوە - بژارکار) نییە لە ئازەربایجان، بەڵام قازی خاوەنی بنەماڵەی چوار سەدساڵەیە و کارو پیشەی قەزاوەتی شەرعییە لە مهاباد، جا بۆیە وا سەلاحە بۆ سەرەنجامی کاری خۆی چاوی بە شا بکەوێ و خۆی لەبەر دەست دەوڵەت بنێ و لە هەموو کارەکاندا بە قازانجی دەوڵەتی نێوەندی ئەویش بە نهێنی هەنگاو هەڵهێنێتەوە.

لەو دیدارانەدا قازی محەمەد بەهیچ جۆر ئەو فیکرە قەبووڵ ناکا و تەنها دەڵێ ئەو بە شەخسە پیاوێکی کۆمۆنیست نییە و نێوانیشی لەگەڵ پیشەوەری نییە و مەبەست لە

دامەزراندنی حکوومەتی کوردستان تەنها و تەنها، نارەزایەتی خەڵکە لە حکوومەتی نێوەندی و لێی زیاد دەکا دوو ساڵ لەمەوبەر کاتێک هاتبوومە تارانێ هێشتا رێبەری " کۆمەڵە" (بابم بەدوای ئەم وشەیە لە نێو کەوانەدا دەنووسێ: وشەی کۆمەڵە بەزمانی کوردی بەواتای جەمعییەت و حیزبە)م قبووڵ نەکردبوو، ئەو ساڵە لەگەڵ براکەم سەدری قازی چاومان بە شا کەوت و باسی نارەزایەتیی خەڵکی کوردستان و سرنجنەدانی دەوڵەتی نێوەندیم لەگەڵ کرد، هەرچۆنێک بێ، ئەمن ناتوانم دەست لە خەڵک هەڵگرم و کارێکی کە گەیاندوومانەتە ئێرە، بە نیوەچڵی دەستی لێ هەڵگرم.

کەسایەتییە کوردستانییەکان بە تایبەتی ئاسەف دەبینن قازی محەمەد لە جێدا ئامادە نییە، قسەکانی ئەوان بسەلمێنێ و لە رۆژەکانی دوایی مانەوەی قازی محەمەد لە تاران ئیتر لە دیدار و وتووێژ لەگەڵی خۆ دەپارێزن.

پێوەندییەکانی دوکتور جاوید لەگەڵ قازی محەمەد هەروا بەردەوام بوو. دوکتور جاوید بۆ جێبەجێکردنی کارەکانی ئێستانداریی (ئازەربایجان) لە تاران مابووەوە، زۆربەی رۆژان لە هۆتێلی دەربەند و یان لە ماڵی سەدری قازی کە لە موعێزوسوڵتان هەڵکەوتبوو، نانی نیوەرۆی لەگەڵ قازی محەمەد دەخوارد و وتووێژی سیاسیی لەگەڵ دەکرد. دوکتور جاوید هەر ئەو دەمی کەوتبووە خزمەتی دەوڵەتی نێوەندی و هۆی راستیی ئەوەی دوکتور جاوید دەورێکی دوولایەنەی دەگێرا لە بەر چالاکی و حەولی جۆرج ئالەن باڵوێزی ئەمریکا لە تاران بوو. شەبوستەری و دوکتور جاوید (لە دەقەکەد بەدوای دوکتور جاویددا هاتووە: "کە ئێستا لە شەقامی شاپووری تاراندا مەتەبی هەیە" - بژارکار) ئامادەبوون بەنهێنی داوخوازەکانی دەوڵەتی تاران لە ئازەربایجان پێک بهێنن، بەبێ ئەوەی کە پیشەوەری و هاوکارانی لێی ئاگادار بن.

قازی محەمەد لە سەر یەک بیست رۆژ لە تاران بوو، پێنج جار چاوی بەقەوامولسەڵتەنە و ٣ جار چاوی بەرەزم ئارا کەوت. لەو دیدارانەدا قازی محەمەد، نەیتوانی ئەوجۆرەی کە دەبێ ئاکامێک بەدەست بهێنێ و تەنها کارێکی کە توانیی بیکا، وەرگرتنی حەواڵەی سیگار بوو کە لە بری وی سەد تۆن توتنی سەوزی ئیدارەی دوخانیاتی کە لە بۆکان راگیرابوو، لە سەقز رادەستی کاربەدەستانی دەوڵەتی نێوەندیی کرد".

پێشتر باسی دواین دیداری مەلا مستەفای بارزانیم کرد بەچاوی پڕ لە فرمێسکەوە لەگەڵ قازی محەمەد لە مهاباد لە یەکێک لە شەوەکانی دە رۆژی کۆتایی مانگی سەرماوەزی ساڵی ١٣٢٥ی هەتاویدا. کاری مەلا مستەفا بە هاسانی کۆتایی نەهات.

نێوبراو لەوپەڕی تەڕوتووشی لە وەرزی سەرما و سەهۆڵبەنداندا لەگەڵ عێلی بارزانی بەرەو سندووس و شنۆ چوو. بەدوای بارزانییەکاندا، ئەرتەش لەگەڵ سوارەی مامەش، مەنگوڕ و دێبۆکری وەجووڵە کەوتن. لەو کاتەدا کە مەلا مستەفا لە هەموو ڕوویەکەوە بە تایبەتی خواروبار و پۆشاک لە تەنگانەدا بوو، پێوەندی بەکاربەدەستانی ئەرتەشی ئێرانەوە کرد و پێی ڕاگەیاندن بەتەمای شەڕ نییە لەگەڵ ئەرتەش، تەنێ مۆڵەتی بدرێتێ تا ئەوکاتەی ڕێگا چارەیەک بۆ خۆی و عێل و عەشیرەتی بارزانی دەبینێتەوە لە ئێران بمێنێتەوە. کاربەدەستانی ئەرتەش کە بەهیچ جۆر نەیاندەویست لەگەڵ تاکوتەرای گیانفیدای بارزانیدا شەڕ و تێکهەڵچوون بقەومێ، مەلا مستەفایان لە پێشدا بانگ کرد بۆ مهاباد، دوایە لەگەڵ سەرهەنگێک، ئەو و میرحاج ئەحمەد و مستەفا خۆشناویان نارد بۆ تاران (لە کتێبی "زندگی سیاسی قوام السلطنە"، نووسینی جەعفەری مێهدی نیا، لاپەڕەی ٥٦٣، وێنەی مەلا مستەفا و میرحاج و (مستەفا خۆشناو؟) لەگەڵ سەرهەنگێک کە بەهەڵە بەعقاری ناسێندراوە و غەفاری دروستە، دەبیندرێ. ئەو وێنەیە بەڵێبڕاوی ئی سەفەری زستانی ساڵی ١٣٢٥ی هەتاویی مەلا مستەفایە بۆ تاران- بژارکار) (تێبینیی وەرگێڕی کوردی: مستەفا خۆشناو لەو سەفەرەدا لەگەڵ مەلا مستەفا نەچوو بۆ تاران، بەڵکو ئەوانەی لەگەڵی چوون میرحاج ئەحمەد ئاکرەیی و عیزەت عەبدولعەزیز بوون)، کە لەتاران لەگەڵ کاربەدەستانی کاروباری ئێران وتووێژی پێویستی کرد. مەلا مستەفا لە تاران ماوەیەکی زۆر لە سەربازخانەی "باخی شا" مایەوە. بەو جۆرەی کە لە کتێبی " لە مهابادی خوێناوییەوە تا قەراغەکانی ئاراز"دا نووسراوە لە لایەن ستادی ئەرتەش و کاربەدەستانی لێپرسراو سێ پێشنیاز بە بەڕێزیان کرا کە هەرکامێکیانی پێ باش بێ، قۆڵی لە سەر بکێشێ، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- ئەگەر عێلی بارزان بیەوێ لە ئێران بمێنێتەوە، دەبێ هەموو چەک و جبەخانەی خۆی ڕادەستی دەوڵەت بکا و لە هەرێمی کوردستان دوور بکەوێتەوە و بۆ هەر جێگایەکی دیکەی کە دەوڵەت دیاریی دەکا، کۆچ بکا. دەوڵەت بەڕادەی پێویست زەوی و ئاوی لە موڵکی خالیسەی دەوڵەت لەبەر دەست دەنێ بۆ ئەوەی خەریکی کشتوکاڵ بن و تا ماوەی ٦ مانگ یارمەتیی دەداتێ و ژیان و بەڕێچوون دابین دەکا.

٢- دەوڵەتی ئێران لە نێو تایفە بارزانییەکاندا داڵدەی ئەو کەسانە دەدا لە عێراق حوکم دراون و ڕێگایان پێ دەدا بەدانانی چەکەکانیان لەئێران بمێننەوە و ئەوانیدی دەستبەجێ دەبێ خاکی ئێران بەجێ بهێڵن.

٣- ئەگەر بێتو بارزانییەکان قۆڵ لەسەر ئەم دوو مەرجانەی سەرەوە نەکێشن، دەبێ هەرچی زووترە لە ئێران دەرکەون و بۆ هەرکوێیەکی کە پێیان خۆشە بچن.

مەلا مستەفا گوتبووی سەبارەت بەو مەرجانەی پێشنیاز کراون بە بێ ڕاوێژ و ئاڵوگۆڕی بیروڕا لەگەڵ سەرکردەکانی دیکەی بارزانی، ناتوانێ بڕیار بدا، بۆیە لە مانگی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٥ گەڕاوە بۆ مهاباد (بە پێی نووسینی کتێبی " زندگی سیاسی قوام السلطنە"، لاپەڕەی ٥٣٦، مەلا مستەفا لە (٩)ی مانگی بەفرانباری ساڵی ١٣٢٥ گەڕاوەتەوە مهاباد – بژارکار) و دوایە چووە سندووس بۆ نێو عێل و عەشیرەتی خۆی و پێشنیازی دەوڵەتی لەگەڵ سەرانی عێلی بارزانی هێنایە گۆڕێ. سەرکردەکانی بارزانی لە دوای ئاڵوگۆڕی بیروڕا و ڕاوێژ، خاڵی یەکەم و دووەم بەپەسند نازانن، بەڵام خاڵی سێیەم (واتە دەرکەوتن لە خاکی ئێران) دەپەژرێنن، بەومەرجەی کاربەدەستانی دەوڵەت تا کۆتایی وەرزی زستان و کرانەوەی ڕێگاوبان مۆڵەتیان بدەن و لەو ماوەیەشدا ئازووقە و خواروباریان بۆ دابین بکەن و بیاندەنێ. کاربەدەستانی کاروباری دەوڵەتی ئێران لەگەڵ ئەوەی کە هێندێکیان غەلە و قەند و شەکر دا بە بارزانییەکان، ئامادە نەبوون تا کۆتایی وەرزی زستان مۆڵەتی مانەوەیان بدەن و پێکێشییان لێ کردن هەرچی زووتر دەبێ خاکی ئێران چۆل بکەن و چونکو لە وەرزی زستان و زۆریی بەفر و سەرمای هەوا و نەبوونی هیچ جۆرە وەسیلەیەکی گواستنەوە نەیانتوانی خاکی ئێران چۆل بکەن، بۆیە شەڕی نێوان بارزانییەکان و هێزە دەوڵەتییەکان دەستی پێ کرد و هێزە دەوڵەتییەکان بەژمارەیەکی زۆرەوە و بە تانک و تۆپ و فڕۆکە لەگەڵ عەشیرەتەکانی مەنگوڕ و مامەش و دێبوکری و پاشان هەرکی و شکاک پەلاماری بارزانییەکانیان دا. بارزانییەکان لە هەلومەرجی سەختی زستان و سەرما و بێ هیچ جۆرە وەسیلەیەکی ژیان بە ئازایەتی و سەرسەختییەکی سەیر کە کەمتر نموونەی دیتراوە، بەدەم پاشەکشەوە بەرەو سنووری عێراق تا کۆتاییەکانی مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاویی درێژەیان بەشەڕ دا. بارزانییەکان لە سەر سنوور پێوەندییان بەکاربەدەستانی عێراقەوە کرد.

کاربەدەستانی عێراق قۆڵیان لەسەر هاتنەوەی بێ قەید و شەرتی ئەوان بۆ نێو خاکی عێراق کێشا، تەنێ بەمەرجی ڕادەستکردنەوەی چەکەکانیان، لە ئاکامدا شێخ ئەحمەد و براکانی شێخ بابۆ و شێخ محەمەد سەدیق لەگەڵ ژن و منداڵی بارزانییەکان لە مانگی خاکەلێوەی ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی خۆیان ڕادەستی دەوڵەتی عێراق کرد، بەڵام مەلا مستەفا خۆی لەگەڵ چوارسەد کەس لە تاکوتەرای کارامەی بارزانی دەستی لە خۆ

ڕادەسـتکردنەوە پاراست و بەرەو ناوچەی بارزان چوو، بەڵام نەیانهـێشت لە ناوچەی نێوبراو بمێنێتەوە و دامەزرێ بۆیە دیسان لەگەڵ پێشمەرگەکانی هاتەوە بۆ نێو خاکی ئێران. مەلا مستەفا لە ئێران لەگەڵ خۆڕاگری هێزە ئێرانییەکان بەرەو ڕوو بوو، بە ناچار بەرەو خاکی ترکییە چوو و لەبەرئەوەی ترکییەش تەمای ڕاوەدوو نان و گرتنی ئەوی گرت، دیسان هاتەوە نێو خاکی ئێران و دوای زنجیرەیەک تێکهەڵچوونی دووبارەی خوێناوی لەگەڵ هێزە دەوڵەتییەکان، لە مانگی پووشپەڕی ساڵی ١٣٢٦ بارزانییەکان خۆیان گەیاندە چۆمی ئاراز، چەکیان دانا و لەو چۆمە پەڕینەوە و لە خاکی شوورەوی بوون بە پەنابەر.

وردە ڕیشاڵی شەڕەکانی بارزانییەکان لەگەڵ هێزی عەسکەریی ئێران، لە کتێبی " لە مهابادی خوێناوییەوە تا قەراغەکانی ئاراز" بە قەڵەمی نەجەفقولیی پێسیان، هەواڵنووسی ڕۆژنامەی " ئیتیلاعات" بەدووروردرێژی نووسراوە.

هەڵبەت کاری بارزانییەکان بە چوونیان بۆ خاکی شوورەوی کۆتایی نەهات، بەڵکو ئەو خەڵکە گیانفیدایە دوای بەساڵان دەربەدەری و چێشتنی ئازار و بێبەشی لە غەریبایەتی، دواجار لە ساڵی... (بابم ئەو ڕەقەمەی نەنووسیوە و جێگاکەی بە سپی هێشتووەتەوە و ئەوە بەڕواڵەت پایزی ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی هەتاوییە کە بەرانبەری ١٩٥٨ی زایینییە – بژارکار) گەڕانەوە خاکی عێراق و بەکورتییەکەی ئاوایە:

لە هاوینی ساڵی ١٩٥٨ی زایینی (کودێتای بەنێوبانگی عەبدولکەریم قاسم لە کۆتایەکانی مانگی جۆزەردانی ساڵی ١٣٣٧ی کۆچی هەتاوی کرا، بژارکار) سەرتیپ عەبدولکەریم قاسم، یەکێک لە ئەفسەرانی عێراقی، بە دژی حکوومەتی ئەو دەمی عێراق کودەتای کرد و مەلیک فەیسەڵ پاشای عێراق و عەبدولئیلاە ولیعەهدەکەی و نووری سەعید سەرۆک وەزیری بە دەستەڵات و بەنێوبانگی عێراقی کوشت و جڵەوی کاروباری بەدەستەوەگرت. مەلا مستەفا بەتێلێگراف پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەی لە عەبدولکەریم قاسم کرد. عەبدولکەریم قاسم لە وڵامدا سپاسی لێ کرد و داوای لە مەلا مستەفا کرد لەگەڵ بارزانییەکانی دانیشتووی شوورەوی بگەڕێتەوە عێراق. مەلا مستەفا لەگەڵ تاکوتەرای بارزانی بەکەشتیی ڕووسی هاتنەوە عێراق (تێبینیی وەرگێڕی کوردی مەلا مستەفا خۆی و چەند کەسی تر دوای دیدار لەگەڵ جەماڵ عەبدولناسر لە میسر بەفڕۆکە هاتنەوە عێراق) و سەرتیپ عەبدولکەریم قاسم ڕێز و حورمەتێکی زۆری لێ نا.

بارزانییەکان لە کودەتای مووسڵدا کە بەدژی حکوومەتی سەرتیپ عەبدولکەریم قاسم بەڕێبەریی سەرهەنگ شەواف ڕێک خرابوو، خزمەتی شیاوی سرنجیان بەحکوومەتی

عەبدولکەریم قاسم کرد و کودەتای مووسڵیان تێک شکاند و هەروەها شێخ ڕەشیدیشیان کە دوژمنی بارزانییەکان و لە هەمان کاتدا دژبەری ڕێژیمی عەبدولکەریم قاسم بوو لەگەڵ شێخە عێراقییەکانی دی ناچار بە دەرکەوتن لەو وڵاتە کرد. شێخ ڕەشید و شێخە غەوارەکانی دیکەی عێراقی و ئاغاوەتی پژدەر کە دژی دابەشکردنی زەویوزار و موڵک لە عێراق و دژی ڕێژیمی عەبدولکەریم قاسم بوون، لە عێراق ڕایان کرد و بوون بەپەنابەری دەوڵەتی ئێران. ئەوانە ئێستا لە خاکی ئێراندان.

بەڵام دۆستایەتیی عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفا زۆری نەخایاند و بوو بەدوژمنایەتی و ئەو دوژمنایەتییە لە ڕاستیدا شکان و نابوودی هەر دوولای بەدوودا هات (بڕوانە: شیکردنەوەکانی کۆتایی ئەم کتێبە، ژمارەی ۱۳,) سەرئەنجام عەبدولکەریم قاسم لەشکرکێشیی کردە سەر بارزانییەکان، بارزانییەکان بە توندی خۆڕاگرییان کرد، شەڕ و تێکهەڵچوونی خوێناوی لە نێوانیاندا قەوما. پاش ماوەیەک عەبدولسەلام عارف کە سەردەمایەک لە دۆستان و هاوکارانی نزیکی عەبدولکەریم قاسم بوو، بە دژی عەبدولکەریم ڕاپەڕی و لە کودەتایەکدا عەبدولکەریم قاسمی کوشت. عەبدولسەلام عارفیش بۆ ماوەیەکی درێژ دژی بارزانییەکان شەڕی کرد، تەنانەت داوای هێزی میسر و سووریەشی کرد بە هانای ئەرتەشی عێراقەوە بێن و ئەوانیش دژی بارزانییەکان شەڕیان کرد. لەگەڵ ئەوەشدا نەیانتوانی هیچ بکەن. لە دوای مەرگی عەبدولسەلام عارف لە بەر بەربوونەوەی هێلیکۆپتێر، برایەکەی جێی ئەوی گرتەوە و بوو بە سەرۆک کۆماری عێراق، ئەویش وەک پێشوو درێژەی دا بە شەڕ بەدژی کوردە بارزانییەکان، بەڵام چی پێ نەکرا و ناچار ڕێگای هێمنایەتی و ئاشتیی وەبەر گرت و هێندێک سۆز و بەڵێنیشی دا بە کوردەکان، سەبارەت بەخۆموختاری لە چوارچێوەی عێراقدا و تەنانەت پەیماننامەیەکی ئاشتیشی لەگەڵ کوردەکان واژۆ کرد.

**سەرچاوە**: ڕۆژنامەی ئیتیلاعات ژمارەی ۱۲۰۱۵ بەرواری ۹ – ٤ – ۱۳٤٥).

١- مزگەوتی جامیعی مهاباد (مزگەوتی سوور) بداغ سوڵتان دروستی کردووە، دوایە یەکێک لە کورەکانی بەنێوی سۆهراب (زۆراب) خان لە ساڵی ١٠٨٩ی کۆچی مانگی دەستی تێ داوە و تەواوی کردووە.

لەوحەیەکی بەرد هەر بەخەتی ئەو زۆراب خانە سەبارەت بە تەعمیرکردنی مزگەوتەکە ئێستاش ماوە و لە سەر دەرگەی مزگەوتەکە گیراوە. ئەو لەوحەیە بە خەتێکی زۆر خۆش نووسراوەتەوە. ئەو تەعمیر و دەست تێدانە لە سەردەمی شا سلیمانی سەفەوی کراوە.

کاک ئەحمەدی قازی لە پەراوێزی ئەم پەراوێزەدا نووسیویە:

" جگە لە "مزگەوتی سوور" پردێکیش بەنێوی " پردی سوور" هەیە هۆی ئەوەی ئەو جێیانە نێویان لێ نراوە "سوور" ئەوەیە لەو سەردەمیدا ساوجبولاغی موکری (مهابادی ئێستا) قەسەبەیەکی بچووک بووە و زۆربەی خانووەکانی لە گڵ بوون و خانووی لە خشت یان لە بەرد دروستکراو نەبووە و لەبەرئەوەی ئەو دوو بینایە (مزگەوت و پرد) لە خشتی پێژراو دروست کراون بە" مزگەوتی سوور " و " پردی سوور" نێوبانگییان دەرکرد، با ئەمەش بڵێین لە شێوەزاری مهابادیدا هێشتا بەئاجۆر (کەرپووچ) دەڵێن، (خشتی سوور).

٢- میرزا ئەحمەد زۆر لە پێش سەردەمی بداغ خانی موکریدا ژیاوە. بابی بداغ خان، واتە شێخاڵی خان هاوچەرخی میرزا ئەحمەدی قازی نەبووە چ دەگا بە بداغ خان خۆی کە لە ساڵی ١٢٣١ی کۆچی مانگیدا زیندوو بووە و مۆری بەوەقفنامەی میرزا عەبدوڵای قازییەوە ناوە، میرزا عەبدوڵا کوڕی میرزا مەحموودی خۆشنووسی سابلاغی کوڕی حاجی عوسمان کوڕی هەر ئەو میرزا ئەحمەدی قازییە بووە.

بداغ خانی موکری، کوڕی شێخاڵی خان، کوڕی مووسا سوڵتان، کوڕی بداغ سوڵتان و بابی عەبدوڵا خانی (موکری یە). محەمەد قوڵی خانی بەگلەربەگی حاکمی ورمێ، بداغ خانی بانگهێشتن کرد بۆ ورمێ و لەوێ دە بەندیخانەی کرد، دوایە چاوی کوێر کرد. بداغ خان لە ساڵی ١٢٣٨ی کۆچی مانگی مردووە. بڕاونە: "مهاباد دیروز و امروز، بڵاوکەرەوە شارداریی مهاباد، مانگی خەرمانانی ١٣٥١ی هەتاوی، لاپەڕەی ٩.

٣- مەولانا خالید لە ساڵی ١٢٤٢ی کۆچی مانگی کۆچی دواییی کردووە. بڕواننە: " دیوان فارسی و کردی حضرت مولانا خالد نقشبندی، لە بڵاوکراوەکانی حاجی مەحموودی

محەمەدیی سنەیی و هەروەها " ژیناوەری زانایانی کورد..." نووسینی محەمەد ساڵحی ئیبراهیمی، لاپەڕەی ٢٨ و، هەروەها (تاریخ مشاهیر کرد) دانانی بابا مەردووخی کوردستانی، لاپەڕەی ٢٩٦، بەرگی یەکەم."

بەڵام باشترین سەرچاوەی تێر و تەسەل سەبارەت بەمەولانا خالید، بەرگی یەکەمی " یادی مەردان"، نووسینی (مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس)ە کە بەداخەوە نووسەر (بژارکار) ئەو کتێبەی نییە.

٤- مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە ساڵی ١٢٢٤ی کۆچی مانگی چووەتە خانەقای شاعەبدوڵڵای دێهلەوی.

(تاریخ مشاهیر کرد، بەرگی یەکەم، ل ٣٠٢). حەوت ساڵ دواتر، واتە لە ساڵی ١٢٣١ میرزا عەبدوڵای قازی وەقفنامەی خۆی دەنووسێ و بەشێک لە ملکەکانی وەقفی ئەولادی کوڕی لە حوورجەهان خانم کچی مەحموود بەگ (کوڕی شێخاڵی خان حاکمی موکری) کردووە، بەو پێیە لە نزیکەی ساڵی ١٢٢٤دا گەنج بوونی میرزاعەبدوڵای قازی بەدوور دەزاندرێ.

٥- دەستنووسێک کە بەرواری ڕۆژی (٣) مانگی ڕەبیعولسانی ساڵی ١٢٧٧ی کۆچی مانگی پێوەیە لە نێو کاغەزەکانی بابم دابوو کە ئێستا لە لای نووسەرە وادەردەکەوێ ئەو بەڵگەیە لە ساوجبولاغی موکری نەنووسرابێ (یان ئەگەریش لە ساوجبولاغ نووسرابێ، وێ دەچێ ئەو کەسانەی مۆریان پێوە ناوە خۆجێیی نەبوون و کارگوزاری حکوومەت بووبن). ئەو بەڵگەیە دەیسەلمێنێ لە بەرواری زیقەعدەلحەرامی ساڵی ١٢٥٤ی کۆچی مانگی میرزا عەبدوڵای قازی هێندێک لە ملک و باخ و کەرێزە و هەموو خانووی جێی دانیشتنی خۆی بەمافوورە و کەلوپەلی ماڵێوە ڕاگوێستووە بۆ دوو کوڕی خۆی، میرزا عەبدولڕەحمانی قازی و حاجی میرزا عەبدوڕەحیم. عەینی بەڵگەکە ئاوایە:

در تاریخ /شهر ذیقعده الحرام سنهء ١٢٥٤ کە عالیجناب اشرف الحاج و العمار حاجی میرزا عبدالله ساوجبلاغی انتقال نامچهء معتبره کە بەخط ومهر خودش و مختوم بەخاتم سایر علماء اعلام و معارفین اهالی آن ولاها به دو نفر فرزند خود و هما عالیجنابان فضائل وکمالات اکتسابان میرزا عبدالرحمن قازی و حاجی میرزا عبدالرحیم بعضی از املاک و باغات و قنات و تمامی عمارت نشیمن خود با فرش و

اثاث البیت و غیر ذلک به موجب همان انتقال نامچهء مزبوره معتبره به عنوان انتقال منتقل کرده است و داعی هم بعداز صدور اقرار از ناقل مزبور صراحه مهر نمودەام. صحیح و معتبر و لازم الاتباع است و به موجب همان انتقال نامچهء معتبره مختومه بەخاتم داعی و سایر علماء اعلام و معارفین آن ولاها تمامی اعیان مستغلات مسطورات در آن انتقال نامچه مال خاص و ملک طلق عالیجنابان مزبوران منقول الیهما است و احدی را از سایر اولاد حاجی میرزا عبدالله مرحوم نمی رسد که در خصوص آنها از میرزا عبدالرحمن قاضی و حاجی میرزا عبدالرحیم منقول الیهما بدون مسوغ شرعی به مقام ادعا و گفتگو برآیند که مراتب مسطوره بەاقرار خود ناذر مزبور به داعی مشخص و محقق است و شک و شبەدر وقوع و تحقق آن ندارد.

فی سیم شهر ربیع الثانی من شهر هزار و دویست و هفتاد و هفت هجری (١٢٧٧)

حرره الداعی. مهر: علی اصغر الحسنی الحسینی

(و هو خبیر التعالی)

بەنحوی که عالیجناب معارف مآب اشرف الحاج حاجی میرزا عبدالله ساوجبلاغی به موجب انتقال نامهء علیحدهء معتبره اقرار صریح و اعتراف صحیح بەانتقال املاک و اعیان مرقومه نموده بەولدین ارشدین خود و هما عالیجناب فضائل مآب و عوارف الکتاب میرزاعبدالحمن قاضی و اشرف الحاج حاجی میرزا عبدالرحیم باید به موجب آن عمل نمایند و کسی بدون مسوغ شرعی دخالت ننمایند (ئەو وشەیەی دوایە کەوتووەتە بن مۆرکە) تحریرا فی ٥

شهر ربیع الثانی ١٢٧٧ مهر:

الواثق بالله الغنی محمد حسین الحسنی الحسینی. چوار مۆری کە لە پەراوێزی ئەم نووسراوەیەدا هەن، لە لای ڕاستی مۆری پێشوون، بەڕیز لە سەرەوەڕا بۆ خوارێ بریتین لە:

١- عبده محمد شفیع الحسنی الحسینی

٢- محمد صادق الحسنی الحسینی

٣- الواثق بالله عبده غفار الحسنی الحسینی

٤- الواثق بالله اللطیف عبده محسن الشریف

به قراری که قلمی و مرقوم فرمودەاند صحیح است. مهر: محمد تقی الحسینی

الجهانشاهی. بەقراری کە مرقوم فرمودەاند، صحیح و لازم الاتباع است. مهر: الله محمد علی الواثق بالغنی محمد بن میرزا.

بەقراری کە جناب مستطاب قدوس مآب حجه الاسلام و المسلمین ملجا الانام سرکار ولی نعم آقائی سلمه الله تعالی مرقوم و مزین فرمودەاند، لازم الاتباع است و کس دیگر بدون مسوغ شرعی به املاک مرقومەء متن نمی تواند مداخله نماید.حرره الداعی لدوام دوله القاهره الباهره. مهر: الواثق بالله الغنی ابوالقاسم الحسنی الحسینی.

(لە بەرواری مانگی ذیقعده الحرامی ساڵی ١٢٥٤ کە جەنابی بەرز، گەورەی حاجیان و بە تەمەنان حاجی میرزا عەبدوڵای ساوجبولاغی ڕاگوستننامەیەکی بە بڕی بەخەت و ئیمزای خۆی کە لەلایەن عالمەکانی ناسراو و ماقووڵانی ئەو شوێنانە بەدوو کوڕی خۆی داوە کە بریتی بن لە ڕێزدارانی زانا و کەماڵات وەرگرتوو میرزا عەبدوڕەحمانی قازی و حاجی میرزا عەبدوڕەحیم. هێندێک ملک و باخ و کەرێزە و گشت خانووی تێدا دادەنیشێ بەگشت مافوورە و کەلوپەلی ماڵ و وەکو تر هەر بەپێی ڕاگوێستنامەی نێوبراوی بە بڕ بۆ ئەوانی ڕاگوێستووە و دۆعاگۆش دوای دەرچوونی قەرار لە لایەن گوێزەرەوەی نێوبراو بە ئاشکرای مۆرم کردووە. ئەوە دروست و بەبڕ و پێویستە ڕەچاو بکرێ هەر بەپێی هەمان ڕاگوێستنامەی بەبڕی ئیمزاکراو بەمۆری دۆعاگۆ و عالمەکانی ناسراو و ماقووڵانی ئەو شوێنانە گشت ئەعیانی موستەغەلاتی کە لە ڕاگوێستننامەکەدا باسیان لێوە کراوە ماڵی تایبەتی و ملکی ڕەهای ئەو شوێنبەرزانەیە کە گوێزراوەتەوە بۆ ئەوان و بەکەسی دیکە لە ئەولادی دیکەی حاجی میرزا عەبدوڵای خودالێخۆشبوو ناگا کە ڕاگوێزراوە بۆ میرزا عەبدوڕەحمانی قازی و حاجی میرزا عەبدوڕەحیم بە بێ بیستراوەی شەرعی نابێ ئیددیعایان لێ بکرێ کە ئەو شتانەی نووسراون، بەئیقراری نەزرکەری نێوبراو بۆ دۆعاگۆ ڕوون و ئاشکرایە و چ شک و گومانێکم لە هەبوون و ڕاستی وی نییە.

لە سییەمی مانگی ڕەبیعولسانی لە مانگەکانی هەزار و دووسەد و حەفتاو حەوتی کۆچی دۆعاگۆ نووسی. مۆر

عەلی ئەسغەر ئەلحەسەنی ئەلحوسەینی)

(هەر ئەوە ئاگاداری بەرز)

بەو شێوەیەی کە جەنابی پایەبەرزی زانای گەورەترین ئەلحاج حاجی میرزا عەبدوڵای

ساوجبولاغی بەپێی ڕاگوێستننامەی جیاوازی بەبڕ بەقەراری دروست و پێلێنانی دروست ئەو ملک و ئەعیانیانەی نووسیویە ڕای گوێستووە بۆ منداڵە گەورەکانی کە بریتین لە پایەبەرزانی فەزل و ناسێنەرانی کتێب، میرزا عەبدولڕەحمانی قازی و گەورەترین حاجیان حاجی میرزا عەبدوڕەحیم دەبێ بەپێی وی ببزوونەوە و هیچ کەس بە بێ حوکمی شەرع دەست تێ وەرنەدا (ئەم وشەیە کەوتووەتە بن مۆرەکە)، نووسرا لە ٥ی مانگی ڕەبیعولسانی ١٢٧٧ مۆر:

ئەلواسیقوبیلا محەمەد حوسێن ئەلحەسەنی ئەلحوسەینی.

٦- بابم سەبارەت بە حاجی شێخ جەلال هیچی نەنووسیوە. حاجی شێخ جەلال باپیری خوداڵێخۆشبوو محەمەدی قازی (وەرگێڕی بەنێوبانگ)ە. حاجی شێخ جەلال کوڕی میرزا ئەحمەدی قازی کوڕی میرزا قاسم کوڕی میرزا مەحموودی قازیی ساوجبولاغییە.

حاجی شێخ جەلال چەندین برای هەبووە کە بەنێوبانگترینیان شەهید میرزا فەتاحی قازییە. حاجی شێخ جەلال سێ کوڕی، بووە بە ناوی میرزا جەواد و شێخ ئەحمەد و عەبدولخالق (ئیمام جومعە). میرزا جەواد (دواتر دوکتور جەوادی قازی) منداڵی نەبووە. شێخ ئەحمەد تەنها کوڕێکی هەیە بەنێوی کاک حەسەنی سریلاوا کە خۆشبەختانە ئێستاش دەژی. خوداڵێخۆشبوو محەمەدی قازی کوڕی عەبدولخالق بوو.

محەمەدی قازی لە ساڵی ١٢٩٢ی هەتاوی لە مهاباد چاوی بەدنیا پشکووت و لە بەرەبەیانی ڕۆژی چوارشەمۆ ٢٤/ ١٠ / ١٣٧٦ی هەتاوی لە تەمەنی ٨٥ ساڵیدا ماڵاوایی لە ژیان کرد. بەپێی وەسیەتێکی کە کردبووی ڕۆژی ٢٨ / ٧٦/١٠ لە گۆڕستانی بداغ سوڵتان لە مهاباد بەتەنیشت هەژار، هێمن، مەلا غەفووری دەبباخی و خاڵە مین لە ڕێورەسمێکی بەشکۆدا نێژراوە. (بە گێرانەوە لە کتێبی " نگاهی بەتاریخ مهاباد" بەقەڵەمی ئاغای سەید محەمەدی سەمەدی، لاپەڕەی ٣٢٩).

خوداڵێخۆشبوو میرزا برایمی ئەفخەمی (لە لە بەرواری سێشەمۆ ١٨ / ١١ / ٧٣ لە بۆکان کۆچی دوایی کردووە) لە کتێبی " تاریخ فرهنگ و ادب موکریان "، لاپەڕەی ٢٠٧، دا بەدوور و درێژی شەرحی حاڵی محەمەدی قازی باس کردووە.

سەبارەت بەمحەمەدی قازی لە سەردەمی ژیانی و بەتایبەتی لە دوای مردنی بابەتی زۆر لە ڕۆژنامەاندا بڵاو بوونەوە و ڕێز لە پلەی زانستیی بەرێزیان گیرا. جگە لە "

خاطرات یک مترجم " (بیرەوەرییەکانی وەرگێڕێک)، کە محەمەدی قازی خۆی نووسیویە، کتێبی " محمد قاضی کیست و چه کرد " (محەمەدی قازی کێیە و چی کرد) سەبارەت بەو خودالێخۆشبووە شوێنەوارێکی زۆر تێر و تەسەلە. ئەو کتێبەی دوایی بەقەڵەمی ئاغای سەید عەلی ساڵحی نووسراوە و لە بەهاری ساڵی ١٣٦٨دا لە تاران چاپ بووە.

٧- ڕەحیم ئاغای سەیفی قازی (دوکتور ڕەحیمی قازی) تا کۆتایی ژیانی لە شوورەوی مایەوە و لە دوای مردنی لە وێ نێژراوە. ڕێکەوتی تەواوی کۆچی دوایی ڕەحیم ئاغا نازانم (تێبینیی وەرگێڕی کوردی: دوکتور ڕەحیمی قازی نووسەری یەکەم ڕۆمان بەکوردیی سۆرانی: " پێشمەرگە" لە ڕێکەوتی ٩ی مانگی مەی ١٩٩١ لە شاری باکۆ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانێکی ئەو شارە بەنێوی "یاسامال" نێژراوە)، بەڵام ڕۆژی یەکشەمۆ ٢٢/ ٢/٧٠ لە شاری مهاباد مەجلیسی پرسە و سەرەخۆشی بۆ دانرا. ڕەحیم ئاغا لە یەکێک لە بوارەکانی زانستە ئینسانییەکاندا توانی لە شوورەوی پلەی دوکتورا وەربگرێ، لە دوای شۆڕشی ئێران و دوای ڕۆیشتنی شا بۆ ماوەیەک هاتەوە ئێران و دیسان گەڕایەوە لای خێزان و منداڵەکانی لە شوورەوی (لە شوورەوی بۆ جاری دووەم ژیانی هاوسەریی پێک هێنا بوو). ڕۆژگار دەرفەتی نەدا بەخودالێخۆشبوو ڕەحیم ئاغا و کچی خودالێخۆشبوو سەدرولئیسلام سەرەڕای ئەو هەموو تەشریفات و مەسرەفی داوەتە بۆ ماوەیەکی درێژ بەیەکەوە بژین. فاعتبروا یا اولی الالباب.

٨- ئاغای مستەفا خانی مەلیک زادە، دانیشتووی تەورێز (کوڕی حەسەن ئاغای مەلیک زادە) ڕۆژی شەمۆ ٨ / ٦ / ٧٦ پێی ڕاگەیاندم خودالێخۆشبوو خاڵ ئۆغڵی نێوی حاجی محەمەد ئیبراهیم و سێ کوڕی هەبووە، بەپێی ڕیزی تەمەن بەنێوی عەلی ئاغا، ئیسماعیل ئاغا و حەسەن ئاغا. کاکە سوار وەکو میوان دەچێتە "بەرەجۆ" ماڵی عەلی ئاغا. ئەسپی عەلی ئاغا بۆ ئیسماعیل ئاغا دەنێرێ کە لە " بەیرەم " بووە هەرچۆنێک بێ بۆ "بەرەجۆ"، نێوبراو لە " بەیرەم" هەست پێ دەکا پیلانێک لە گۆڕێ دایە و هەر لەوێ لەگەڵ سوارەکانی کاکە سوار شەڕ دەکا و دەکوژرێ. لەو شەڕەدا یەک دوو کەسیش لە سوارەی کاکە سوار دەکوژرێن. ئەو ڕووداوە بەڕواڵەت بەر لە کوژرانی عەلی ئاغا بەدەستی کاکە سوار بووە. ئیبراهیم خان کە ئێستا دەژی، کوڕی عەلی ئاغایە و ئێستا لە موڵکی خۆی کە باسیان لێوە کرا خەریکی کشتوکاڵە. ئیسماعیل خان ژن و

منداڵی نەبووە. بە قسەی مستەفا خان ئەوانە هیچ خزمایەتییەکیان نییە لەگەڵ مەلیک زادەی فەرماندەی هەنگی مهاباد لە زەمانی سمایل ئاغای شکاکدا.

٩- وەک لێم کۆڵیوەتەوە خودالێخۆشبوو قازی شێخ محەمەد موحسینی موکری، کوڕی شێخ محەمەدی موکرییە. هەمان شێخ محەمەدی موکری کە عەزیز خانی سەردار لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٨٠ی کۆچی مانگیدا نامەی لێ نووسیوە. بڕوانە: بڵاوکراوەی (دانشکدهء ادبیات تبریز)، بەهار و هاوینی ١٣٧١، ل ١٤٨، و هەروەها " تاریخ و ادب موکریان" نووسینی خودالێخۆشبوو میرزا ئیبراهیمی ئەفخەمی، ل ٣٥٦.

ئاغای حاجی سمایل ئاغای ئێلخانیزادە (کوڕی خودالێخۆشبوو مەحموود ئاغا) لە وڵامی نامەی مندا سەبارەت بەشێخ محەمەدی موکری ئاوایان نووسیوە:

ئەوەی کە چەند ساڵ لەمەوبەر بەنووسراو پرسیارێکتان لەم موخلیسە کردبوو سەبارەت بەشێخ محەمەدی موکری کە عەزیزخانی سەرداری موکری نامەیەکی بۆ بەڕێزیان نووسیوە، ئەو دەمی هەرچەند حەولم دا ناسێنەی نێوەکەم بۆ ڕوون نەبووەوە، بەڵام لەو دواییانە بۆم دەرکەوت. بەڕێزیان بابی خودالێخۆشبوو قازی شێخ موحسین بووە و کەسێکی زۆر زانا و لە شاگردە هەڵکەوتووەکانی خودالێخۆشبوو مەلا عەلی قزڵجی بووە و زاواشی بووە و لە دێی شاریکەند لە دوو فرسەخیی بۆکان ژیاوە و هەر لەوێش ئەمری خودای کردووە و مەزارەکەی لەوێ ماوەتەوە.

ڕێکەوتی نامە: ٣/٢٢ / ٧٥ی هەتاوی

١٠- ئاغای باپیرئاغای قادریی سۆفیانیی مامەش دەیگوت لەو ڕووداوەدا حەوت ئاغا و حەوت نۆکەر کوژراون و نێوی ئاغا کوژراوەکانی ئاوا باس کرد: حوسێنی حەمەد ئاغا و دوو کوڕی بەنێوی سولەیمان و سوارە، برایم کوڕی قەرەنی ئاغا، هەباس کوڕی مام عەزیزی قەرەنی ئاغا، ئەحمەد کوڕی هەباس کوڕی حەمەد ئاغا، هەمزە کوڕی عەبدوڵا کوڕی مام عەزیز کوڕی گوڵاویاغا.

دەبێ ئاماژەی پێ بکرێ لە نێو عەشیرەتەکاندا پێشبینیی بارودۆخی هێمنی بە نیشانەی ترس و بەدوور لە ئازایەتی و جوامێری دەزانن و لە لایەکی دیکەوە مامەشەکان پێشبینیی مەترسییەکی ئاوایان نەدەکرد، بۆیە نەخۆیان ئامادە کردبوو بۆ ڕادەستکردنی چەک و نە بۆ دەستکردنەوە و بەرگری، بۆیە ئەو کارەساتە خوێناوییە قەوما.

ئەو ڕووداوە دڵتاوێنە لە گۆوڕای (گزینگ)یش (چاپی سوێد) ژمارەی ٦، ل ١٦، زستانی ١٣٧٣دا بەنێوی "ڕووداوێکی تاسەبار" باسی لێوە کراوە.

١١- حاجی میناخانم، هاوسەری خوداڵیخۆشبوو قازی محەمەد، ڕۆژی چوارشەمۆ ٢٩ی مانگی ڕێبەندانی ١٣٧٦ کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی بداغ سوڵتان بەخاک ئەسپێردرا. بەداخەوە ڕۆژێک دواتر ڕووداوی دڵتاوێنی مەرگی کاک جەعفەری قازی کوڕی کاکە ڕەحمانی قازی قەوما. نێوبراو و هاوکارانی کە لە پرسەی حاجی میناخانمەوە دەگەڕانەوە ورمێ، سەری شەوێ لە نزیک ورمێ ماشێنەکەیان وەرگەڕا لە ئاکامدا جەعفەری قازی و مارفی ئاغایی گیانیان لە دەست دا. تەرمی هەر دووکیان ڕۆژی جومعە (١)ی مانگی ڕەشەمەی ١٣٧٦ لە گۆڕستانی بداغ سوڵتان لە نێو خەم و پەژارەی زۆری خەڵکدا بەخاک ئەسپێردران.

دواتر هاوکارێکی دیکەیان سەرتیپی مەنسووری کە لە ڕووداوەکەدا بریندار بووبوو، لەگەڵ کاروانی هاوڕێیانی کەوت و سەری نایەوە. گۆواری " سروە" یادی هاوکارانی لە دەستچووی بەرز ڕاگرت و بڵاوکراوەکانی دیکەش خەم و پەژارەی خۆیان بەو بۆنەیەوە دەربڕی. سروەی ژمارە ١٤٢ (بانەمەڕی ١٣٧٧) دیسان یادی هاوکارانی خۆی کردەوە، وێنەی هەر سێکیانی بەپەراوێزی زۆر جوانەوە لەسەر بەرگی گۆوارەکە بڵاو کردەوە و نووسی:

" گوڵەکانی سروە، نامرن ئێوە لە دڵی میللەتا ئەژین "

١٢- ڕۆژنامەنووسەکە ئاغای ئێلخانیزادەی بەتەواوی نەناساندووە. بابم لەم دەفتەرەدا دواتر نێوبراو ئاوا دەناسێنێ:

مەبەست عەبدولائاغای ئێلخانیزادە کوڕی مەحموود ئاغای ئێلخانیزادەی دێبۆکری ئاغای حەمامیانە.

بەو جۆرەی کە فاتمەخانمی تورجانی مودەریس (کچی خوداڵیخۆشبوو مامۆستا ئەحمەدی تورجانیزادە) باسی کرد، عەبدولاغای ئێلخانیزادە لە (١٠)ی مانگی جۆزەردانی ١٣٧٤ کۆچی دوایی کردووە و لە دێی حەمامیانی بۆکان بەخاک ئەسپێردراوە.

١٣- لێرەوە، هەڵبەت بەفیتی ئیستیکباری جیهانی، پای شای ئێران بۆ لایەنگری ڕواڵەتی

له مەلا مستەفای بارزانی، زیاتر کێشرا نێو کاروباری عێراق و بوو بەهۆی ئەوە لەوێ له لایەکەوە حکوومەتی بەعسی بێتە سەر کار و له لایەکی ترەوە تانوپۆی کوردی مەزلوومی عێراقی بەکوشتوبڕ و ئاوارەکردنیان و کاولکردنی گوندەکانیان لەبەریەک هەڵبپسێ.

بابم پاشماوەی دەفتەرەکەی خۆی له بابەتی بێ بنەما و بێ ئەساس کە ئەوانی بەدروست زانیوە و نرخی مێژوویی بۆ داناون ئاخنیوە و کۆتاییشی هێناوە بەنووسین لەسەر بنەماڵەی قازی. ئێمەش لێرەدا کاری ئەم کتێبە دەگەیێنینە دوایی و دووپاتەکردنەوەی بابەتەکانی چاپەمەنی ئەوان ساڵان جگە له بەفیڕۆدانی کات و کاغەز و مەرەکەب... نەبێ چ کەڵکی نییە.

# پاشکۆی ۱

دوو نووسراوە و چەند ئاگادارییی نەمر خەلیلی فەتاحی قازی لە ڕۆژنامەی "کوردستان "ی سەردەمی کۆماردا

ئەمر خەلیلی فەتاحی قازی لە سەردەمی کۆماری کوردستاندا سەرۆکی ئیدارەی دوخانیەی مهاباد و معاوینی ئیداری ئیقتیسادیی کوردستان بوو. ئەگەرچی لەم کتێبەدا ڕاستەوڕاست باسی پلەوپایەی خۆی لە سەردەمی دەستەڵاتی حکوومەتی کوردستاندا ناکا، بەڵام لە نێوەرۆکی نووسینی سەبارەت بەو سەروبەندە جوان دەردەکەوێ لە نزیکەوە ئاگای لە ڕووداوەکان بووە و بەشداریی تێدا کردوون.

لێرەدا ئەو دوو نووسراوە و ئاگادارییەکان دەکەینە پاشکۆی یەکەمی ئەم وەرگێرانە کوردییە و لە ڕۆژنامەی کوردستانەوە ڕایان دەگوێزینە ئێرە. بابەتەکان بەڕێنووسی ئێستا نووسراونەتەوە.

(وەرگێری کوردی)

## ئاواتم پێک هات، بەڵام ماوەتی

*خەلیلی فەتاحی قازی*

*(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە١٢، ٢٠ی ڕێبەندانی ١٣٢٤، لاپەڕەی ٣*

ئەمردم بەچاوی خۆم ئاڵای سەربەخۆیی و ئازادیی کوردستانم دی، هەڵکراوە، لە بەرانبەری ئەو نیشانەی شەڕەف و شانازیی میللیدا لاو و پێشمەرگەی داوخوازی کوردیم دی کە لە ژێر فەرماندەری کوردی لە حاڵێکدا خۆیان لە بن چەک و ئەسلەحەدا ڕەش کرد بوو ڕوویەڕووی ئاڵای موقەدەسی کوردی و پێشەوای گەورە و خۆشەویستی خۆی بەکەلامی خودا و بەشەڕەف و ناموسی میللی سوێندی بەئەمەگ بوونیان دەرحەق بە ئاڵای میللیی نیشتمانی خۆشەویست، پێشەوای موعەزەم، خوشک و برایانی کورد خواردووە بەڵێنییان بەدڵێکی پاک و خاوێن دا هەتا ڕەگێکی تەڕیان لەبەر بەدەنیدا مابێ و تا ئاخرین تکە خوێن و پشووی دوایە بۆ ڕاگرتنی حەقی خۆیان حازر بن و لەو ڕێگایەدا سەروماڵ دابنێن.

ئەمردم بەچاوی خۆم دیم تەواوی کوردستان ڕۆڵەیەکی با کیفایەتی کە چەند ساڵ بوو بەسەروماڵ لە ڕێگای میللەتی خۆیدا فیداکاریی دەکرد، بەفیکر و تەدبیرێکی مەتین بێ زەرەر و زەحمەت یا خوێنڕژان و دەربەدەری وەک حەکیمێکی چازان میللەتی کوردی کە لە مێژ بوو پەنجەی زۆر گەرووی گوشیبوو و دەستی بەدەمیدا گرتبوو کە بە یەکجاری بێخنکێنێ و هاواری بە هیچ کوێ ڕانەگا لە ژێردەستی ئەهریمەنی ئیستیبداد و

دێوودرنجی خوینخۆر خەلاسی کرد.

ئەمردم بەچاوی خۆم دیم گۆوار و ڕۆژنامە بەزمانی خۆمان لە شاری خۆمان بەدەستی خۆمان لە چاپخانەی خۆمان بە ئاشکرا چاپ دەکرێ و بلاوکەری وی لە بازاڕ و شەقام بە دەنگی بلیند هاوار دەکا: مەجەلەی کوردستان، ڕۆژنامەی کوردستان، باوەش باوەش لە نێو خەلکی بلاوی دەکا.

هومێدم لە خودای بەرز ئەوەیە کە بەزوویەکی زوو میلۆنها قوشوونی کورد یەک لیباس و یەک ئەسلەحە لە ژێر دەستی ئەفسەرانی زانای کورد ببینم بە نەزم و دیسیپلین دەستە بەدەستە تانک، زرێپۆش، تۆپخانە، سوارە، پیادە، موهەندیس، پۆل پۆل لە بەرانبەری ئالای موقەدەس و پێشەوا و ڕەهبەری خۆشەویستی خۆیاندا بە دەفیلە بڕۆن، لە بەرانبەری فەرماندەهانی سپا و سەرۆکی لەشکرانی زانا و ڕەشیدی کورد گوێی ئاسمانێ کەڕ بێ لەبەر گرمەی تانک و زرێپۆش و سمکۆلی سوارە نیزامی، [بە] هاڕە هاڕی هەزاران هەواپەیمای کوردی عەرز بلەرزێ و داخ و کێو دەنگ بداتەوە، لە بەر ورشەی سەرنێزەی پیادە نیزامی کورد چاوی دوژمنان کوێر ببێ وەکو هەوری بەهاری بەگوڕینی سروودی میللی: بژی کوردستانی گەورە و پێشەوای خۆشەویستی بخوێننەوە و هێزی ئەوان دنیا بلەرزێنێ هەموو سەری تەعزیمی بۆ نەوی کەن. دیسان هیوادارم وەک سەرەتای دیارە ببینم تەواوی شار و دێهاتی کوردستانی گەورە خاوەنی تەشکیلاتی فەرهەنگی و لەشساغی بێت. لە سەرتاسەری کوردستانی گەورەدا نەخوێندەوار، لە کوڕ، لە کچ و نەخۆش، لە پیر، لە جەوان بۆ دەرمان وەگیر نەکەوێت. مەکاتیبی عالی ئێمە لە ژێر تەعلیمی مامۆستایانی کورددا هەموو سالێ هەزاران ئەفسەر، موهەندیس، میکانیک، حەکیم، زانا، موتەخەسیس لە تەجارەت، فەلاحەت، مەعدەن، بریسکە، نەفت فارغولتەحسیل بن و بەدیاری بۆ خەدەماتی نیشتمانی وەدەر خستووە.

ئاواتی ماوم ئەوەیە تەواوی شار و دێهاتی کوردستانم دووکەلی کارخانەجاتی تانک سازی، تۆپ، هەواپەیما، موسەلسەل، تفەنگ، فیشەک، بۆمب، ئۆتۆمۆبیل، فاسونیا، مەخمەر، چیت، شەمچە، قەند، دەرمان و تەواوی شتانێکی بۆ ژیانی نەتەوەیەک پێویستە لە کارخانەکانی خۆمان وە بەدەستی خۆمان دروست بکرێ.

ئاواتم ئەوەیە فەلەخۆیی کوردستانی گەورە هاتووەتە سەر نەزم و تەرتیبێکی کە ئەورۆ لە دونیای موتەمەدیندا هەیە و دەنگی هۆهۆی جووتیاری مە گۆڕدراوەتەوە بەگرمە گرمی

تەراكتۆر و ماشێن و لە تەواوی خاكی مە بستێک عەرز لە دێم و بەراو بەفیڕۆیی نەماوەتەوە حەتتا كێو و شاخە بەردەلانەكانمان كراوە بەلێڕەوارێكی سەوز و جوان.

ئاواتم ئەوەیە كوێرە ڕێگای بەردەلان هەڵدێرەكانمان بگۆڕدرێتەوە بەشەقامی پان و لێک و ڕێگای ئاسن و سمیت و قیلەتوێ كراوە، سەد سەد قەتاری شەمەن نەفەر و ئۆتۆمۆبیلی باری، سواری، مۆتۆر سیكلێت، دووچەرخە بەهاسانی پێیدابڕوا.

ئاواتم ئەوەیە كانگای زێڕ و زێو، ئاسن، پۆڵا، نەفت شتانی دیكەی ئێمە كە بەدەست لێنەدراوی ماوەتەوە بەدەست و دەستمایەی خۆمان وەدەر خراون و لە نێو خاكی خۆمان بەدەستی خۆمان كراون بەشت ملیۆنها كاركەری كورد لەو ڕێگایەدا ژیاوە.

ئاواتم ئەوەیە بانكی میللی كوردستان لە تەواوی كوردستانی گەورە و لە شارانی گەورە و چووكی دونیا داندراوە و سندووقی وان پڕبووە لە قورسەی زێڕوزێوی كانگای كوردستان وە ئەسكیناسی بانكی میللی كوردستان كە بەعەلامەتی گوڵی گەنم و قەڵەم و وێنەی پێشەوای خۆشەویستی خۆی لە هەموو دنیا لە زێڕوزێو ڕەواجتر بێ.

دڵخوازم ئەوەیە لە شارەكانی كوردستانی گەورەدا دەستگای فرستەندەی ڕادیۆ ڕۆنراوە، قسەبێژی كوردی كوتوویە ئێرە (مهاباد)، هەموو ڕۆژێ ڕادیۆی كوردستان بەزمانی كوردی قسە دەكا لە پاش خوێندنی چەند ئایەتێكی قورئانی مەجید سروودی میللی كوردستانی گەورە لە لای قامبێژەكانی كورد خوێندراوە و وڵامی پێشكەوتن و سەركەوتنی فەرهەنگ و سەنعەتی كوردستان بەدنیا كوتراوە، لە پادشا حەیران و لاوكی كوردی دەستی پێكراوە و بەرنامە بەجوملەی: بژی كوردستانی گەورە و پێشەوای خۆشەویستی وی تەواو بووە.

## ڕۆژنامەی کوردستانم وا دەوێ

*خەلیلی فەتاحی قازی*

*(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارەی ١٣، ٢٢ی ڕێبەندانی ١٣٢٤، لاپەڕەی ١)*

١- ڕۆژنامەی کوردستانم وا دەوێ لەوەی زیادتر بەشی شێعری میللی شاعیرە میللییەکانی مردوو یا زیندوو وەکو مەرحوومی سەیفولقوزات، هەژار، هێمن، حاجی قادر و شەرحی حاڵی وان ڕازابێتەوە و هەر بەو جوورە شەرحی حاڵ و تەفسیلی شەڕان و شاهکاری قارەمانانی ڕەشید و بەنێوبانگی کوردی وەکو ئەمیرخانی برادۆست کە بەخانی لەپزێڕین نێوبانگی ڕۆیشتووە و ئەمسالی وی کە لە ڕێی ڕاگرتنی شەرەف، ئازادی، ئیفتیخاری میللی، بەقەڵەم، بەزمان، بەتفەنگ زەحمەتیان کێشاوە و قوربانییان داوە بنووسرێ، ئەگەر مومکین بێ عەکسیشیان گراوێر بکرێ. بۆ ئەوەی ئەو قارەمانە میللییانە چی دی نێویان لە بیر نەچێ، هەر نەبێ بەزیندووکردنەوەی نێویان لە کتێبی تاریخ و ڕۆژنامەی کوردیدا لە فەداکاری وان قەدر بگیرێ ورِوحی پاکی وان شاد بکەین، ئەو کارە بێجگەلەوەی سابیت دەکا خزمەت بەمیللەت و نیشتمان لەنێو میللەتی زیندوو ون نابێ دەبێتە باعیسی تەشویقی زیندووکانیش و زیاتر لە ڕێی خزمەت بەکورد بەدڵ و گیان فەداکاری دەکەن. ئەوانە دەبێ بە قارەمانی کورد بناسرێن و خزمەت و قوربانی دانی وان بەتەفسیل بنووسرێ.

٢- هەر وەکو لازمە پیاوە چاکەکانمان نێویان بەچاکی لە نێو ڕۆژنامە و تەواریخی کوردی بنووسرێ، پیاوانی خراپ و میللەت فرۆش و خائینیش کە بۆ قازانجی ماڵی دنیایە براو خوشک و ناموسی خۆیان بەبێگانە فرۆشتووە لازمە میللەتی کورد بیانناسێ لەبەرئەوەی چیدی فریوی فێڵ و تەڵەکە، درۆ و دەلەسەی وان نەخۆن و تائەبەد نێوی کەسیف و مەنحووسی وان بەبێ شەرەف، خائین، میللەت فرۆش بەتف و لەعنەت یاد کرێن.

ڕۆژنامەی کوردستانم وادەوێ بەهیممەتی ئاغایانی کارگەرانی ڕۆژنامە و نووسەرانی جوان و بەزەوق و شاعیرە میللییەکان لە نێو مەتبووعاتی دنیا ئیمتیازی بێ وەکو مانگ لە نێو ئەستێران بدرەوشێ.

## ئاگاداری

لە سەر قەراری کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان دەوڵەتی کوردستان دە نەزمری گرتووە توتونی دەرەجە ١ لە قەراری هەر کیلۆ دوو تومان وە توتونی دەرەجە ٢ لە قەراری هەر کیلۆ ١٤ قران بکڕێ.

کەسانێکی بەغەیرەی دەوڵەتی کوردستان توتونی بفرۆشێ خاریج بکرێ سەدی پەنجای قیمەتی توتونەکەی بەنێوی حوقووقی گومرگی لە فرۆشەندەی وەردەگرێ، لە مەوقیعی خەریددا جێگای تەحویلدانی توتون مەعلوم دەکرێ.

سەرۆکی ئیدارەی دوخانییەی مهاباد – فەتاحی قازی

(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٣٩، ٤ی بانەمەڕی ١٣٢٥، لاپەڕەی ٤)

## ئاگاداری

بەعوموومی ئەهالی خەبەر دەدرێ لە ڕۆژی شەمۆیەوە ٢٨ / ٢ / ٢٥ دەست بەپەرداختی پووڵی سپوردەی تووتنی مهابادێ دەکرێ. هەر کەس قەبزی سپوردەی تووتنی لە دەست دایە بەتەسدیقی دوخانییەی مهابادی بگەیێنێ و چون تووتنی بۆکان نەفرۆشراوە پووڵی سپوردەی بۆکانێ جارێ قابیلی پەرداخت نییە.

سەرۆکی ئیدارەی دوخانییەی مهاباد فەتاحی قازی

(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارەی ٤٨، ٢٨ی بانەمەڕی ١٣٢٥، لاپەڕەی ٤)

## ئاگاداری

ئیدارەی ئیقتیسادی کوردستان حەسبولئەمری ئاغای فەرماندار بەقییەی تەعمیراتی ئەنباری سەبتی غەلەی مهاباد بەتەفسیلێکی کە لە جەلەسەی موناقەسەدا شەرح دەدرێ بەموناقەسە تەعمیر دەکا. لە ئاغایانێکی مایل بەکۆنتراتی تەعمیری ئەنباری نێوبراون خوداهیش دەکەم پێشنیهادی خۆیان تا ڕۆژی ٢٢ / ٥ / ٢٥ دەگەڵ قەبزی سپوردەی سەد تمەنی کە بەحیسابی ئیدارەی غەلە تەحویلی سندووقی دارائی مهاباد درابێ بەدەفتەری ئیقتیسادی تەحویل و لە ڕۆژی چوارشەمۆ ٢٣ / ٥ / ٢٥ ساتی دەی بەیانی لە ئیدارەی نێوبراو حازر بن کە بەحزووری هەیئەتی کۆمیسیۆن لەو مەوزووعەدا موزاکەرەی پێویست

بکرێ، ئەڵبەتە ئەشخاسێکی کەمترین مەبلەغی پێشنیهاد بکەن موناقەسە بەوی تەعەلوق دەگرێ. هەرکەس موناقەسە بەنێوی تەواو بووە لە کاری تەعمیرات خودداری کرد سپوردەی وی بەنەفعی دەوڵەت زەبت دەکرێ.

موعاوینی ئیدارەی ئیقتیسادی کوردستان – فەتاحی قازی

٢٩٣

١٩ / ٥ / ٢٥

(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارەی ٧٦، ٢٢ی گەلاوێژی ١٣٢٥، لاپەڕەی ٤)

١٩٨

---

٢١ / ٥ / ٢٥

## ئاگەهی

لە سەر قەراری کۆمیتەی مەرکەزی حیزبی دێمۆکراتی کوردستان بەتەواوی ساحێبانی توتون کە مایل بن توتونی خۆیان بۆ ئازەربایجان حەمل بکەن ڕادەگەیەندرێت ساحێبانی توتون مووەزەفن توتونی مەوجوودی خۆیان لە موحەوەتەی دوخانیاتی مهاباد حازری بکەن، پاش تەعینی دوخانیات بەوەسیلەی ئەرزیابی دوخانییە وە کێشان لە قەپانی دوخانییە بەقەراری خوارەوە حقووقی ئینحیساری دەبێ لە موقابیلی قەبزی سندووق بەسندووقی دوخانییە تەحویل بدرێ:

١- توتونی دەرەجە ١ (کووبیدە – نیمکوت – گەڵا) هەر یەک کیلۆ چوار ڕیاڵە

٢- توتونی دەرەجە ٢ (کووبیدە – نیمکووب – گەڵا) هەر یەک کیلۆ سێ ڕیاڵ

٣- توتونی دەرەجە ٣ (کووبیدە – نیمکووب – گەڵا) هەر یەک کیلۆ دوو ڕیاڵ

٤- توتونی دەرەجە ٤ (کووبیدە – نیمکووب – گەڵا) هەر یەک کیلۆ یەک ڕیاڵ

ساحێبانی توتون دەبێ تەقازانامەیەک لە سەر تەعداد عەدل مەقسەد بێرەسانید تەسلیم بکەن وە بیلافاسیلە لە تەرەف دوخانییەوە تەرتیبی ئەسەر بەتەقازای وان دەدرێ

سەرۆکی دوخانییاتی مهاباد فەتاحی قازی

(ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٧٨، ٢٧ی گەلاوێژی ١٣٢٥، لاپەڕەی ٢)

## قازی لەتیف و دوکتور مستەفای قازی

مامۆستا قادری فەتاحی قازی لە پەراوێزی لاپەڕەی ٨٣ی دەقی فارسی ئەم کتێبەدا دەنووسێ: بابم لە پاش میرزا ڕەزاق باسی شەرحی حاڵی خوداڵێخۆشبوو قازی لەتیفی کردووە و لەبەرئەوەی شەرحی حاڵی قازی لەتیف لە کتێبی (سالهای اضطراب) (خاطرات خلیل فتاح قاضی) (ساڵانی پەشێوی (بیرەوەرییەکانی خەلیلی فەتاحی قازی)دا هاتووە، لێرەدا لە دووپاتە کردنەوەی دەست دەپارێزین.

بۆ ئەوەی خوێنەرەوەی ئەم کتێبە لە ژیان و بەسەرهاتی قازی لەتیف و کوڕی پچووکی دوکتور مستەفای قازی، خاڵی نووسەر، ئاگادار بن بەشێک لە نووسینی نەمر خەلیلی فەتاحی قازی لەمەڕ ئەوان لە کتێبی "ساڵانی پەشێوی" و زانیاری دیکە لەمەڕ ژیانیان لێرەدا باس دەکەین (وەرگێڕی کوردی).

نەمر خەلیلی فەتاحی قازی لەو بارەیەوە دەنووسێ:

"خوداڵێخۆشبوو میرزا عەبدوللەتیفی قازی، باپیری نووسەر لە دایکەوە، کە نازناوی موعینولئیسلام بوو، کەسێکی زانا، ئەدیب و شاعیر بوو. نێوبراو لە نێو خەڵک و کاربەدەستانی دەوڵەتدا حورمەت و کەسایەتییەکی تایبەتی هەبوو و لە لایەن شایانی قاجارەوە، بەپێی داب و شوێنی ئەو سەروبەندی مووچە و مانگانەی نەغدی دەدرایە و فەرمانی قەزاوەتی مهابادیشی هەبوو. ئەو خوداڵێخۆشبووە لەبەر سەفەر بۆ تاران و ئەستەنبووڵ و عەڕەبستانی سعوودی بەمەبەستی بەجێگایاندن فەریزەی حەج و میسر و هەروەها ڕووسیە لە کاتی یەخسیربوونی لەوێ، و پێوەندی لەگەڵ پیاوانی شارەزا و زانا، کەسێکی تێگەیشتوو، لێزان و ئاگادار بوو. هەر بۆیەش کوڕەکەی میرزا مستەفای قازی کە خوێندنی سەرەتایی زانستی دینی و ئەدەبیاتی عەرەبیی لە مهاباد تەواو کردبوو، بەمەبەستی خوێندنی زانستی پزیشکی، لە سەفەرێکدا کە دەچوو بۆ زیارەتی مەککە، لەگەڵ خۆی برد بۆ ئەستەنبووڵ. میرزا مستەفای شەوقی لە کالیجی پزیشکیی ئەستەنبووڵ خوێندنی تەواو کرد و چەند ساڵێکیش بۆ زیادکردنی مەعلوومات، لە بێرلین

پێتەختی ئاڵمان ژیا و لە نەخۆشییەکانی هەناو و منداڵاندا پسپۆڕیی پەیدا کرد.

ناردنی منداڵ بۆ دەرەوەی وڵات بۆ خوێندن لەو سەروبەندیدا، یەکێک لە کارە هەرە دژوارەکان بوو. چونکو خوێندنی زانستی نوێیان بەکفر و گوناهێک دەزانی کە بۆ لێخۆشبوون نەدەبوو. بەتایبەتی کاتێک ئەو داهێنانە لە لایەن بنەماڵەیەکی ئایینییەوە بایە. کاتێک کە دەیانەویست لە مهاباد بۆ یەکەمین جار خوێندنگەیەک بەشێوەی نوێ بکەنەوە، کۆمەڵێک کۆلکە مەلای نەزان دژایەتییان لەگەڵ دەکرد و نارەزایەتی هەرە گرینگیان زەنگ لێدان بوو لە مەدرەسان و دەیانگوت ؛ لەبەرئەوەی زەنگ لێدان لە کلیسای هەرمەنییەکان باوە، لە مەدرەسەی موسڵمانانندا نابێ زەنگ لێ درێ.

هەرچۆنێک بێ، خوداڵێخۆشبوو قازی لەتیف لە هەموو ڕوویەکەوە پیاوێکی وێچوو، تەواو و ئازا بوو، بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو خەسڵەتە چاکەش دوو عەیبی زۆر گەورەی هەبوون کە سێبەری خستبووە سەر گشت لایەنە باشەکانی، یەک لەوانە تووڕە و تۆسنیی بێ سنوور و لە ڕادە بەدەری بوو، بەشێوەیەکی ئەوتۆ لەبەر ئەو تووڕەیی و توندوتیژ بوونەی منداڵەکانی و ئەندامانی بنەماڵە لە دەستی جاڕزبوون و دوورییان لێ دەکرد. وەک پێشتر باسم کرد ئەو خەسڵەتەی بوو بەهۆی ئەوەی کە کوڕە گەورەکەی بە نێوی محەمەد، بەدەستی خۆی بکوژێ. عەیبی دووەمی دەستقووچاوی و دەستپێوەگرتن بوو.

خوداڵێخۆشبوو حاجی قازی لەتیف لەگەڵ برا پچووکترەکانی میرزا مەجید و میرزا ئەحمەد، لە مەحاڵی شاروێران لەو شوێنەی کە چۆمی مهاباد دەڕژێتە دەریاچەی ورمێ، دێیەکیان هەبوو بەنێوی گردیاقوب، دوایە برایەکەی خوداڵێخۆشبوو میرزا مەجید ماڵی لەگەڵ بەش کرد و لە زەوییەکانی بەشی خۆی لە گردیاقوب، دێیەکی بەنێوی کۆنەدێ ساز کرد. لە دراوسێیەتی گردیاقوب و کۆنەدێدا، گوندەکانی خوڕ خوڕە، گاپیس و قەرەقشڵاق هەڵکەوتوون، خاوەن ملکانی ئەو دێیانە هەمزە، فەتاح، خەلیل، سەر بەعێلی دێبۆکری، بەپێی ئەسڵی ئاشکرای خۆڕسکی، کە بەهێز، هەمیشە تەمای گرتووە بێ هێز بخوا، تەماحیان لە ملکی قازی لەتیف و براکانی کردبوو. بەبێ ڕەچاوکردنی مافی دراوسێیەتی یان قانوونی ئیسلامی و ئینسانی، دەستیان کرد بەئەزییەت و ئازاردانی ئەوان و ڕەعییەتەکانیان و میرزا ئەحمەد برای قازی لەتیف بەدەست هەمزە کوژرا.

دوای کوژرانی میرزا ئەحمەد، قازی لەتیف کە لەوە نائومێد ببوو کاربەدەستانی بێ هێز و ناتوانای ئێران حەقی بۆ بستێننەوە، لێ بڕا سەری خۆی هەڵگرێ و بڕوا بۆ

دەرەوەی وڵات. بۆ ئەو مەبەستە چووە ماڵی شێخ محەمەد سەدیق کوڕی شێخ عوبەیدیڵای کوڕی سەید تەها. شێخ محەمەد سەدیق تێلگرافێکی نارد بۆ شێخ عەبدولقادری برای لە ئەستەنبووڵ کە سەبارەت بەموهاجەرەت و پەنابەری قازی لەتیف بۆ وڵاتی عوسمانی، لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی قسە بکا. دوای یەک، دوو ڕۆژ وڵامی تێلێگرافەکە هاتەوە کە: دەوڵەتی عوسمانی بەوپەڕی پێخۆشبوونەوە قۆڵ لە سەر پەنابەریی قازی لەتیف و خاووخێزانی دەکێشێ و هەر چەندی زەوی و ئاوی بیانەوێ لە مڵکی خالیسەی دەوڵەتی بەئامراز و کەرەستەی پێویستەوە دەیانداتێ. هەروەها دەوڵەتی عوسمانی ئەوەی بۆ میوانداری و ڕێز لێنان و یارمەتی بشێ لەحەق ئەواندا دەیکا و وەسیلەی ژیانیان بەشێوەیەکی شیاو دابین دەکا. دوای وەرگرتنی ئەو تێلگرافە خودالێخۆشبوو قازی لەتیف بەشەخسە خۆی چوو بۆ ئەستەنبووڵ.

لەبەرئەوەی ترکییەکانی عوسمانی تەماحیان لە زەویی ئێران کردبوو و هێندێک ئیدیعایان دەکرد، هەمیشە خەریکی پەلپ و بیانوو گرتن بەئێران بوون بەمەبەستی دەستێوەردان لە خاکی ئێران، ڕەنگە لەبەر ئەو هۆیە بووبێ کە پێشوازییان لە داوخوازی قازی لەتیف کرد و بەگەرمی وەریانگرت. لە لایەکی دیکەوە لەبەرئەوەی دەوڵەتی ئێران نەیدەویست بیانوویەک بداتە دەست دەوڵەتی عوسمانی بۆ سنوور بەزاندن و دەستدرێژی، لەوکارەی قازی لەتیف نیگەران و دڵەپەشێو بوو و فەرمانی دا بەباڵوێزی خۆی لە ئەستەنبووڵ بە هەر شێوەیەک بێ قازی لەتیف لە ئەستەنبووڵ بهێنێتەوە و متمانەی بداتێ کە هەموو داواکانی جێبەجێ دەکرێن بەومەرجەی وڵاتی عوسمانی بە جێ بێڵێ و بگەڕێتەوە ئێران.

خودالێخۆشبوو قازی لەتیف لەگەڵ ئەوەشدا کە کەسێکی سەرسەخت و تووڕە و سمیتان بوو، دیار نییە چۆن بوو ئەو هەموو بەڵێنە باشەی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیی لەبەر چاو نەگرت و بەقسە و بەڵێنی باڵوێزی ئێران پێمل بوو و گەڕاوە وڵاتی خۆی ئێران؟ بەکورتی دوای گەڕانەوەی خودالێخۆشبوو قازی لەتیف، کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران بەڵێنی خۆیان بەجێ هێنا و بۆ حەق ئەستاندنەوە و ڕازیکردنی ئەوەی دەبوو بیکەن کردیان. هەمزە و فەتاحی خاوەن مڵکانی خوڕخوڕە، بکوژانی میرزا ئەحمەدیان گرت و چەند ساڵ لە تاران لە بەندیخانەدا ڕایان گرتن، دوای چەندین ساڵ گرتنیان، کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران داوایان لە قازی لەتیف کرد کە یەک لەو دووانە، هەمزە یان فەتاح بەتۆڵەی خوێنی براکەی بکوژێتەوە و گەردنی ئەوی دیکەیان ئازاد بکا و یان ئەوەیکە

شەش دانگی دێی شەبەک و هەزار تمەن دراوی نەغد و ماینێکی قیمەتی بەڕەختی زێوەوە و کچێکیان لێ وەربگرێ و چاوپۆشی لە کوشتنەوەی بکوژەکە بکا و لەگەڵیان بسازێ. خاوەن مڵکانی خوڕخوڕە کە لە سەر ئەو کێشەیە لەگەڵ خوداڵێخۆشبوو میرزا فەتاح، برای قازی لەتیف، قسەیان کردبوو و هەر دووک لا پێک هاتبوون، ماینێک و کچێک و هەزار تمەنیان نارد بۆ ماڵی میرزا فەتاح (ئەو بەسەرهاتە لە ڕۆژنامەی ناسری، ساڵی چوارەم، ژمارە ۲۲، ڕۆژی دووشەمۆ بیستەمی جەمادیولئەوەلی، ساڵی ۱۳۱۵ی کۆچی مانگی بەرانبەری ۱۸ی ئۆکتۆبری ۱۸۹۸دا نووسراوە. ڕۆژنامەی نێوبراو لە کتێبخانەی دانیشکەدەی ئەدەبیاتی تەوریز هەیە - بژارکار قادری فەتاحیی قازی).

میرزا فەتاحی قازی، میرزا کەریمی یەمینولقوزات کوڕی قازی لەتیف بانگ دەکاتە لای خۆی و پێکهاتنەوەکەی پێ دەڵێ و پێشنیازی پێ دەکا میرزا کەریم کچەکە لە خۆی مارە بکا و باوکیشی دراوەکە و دێی شەبەک وەربگرێ. میرزا کەریم وردە ڕیشاڵی ئەوە بۆ بابی دەگێڕێتەوە. قازی لەتیف ئەوە قبووڵ ناکا و دەڵێ ئەمن ئاشت نابمەوە. دوای ئەوەی کە میرزا فەتاحی قازی لە سەر وەبەر نەهێنانی قازی لەتیف ئاگادار دەبێ، خۆی دراو و ماینەکە گل دەداتەوە و دوای چەند ڕۆژ کچەکە بەڕێزەوە دەنێرێتەوە بۆ ماڵی بابی. (لەوە ڕا دەردەکەوێ کە میرزا فەتاح، قازی لەتیفی ناچار کردووە بۆ پێکهاتنەوە - بژارکار قادری فەتاحیی قازی).

لەبەرئەوەی دێی شەبەک لە دراوسێیەتی دێی خوڕ خوڕە هەڵکەوتبوو و دراوسێیەتی قازی لەتیف لەگەڵ خاوەن مڵکانی ئەوێ کە بەتایفەی سلێمانی بەنێوبانگن و لەو دوایانەدا بە قارەمانی نێوبانگیان ڕۆیشتووە، لەبەر دوژمنایەتیی پێشوو، خۆش نەبوو، حاکمی ئەو سەردەمی سابڵاغێ، میرزا عەلی ئەکبەرخانی کارگوزار، تەگبیرێکی لێ دەکا و پێشنیازی سەودایەک دەکا کە هەم لە بەرژەوەندی خۆیدا بێ و هەم قازی لەتیف. بەو مەبەستە گوندەکانی خاڵ دەلیل و پیر مکایل دەدا بەقازی لەتیف و میرزا مەجید و لە جیاتییان دێی شەبەک بۆ خۆی هەڵدەگرێ.

دوای ماوەیەک، هەمزە و فەتاح کە هەڵاتبوون و قاچاغ بوون، بە شەو دێنە دێی شەبەک کوێخای ئەوێ دەکوژن و چەند تایە گەنم و گیاوگۆڵیش ئاور تێ بەردەدەن. لە ئاکامی ئەوکارە تێکدەرانەیەدا دێی شەبەک وێران دەبێ و کەلکی کێڵانی پێوە نامێنێ و میرزا عەلی ئەکبەر خانی کارگوزار کە ئەو زەمانی ئیدی لە حکوومەتی سابڵاغێ لادرابوو، لە سەوداکە پاشگەز دەبێتەوە و داوا لە قازی لەتیف و میرزا مەجید دەکا هەڵی وەشێننەوە. بەڵام قازی

لەتیف و میرزا مەجید قۆڵ لە سەرئەوە ناکێشن و ئەو دێیانەی باس کران نادەنەوە. هەڵبەت دەبێ لێرەدا لێی زیاد کەم لەبەرئەوەی خاڵ دەلیل و پیر مکایل لە هاوسێیەتیی عێلی مەنگوڕ هەڵکەوتبوون، ئەو دوو دێیە زۆرجار لە بەردەست کاکە سواری کوڕی ئەحمەدی گوڵاوی ئاغادا بوون.

لەو سەروبەندەدا کێشە و هەرای فەریق پادشا و دەستدرێژیی لەشکری عوسمانی بۆ سەر خاکی ئێران دەستی پێ کرد. دەوڵەتی عوسمانی کە بەردەوام لە دووبەرەکی و کێشەی نێوخۆیی عەشیرەتە کوردەکان بەخراپە کەلکی وەردەگرت بۆ ماوەی چەندین ساڵ ناوچەی لاجانی مامەش و سندووسی داگیر کرد و بەرێگای ئەفسەرێکدا بەنێوی یووسف زییا کە لەوێ حوکماتی دەکرد، بەکردەوە ئەو بەشە لە کوردستانی ئێران جوێ کردبووەوە. دواتر محەمەد پادشای فەریق لەگەڵ ژمارەیەک لە عەسکەرەکانی و هێندێک لە سوارەی سەرۆک عەشیرەتە کوردەکان لەوانە هەمزەی سێمانی مامەش، حاجی محەمەدئاغای ئێلخانی، بایزاغای مەنگوڕ، لەشکرکێشییان کرد بۆ سەر سابڵاغ. ئەوانە لە پێشدا لە دێی ئیندرقاش دامەزران و لە دووی میرزا کەریمی یەمینولقوزات یان نارد و بەرێگای ویدا پەیامێکیان بۆ بابی واتە قازی لەتیف بەرێ کرد. نێوەرۆکی پەیامەکە ئاوا بوو: قازی لەتیف لە پشتیوانی و هاوکاریی شازادە عەبدولحوسێن میرزای فەرمانفەرما کە ئەودەمی حاکمی سابڵاغێ بوو دەست هەڵگرێ، سابڵاغ بەجێ بێڵێ و لەگەڵ ئەوان کەوێ. میرزا کەریم دێتەوە لای باوکی کە لە سەرای حکوومەتی لە لای فەرمانفەرما دەبێ و بەنهێنی پەیامی عەشیرەتەکان و فەریق پادشای پێ ڕادەگەیێنێ.

قازی لەتیف دوای بیستنی قسەکانی میرزا کەریم، لە جێی خۆی هەڵدەستێ قورئانی سەر تاقەکە هەڵدەگرێ و سوێندی پێ دەخوا کە ناچێتە لای عەشیرەتەکان و ئەفسەری بێگانە و دەڵێ ئەگەر ئەتۆش بکوژن، ئەمن ڕوو لە دەوڵەتی ئێران وەرناگێڕم.

فەرمانفەرما لەو بەسەرهاتە ئاگادار دەبێ و بەقازی لەتیف دەڵێ: جەنابی قازی لەبەرئەوەی ملک و ماڵی ئێوە جارێ لە قەڵەمڕۆی ئەو عەشیرەتانە دایە، بۆ ئەوەی لە خراپە و فیتنەی ئەوان ڕزگاریت بێ، چی تێدایە بچۆ لایان و من لەو بابەتەوە گلەیی و گازندەت لێ ناکەم (لێرەوە دەردەکەوێ کە ئەو دەمی دێی گردیاقوب بەملکایەتی ئی قازی لەتیف بووە و نێوبراو تەنها دێی (شەبەک)ی لەگەڵ خاڵ دەلیل و پیر مکایل گۆڕیوەتەوە- بژارکار قادری فەتاحیی قازی). خودالێخۆشبوو قازی لەتیف دیسان سوێندەکەی دووپاتە دەکاتەوە. فەرمانفەرما لە وەفاداریی قازی لەتیف خۆشحاڵیی خۆی دەردەبڕێ و دڵی دەداتەوە و

سپاسی لێ دەکا.

لەو کاتەدا کە میرزا کەریم بەرەو سابلاغێ دەچێتەوە، حاجی محەمەدئاغای ئێلخانی ئەو دەرفەتە دەقۆزێتەوە و بەبڕوبیانووی ئەوەی کە قازی لەتیف لەگەڵیان هاودڵ نییە و نەهاتووە بۆ لای فەریق پادشا و گوێڕایەڵیی لێ نەکردووە، هێندێک سوارەی دێبۆکری لە تایفەی مرادکلۆ دەنێرێتە دێی گردیاقوب. لەوێ ئەوان ماڵی میرزا کەریم و براکەی میرزا محەمەد تاڵان دەکەن.

لەو بارودۆخەدا فەریق پادشا و ئەو عەشیرەتانەی لە دەوری کۆبووبوونەوە، هەموو ڕۆژێ ولام بۆ فەرمانفەرما دەنێرن سابلاغێ چۆل کا و بگەڕێتەوە تەورێز. بەڵام فەرمانفەرما دەڵێ لە لایەن دەوڵەتەکەیەوە ئیجازەی نییە مهاباد چۆل بکا و بگەڕێتەوە تەورێز بەڵکو ئامادەی بەرگریکردن لە سابلاغ و دەستکردنەوەیە. بۆ گوشار هێنان بۆ سەر فەرمانفەرما، عەشیرەتە هاوکارەکانی فەریق پادشا، هەموو ڕۆژێ لە دەوروبەری سابلاغ دەست دەکەن بەئاژاوە گێڕان و کێشە سازکردن.

لەو نێوەدا خەبەر دەگاتێ هێندێک لە سوارەی پۆلادلوو بە ئازووقە و چەکوچۆڵێکی زۆرەوە لە میاندواوەوە بەرەو سابلاغ دێن بۆ یارمەتیکردن بە فەرمانفەرما. کاتێک دەگەنە نزیک سابلاغێ، سوارەی مەنگوڕ و دێبۆکری و مامەش ڕێیان پێ دەگرن و شەڕ و لێ دە و بخۆ دەست پێ دەکا.

فەرمانفەرما لەگەڵ ئەوەشدا هیوای بەهاتن و گەیشتنی یارمەتی بوو، نازانێ ئەوانەی تووشی شەڕ هاتوون ئەو لەشکرن کە بەدەنگییەوە هاتوون یان نا؟ خوالێخۆشبوو بابم میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی دەیگێڕاوە و دەیگوت: ئەمن ئەودەمی کە جەوان و بەخۆوە و چالاک بووم لە سابلاغێ لە لای قازی لەتیف و فەرمانفەرما بووم. فەرمانفەرما ڕووی لە قازی لەتیف کرد و گوتی:

جەنابی قازی ئەمن پێم وایە ئەو هێزەی بەرەو سابلاغ دێ، هێزی یارمەتیدەر بێ کە بۆ منیان ناردووە بەڵام بەتەواوی دڵنیا نیم. ئایا لە سوارە و کەسانی ئێوە کەسی ئەوتۆ هەیە بتوانێ لەوە بکۆڵێتەوە و ئاگادارم کاتەوە؟

خوالێخۆشبوو قازی لەتیف، کوڕەکەی میرزا کەریمی بۆ زانینی ئەمە نارد و فەرمانیدا بەمنیش لەگەڵی بچم. ئێمە بەرەو لەشکری نێوبراو کە لەحاڵی لێ دە و بخۆ و شەڕدا بوو و بەزەحمەتێکی زۆرەوە بەرەو سابلاغ دەجووڵا وەڕێکەوتین. هەر کە من و میرزا کەریم لەو

لەشکرە نزیک بووینەوە، لە هەموو لایەکەوە کەوتینە بەر دەستڕێژی تفەنگان، لە ئاکامدا لە یەکدی هەڵبڕاین و هەر کامێکمان بەجوێ بەرەو ساباڵغ هاتینەوە.

خوداڵێخۆشبوو بابم دەیگێڕاوە: باروبنەیەکم دی بە تەخمین سەد نەفەر وشتر دەبوون و ئەو لەشکرەی لەگەڵیان بوو، عەشیرەتە کوردەکان دەورەیان دابوو و خەریک بوون تاڵانیان دەکرد. ئەو لەشکرەی لەگەڵ باروبنەکە بوون، لە شێوەی جلکەکانیانەوە دیار بوو لە عەشیرەتەکانی ترک زمانی ئازەربایجانین. دوای وردبوونەوەی تەواو و دڵنیایی لەوەی ئەوە ئەو سوارانەن وا بۆ یارمەتی فەرمانفەرما دێن، گەڕامەوە شاری و چوومە لای فەرمانفەرما و پێم گوت: قوربان ئەوانە ئەو سوارانەن کە بۆ یارمەتیدانی حەزرەتی ئەشرەف دێن و باروبنە و ئازووخەشیان پێیە، و لە لایەن عەشیرەتە دژ بەرەکانەوە دەورە دراون. فەرمانفەرما بەبیستنی ئەو خەبەرە زۆر گەشایەوە و لە خۆشییان ماچی کردم و چوار سکەی ئەشرەفی زێڕ و دووسەت فیشەکی ئینعام پێ دام. میرزا کەریم کوڕی قازی لەتیف بەر لەمن گەیشتبووەوە و بەفەرمانفەرمای گوتبوو ئەوانەی دێن سوارەی دوژمنن و تەمایان هێرشە و بۆ داگیرکردنی شاری دێن.

کاتێک فەرمانفەرما بەوەی زانی، زۆری سەرکۆنەی میرزا کەریم کرد و گوتی: ئەگەر کوڕی قازی لەتیف نەبوویای، هەر لێرە زگتم هەڵدەدری، چۆن خەبەری درۆ بۆ من دێنی؟ ئەگەر بەکاتی خۆی زانیبام ئەو سوارانە بۆ یارمەتیی من هاتوون، لە شارییەوە بۆ بەدەنگەوە چوونیان خەڵکم دەنارد و ڕێگام نەدەدا ئازووخە و چەکوچۆڵیان تاڵان بکرێ و خۆشیان پەراگەندە بن.

دوای چەند ڕۆژ لە لایەن دەوڵەتی ئێرانەوە فەرمان درا بەفەرمانفەرما ساباڵغ بەجێ بهێڵێ. عەسکەرە عوسمانییەکان هەتا نزیک میاندواو لەگەڵ فەرمانفەرما چوون بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەر دەستدرێژی عەشیرەتەکان. دوای ئەوەی فەرمانفەرما ساباڵغی بەجێ هێشت، فەریق پادشا هات بۆ نێو ساباڵغێ، بەڵام مانەوەی وی چەند ڕۆژێک زیاتری نەخایاند، چونکو بەدوای ئیعتیرازی ئێران و دەستپێکردنی وتووێژ لە نێوان هەر دووک دەوڵەتەکاندا، لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە فەرمانی پاشەکشەی هێزەکانی و لەوانە کشانەوە لە ساباڵغ بە فەریق پادشاب درا. نێوبراو لە یەکەمی ڕەشەمەی ساڵی ١٢٨٦ی کۆچی هەتاوی شاری ساباڵغی بەجێ هێشت. دواتر لە لایەن دەوڵەتگەلی ئێران و عوسمانییەوە چەندین دەستە بۆ دیاریکردنی سنوور و نیشانەکردنی هەڵبژێردران و گشت سەر زەوی ئێران لە لایەن عەسکەرەکانی عوسمانییەوە چۆل کران.

چەند ساڵ دواتر، شەڕی یەکەمی دنیاگرەوە دەستی پێ کرد. نووسەر ڕەوتی ئەو شەڕە و کاردانەوەکانیم لە کوردستان، بەتایبەتی لە سەر سابڵاغ، لە باسی شەرحی حاڵی خودالێخۆشبوو قازی فەتاحدا نووسی (مەبەست لەم کتێبەی ئێستایە)، و گوتم کە میرزا فەتاحی قازی بەدەستی ڕووسەکان شەهید کرا و قازی لەتیف و برازایەکانی قازی مونعیم (کوڕی قازی وەهاب) و عەبدولڕەحمان ناسراو بەسالاری موکری و مەلا محەمەد و میرزا مەحموود و میرزا ئەحمەد(کوڕانی قازی فەتاح) بەدەست ڕووسە قەیسەرییەکان وەکو خەتاکاری سیاسی (لایەنگری لە دەوڵەتی عوسمانی) گیران و دوورخرانەوە بۆ خاکی ڕووسیە. ئەوانە دوای بەمانگان یەخسیری و وەخۆکردنی دەرد و کوڵێکی زۆر کاتێک لەوێ شۆڕشی کۆمۆنیستی قەوما، بەحاڵێکی شپرزە و خەفەتاوییەوە هاتنەوە ئێرانێ، بەڵام قازی لەتیف بەڕێگای لەهیستان و ئاڵماندا چووبوو بۆ لای کوڕەکەی دوکتور مستەفای شەوقی لە ئەستەنبووڵ. نێوبراو دوای چەند ڕۆژ سەرگەردانی لە حاڵێکدا نەخۆش بووە و برینی لە زگیدا بووە، کوڕەکەی دوکتور مستەفای شەوقی (خاڵی نووسەر) دەبینێتەوە. دوکتور شەوقی گورج دەست دەکا بەتەداویکردنی و هاوکات قازی لەتیف لەوێ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە ڕێزی لێ دەگیرێ و میوانداری لێ دەکرێ و بۆ ماوەیەکی درێژ لە یەکێک لە هۆتێلە دەرەجە یەکەکانی ئەستەنبووڵ میوانی دەوڵەتی عوسمانی دەبێ.

قازی لەتیف دوای بڕانەوەی شەڕ و دامەزرانەوەی ئاشتی، لەگەڵ کوڕەکەی دوکتور مستەفای شەوقی کە هێشتا خوێندنی لە زانستی پزیشکیدا تەواو نەبووبوو، گەڕاوە ئێرانێ. خودالێخۆشبوو دوکتور شەوقی ماوەیەک لە سابڵاغێ بوو و دوایە بۆ بەردەوامی خوێندن دیسان گەڕاوە ئەستەنبووڵ. خودالێخۆشبوو دوکتور شەوقی لە شەڕی دنیاگرەوەی یەکەمدا دڵخوازانە لەگەڵ قشوونی ترکییە کەوت و دەرەجەی (سەروانی) یان پێ دا و لەبەر ئەو فیداکارییانەی کردبووی، دەوڵەتی عوسمانی بەڕێزیانی بۆ ماوەی دووساڵ بەمەبەستی تەواوکردنی خوێندن نارد بۆ ئەڵمان (لە ئۆتۆبیوگرافییەکی کورتدا کە دوکتور شەوقی (دوکتور مستەفای قازی) بەزمانی ئینگلیزی نووسیویە و لە ژمارەی ٢ی ساڵی ١٥ی گۆواری The Kurdistan Missionary، لە مانگی فێوریەی ساڵی ١٩٢٣ی، لاپەڕەی ٢٦ و ٢٧دا بڵاو کراوەتەوە، هیچ باسی ئەوەی نەکردووە لەگەڵ قشوونی تورکییە کەوتبێ، بڕوانە خوارەوەتر- وەرگێڕی کوردی). نێوبراو لە ئاڵمان توانیی لە نەخۆشییەکانی هەناو و منداڵاندا پلەی پسپۆڕی وەربگرێ و ماوەی چەندین ساڵ لە ترکییە وەکو سەرۆکی ئیدرارەی لەشساخی لە ئەستانەکانی وڵات وەک حەسار! (دینار)و وان و جێی دی خەریکی

کاری پزیشکی بوو.

دوکتور شەوقی لە ساڵی.... (بابم ساڵی گەڕانەوەی دوکتور شەوقیی بۆ ساباڵغێی باس نەکردووە و جێیەکەی بە بەتاڵی هێشتووەتەوە – بژارکار قادری فەتاحیی قازی)، (تێبینیی وەرگێڕی کوردی، لە نامەیەکدا کە سەیفولقوزات لە تەوریزەوە لە بەرواری ۱۲-۱۲ – ۱۳۱۰ هەتاوی(۳- ۳ – ۱۹۳۲ ی زاینی) بۆ شەهید محەمەد حوسێنی سەیفی قازیی کوڕی لە گوێگجەلی نووسیوە، باسی هاتنەوەی دوکتور قازیزادە دیاری دەکا.- وەرگێڕی کوردی) گەڕاوە زێدی خۆی مهاباد و دوای دووساڵ مانەوە لە ساباڵغ و کردنەوەی مەتەب و خزمەتی شیاوی پزیشکی بەهاونیشتمانانی لەبەرئەوەی کچەکانی لە خوێندنگە بەرزەکانی ترکییە لە ئەستەنبووڵ خەریکی خوێندن بوون و هاوسەریشی کە خەڵکی ترکییە و لە بنەماڵەیەکی ناسراو بوو، ئامادە نەبوو بێتە ئێران، بۆیە خودالێخۆشبوو دوکتور شەوقی ناچار بوو بگەڕێتەوە ترکییە. پێوەندیی دوکتور شەوقی لەگەڵ ئەندامانی بنەماڵەی لە مهاباد بەردەوام بوو، بەڵام لە دوای دەستپێکردنی شەڕی دووەمی دنیاگرەوە پێوەندیی نامەیی ئەو پچڕا. بەپێی قسەی ڕێبوارێک کە لە ترکییەوە هاتبوو دەرکەوت بەڕێزیان لە ساڵی ۱۳۲۹ی هەتاوی بەنەخۆشیی سەکتەی دڵ ماڵاواییی لە ژیان کردووە، جارێ لە وەزعی خاووخێزان و چەند و چۆنی ئەوان کەمترین زانیاریی نییە.

قازی لەتیف لە دوای ڕزگاربوونی لە یەخسیری ڕووسە قەیسەرییەکان و گەڕانەوەی بۆ ساباڵغ بۆ ماوەیەکی درێژ بەخۆشی و ئاسوودەیی دەژیا تا ئەوەی کە لە ساڵی ۱۳٤۰ی کۆچی قەمەری، (۱۹۲۱)ی زاینی، کاتێک سمایل ئاغای شکاک هێرشی کردە سەر ساباڵغ، لە ماڵی خۆیدا بەدەستی یەکێک لە تاکوتەرای سمایل ئاغا کوژراو لە بەرئەوەی پێشتر وەسییەتی کردبوو ئەگەر مرد مەیتەکەی لە خانەقای شێخی بورهان بنێژن، کوڕەکەی میرزا کەریم وەسییەتی ویی بەجێ هێنا و تەرمی وی برا خانەقا و لە تەنیشت ئارامگەی سەیدی نوورانی بەخاک ئەسپێردرا.

(سالهای اظطراب، خاطرات خلیل فتاح قاضی، لاپەڕەی ۲٥ تا ۳٥)

# شێعرێکی قازی لەتیف لە گۆواری (ژین)دا

حەسەنی قازی

گۆواری (ژین) وەکو ئۆرگانی نارەسمیی "کۆمەڵەی پێشکەوتنی کورد" لە نێوان ٧ / ١١ / ١٩١٨ تا ١٩١٩/١٠/٢

لە ئەستەنبووڵ بەزمانی کوردی - تورکی دەرکەوتووە و ٢٥ ژمارەی لێ بڵاو کراوەتەوە. لەو گۆوارەدا 'غەزەل' ێکی قازی لەتیف و پێنج هۆنراوە و دوو پەخشانی مستەفای قازی بڵاو کراونەتەوە. ئەو شێعرەی قازی لەتیف لە ژمارەی ٧ی ئەم گۆوارە (٢ی کانوونی سانی ١٣٣٤ = ٢/١٢/ ١٩١٨)دا چاپ کراوە و دەبێ ئەو هەر ئەو سەروبەندە بێ کە دوای رزگاربوونی لە یەخسیریی رووسە قەیسەرییەکان رووی لە ئەستەنبووڵ کردووە. لە نێوەرۆکی شێعرەکە را دەردەکەوێ قازی لەتیف لە ماوەی مانەوەی لە ئەستەنبووڵدا پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ تێکۆشەرانی کورد و لەوانە شێخ عەبدولقادری نەهری، مەلا سەعیدی بەدیعوزەمانی نوورسی هەبووە و تەنانەت ئامادەیی ئەوەی دەربڕیوە لە نێو کوردی ئێراندا کار بۆ ئامانجەکانی 'کۆمەڵەی پێشکەوتنی کورد' بکا.

سەید عەبدولقادر کوڕی بچووکتری شێخ عوبەیدیلای نەهری، لەگەڵ باوکی دوورخرانەوە بۆ مەککە و تا کودەتای ترکییە گەنجەکان لە ساڵی ١٩٠٨ لەوێ ماوەتەوە و لەو ساڵەدا هاتووەتەوە ترکییە و لە ئەستەنبووڵ دامەزراوە و یەکێک لە سەرۆکە ناسراوەکانی 'کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد' ئەو یەکەم کۆمەڵەی کوردی بووە کە هەمان ساڵ واتە ١٩٠٨ لە ئەستەنبووڵ دامەزراوە و لە هەمان کاتدا سەرۆکی شوورای دەوڵەت، واتە مەجلیسی ئەعیانی عوسمانی بووە. لە دوای وەفاتی برا گەورەکەی شێخ محەمەد سدیق بۆ ماوەیەکی کورت گەڕاوەتەوە نەهری. بەدوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا کاتێک بیری دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەیی خۆ، لە لایەن سەرۆک کۆماری ئەمریکا ویلسۆنەوە هاتە گۆڕێ، ئەوە لە نێو نوخبەی دەستە جۆربەجۆرە ئێتنیکییەکانی هەموو ئیمپراتۆری

عـوسـمـانیـدا دەنگی دایەوە و ئەوجـار کـۆمـەڵەیەکی کـوردیی دی بەنێـوی " کـۆمـەڵەی پێشکەوتنی کورد" بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدولقادر دامەزرا کە زۆر لە کۆمەڵەکەی پێشوو چالاکتر بوو و زنجیرەیەکی زۆر چالاکیی فەرهەنگی و پەروەردەیی بەڕێوە برد. ئەندامەکانی بیروڕای جیاوازیان هەبوو، هێندێکیان بیریان لە سەربەخۆییی کوردستان دەکردەوە، بەڵام شـێخ عـەبدولقادر سـەرۆکـایەتیی ئەو باڵەی دەکرد کـە لایەنگری هەبوونی دەرەجـەیەک لە حوکـمی خـۆیی بۆ کوردان بوو و لە بەر هۆی ئاینی و لە سـونگەی دیکە دژی جـوێبـوونەوە بوون لەوەی لە پاشماوەی ئیمپراتۆریی عوسمانی مابووەوە.

بەدوای سەرکەوتنی یەکجارەکیی کەمالیستەکان، شێخ عەبدولقادر بەپێچەوانەی ئەو باڵە جودایخوازەی کورد کە زۆربەی ئەندامـەکانی هەڵاتن بۆ هـەندەران لە ئەستەنبووڵ مایەوە و ئەوەش بەلە دەسـتـدانی ژیانی خـۆی و کـوڕە گـەورەکـەی مـحـەمـەد تەواو بوو. بەدوای سەرکوتکرانی یەکەم سەرهەڵدانی گەورەی کوردان لە کۆماری تورکییدا واتە جـووڵانەوەی شێخ سـەعیدی پیران لە ساڵی ١٩٢٥، شێخ عەبدولقادر و کوڕەکەی محەمەد هـەردووکیان لە سێدارە دران، ئەگـەرچی وا وێ دەچێ هێچ پێوەندییەکیان بەو جـووڵانەوەیەوە نەبووبێ. (مـارتین ڤـان براونێسن: ساداتـی نەهری یان گـەیلانیـزادەکـانی کـوردسـتـانی نێـوەندی، کۆکراوەی وتـاران، مەلاکان، سۆفییـەکان و خـواردینیان: دەوری دین لە کۆمـەڵی کـوردیدا' Isis پرێس، ئەستەنبووڵ ساڵی ٢٠٠٠، بەزمانی ئینگلیسـی، لاپەڕەی ٢٠٥)

وەک بەڕێز خـەلیلی فـەتاحی قـازی ئامـاژەی پێ کـردووە، قـازی لەتیف، دوای مـاوەیەک دەگـەڕێتـەوە سـابڵاغ و لە کـاتی هێـرشـی سـمـایل ئاغـای سمکۆ بۆ سـەر سـابـڵاغ لە سـاڵی ١٩٢١دا بەناحەق دەکوژرێ.

گۆواری ژین، عەدەد ٧، ٢ی کانوونی سانی ١٣٣٤

ژمارەی ٧، ٢/ ١٢ / ١٩١٨ی زاینی

غەزەل

شـاعـیـری کـوردان! مـەکـەن بەحـسـی عـوزار و زولفی یار
بەحـسی بەحـسـێکی بکەن بۆ کـورد لەمـەوپاش بێـتـە کـار!

تـایفـەی کـوردان لە گــورج و ئـەرمـەنسـتـان زۆرتـرە
حـاکـمی خـۆیان نەبوو نێـویان نـەهاتـە نـاو شـومـار!

تایفـــەی جـــاف، ســـەیدی بەرزنجـــە، شـــێـــخی تاڵەبان
ســـەد هەزار نەفـــســـیـــان هەیە، بۆ دین و دونیـــا زۆر بەکـــار

ســـاحـــێـــبی قـــۆناغ و ســـفـــرە، ســـاحـــێبی ئینعـــام و خـــوان
مـــــاڵی وان مـــــەئوایە بۆ ئیـــســـــــلام و بۆ تورک و تەتار

مـــەعـــدەن و کـــانی کـــەرەم کـــوردە، شـــەجـــاعـــەت ئیـــرســـیـــان
ئاســـمـــانی مـــەکـــرەمـــەت، بەحـــری ســـەخـــا، عـــەینی ویقـــار

ڕۆســـتـــەمی گـــورد کـــورد بوو، بەرمـــەکی کـــورد و مـــوعنی زائد
کورد بوو، نێوی وانە وا هەمـوو سەبتە لە سـەفـحـەی ڕووزگار

بیلخـسـووس شـاعـیـر لەوان، بەنـدە کـەمێ تێـعـداد بکەم:
مـــســـتـــەفـــا بەگ، شـــێخ ڕەزا، نالی، وەفـــایی چاوی مـــار

عـــالم و عـــەلامـــە ئەغـــڵـــەب قـــەومی کـــوردی بوون وەکـــو:
ســـەعـــدی تەفـــتـــازانی و ســـەید شـــەریف، مـــەلای حـــەکـــار

حـــــەزرەتی مـــــوفـــــتی زەهـاوی، زوو لـە بـەغـــدایە دەبوو
عـــالەمی ئیـــســـــلام بەفـــەزل و عـــیلمی وی گـــرتی قـــەرار

حـــەیدەری زادە جـــەنابی شـــێـــخـــولئـــیـــســـلامی ئەنام
یەعنی ئیـــبـــراهیم ئەفـــەندی قـــوتبـــە بۆ جـــەمـــعی کـــیـــبـــار

کـــانی عـــیلم و ڕۆژی دانیش، گـــەوهەری بەحـــری وجـــوود
جـــوود بەخـــشـــینی بە خـــەروار، فـــەزل و ئیـحـــســـانی بە بار

زاتی وەک شـــێخ قـــادری تەشـــــریفی ئەورۆ لێـــرەیە
جـــــوزئی ئەعـــــیـــــانانە، لاکین کـــولە بۆ کـــوردی هـەزار

بەحری عیرفان، عەینی ئیحسان، سەدری دیوان، فەخری دین
نوتفـــەیی تاهایی وەیسن ئەرجـــومـــەندی زی ویقـــــار

شەخسی وەک عەبدولسەمەد، مەلایی کەرکووکی، خودا
عومری پێ دا، موستەحەقە کورد بەئەو کەن ئیفتیخار

لەو زەمانەی هاتە ئێرە قەت لە من غافڵ نەبوو
لوتف و ئیحسانی دەگەڵ من بوو هەموو ڕووژێ هەزار

کە دەهات حاڵی دەپرسیم، دەفعی غەمی لێمی دەگرت
کە دەچوومە مەنزڵی بۆ خواردنی شام و نەهار

سەد هەزار ڕەحمەت لە ئەم باوکە، کە وی تەعلیم کرد
سەد هەزار ڕەحمەت لە ئەم دایکە کەوی هێنایە کار

خۆ خسووس مەلا سەعیدی کورد لە ئیسلامبوولێیە
خۆی بەدیعی ڕووی زەمانە ئەو مەلای والاتەبار

چاکە ئەو زاتانە ئەورۆ فورسەتە هیمەمەت بکەن
مەجلیسێکی مونعەقید کەن تا نەبێ کورد تارومار

هەرکەسێ تابیع نەبێ بەو مەجلیسە من زامنم
پاش عوقووباتێکی زۆر دەیهێنم و دەی دەم لە دار

خۆ ئەگەر بێتو ئەمن ڕاهی بکەن بۆ مولکی خۆم
کوردی ئێرانیش هەموو سەف سەف دەکەم هەر وەک قەتار

هەر چلۆنێ ڕەئی مەجلیس بێ وەهایان پێ دەڵێم
سەد هەزاران بایعین بۆ ئەمری ئەو پیری هەژار

ئەی لەتیف حەیفە کە تۆ لێرە غەریب و بێ کەسی
وەرنە بۆ ئەم مەسئەلە فەردی وەکو قوتبی مەدار

قازی لەتیف

# دوکتور مستەفای قازی (قازی زادە - شەوقی)

حەسەنی قازی

مستەفای قازی کوڕی بچووکی قازیی لەتیف، وەکو خۆی لەو بیوگرافییەیدا بەزمانی ئینگلیزی بۆ Kurdistan Missionary ناردووە، باس دەکا لە ساڵی ١٨٩٦ لە سابلاغ لە دایک بووە. لە ساڵی ١٩١١ هاتووتە کۆنستانتینۆپل ئەستەنبوول و لە ساڵی ١٩١٣ لەوێ خوێندنی لیسەی (ئامادەیی)ی تەواو کردووە. هەر لەو ساڵەدا چووە بۆ ئاڵمان و تا ساڵی ١٩١٦ لەوێ ماوەتەوە و بەنیاز بووە لەوێ لە بەشی پزیشکیدا درێژە بەخوێندن بدا. جەوادی قازی (دوکتور جەوادی قازی دواتر کە لە ساڵی ١٩٠٣ لەگەڵ زمانزانی ئاڵمانی ئۆسکارمان بۆ خوێندن چووە بۆ ئاڵمان) ئامۆزای لە مانگی ئاوریلی ساڵی ١٩١٣ لە ژێنێڤرا نامەیەکی بۆ ناردووە بۆ بێرلین (بڕوانە بەڵگەنامەکان) و ئەوە دەبێ لە سەرەتای چوونی شەوقی بۆ ئەوێ بووبێ. وا دیارە شەوقی لە بەر نەبوونی دەرەتانی ماڵی، نەیتوانیوە لە ئاڵمان درێژە بەخوێندن بدا. لە شێعرێکیدا بەنێوی " فریاد " کە " بە موناسەبەتی قەتڵی عامی ڕووسان لە سابلاغێ" لە ساڵی ١٣٣٢ (١٩١٦ی زاینی) لە مووسڵ نووسیویە و لە ژمارەی ٣ی گۆواری ژین لە ئەستەنبووڵ بڵاو کراوەتەوە (٢٠ی تشرینی سانی ١٣٣٤ / ١٩١٨،١١،٢٠) دەردەکەوێ، لەو سەروبەندیدا بەر لە درێژەدان بەخوێندن لە ئەستەنبووڵ سەری کوردستانی داوەتەوە. ڕەحمەتی یای ئاگوستا گودهارت یەکێک لە میسیونێرەکانی شارۆمەندی ئەمریکا و دۆستێکی گەورەی گەلی کورد کە لەبەر شەڕ ناچاربوون سابلاغ بەجێ بهێڵن لە نامەیەکدا کە لە ئەستەنبووڵەوە لە ٢١ی ژانڤیەی ١٩٢١ بۆ نێوەندی میسیۆنەکەیان لە ئەمریکای ناردووە، دەنووسێ: " ئەمن کوردێکی خەڵکی سابلاغ، میرزا مستەفای کوڕی قازی لەتیفم دیوەتەوە. ئەم پیاوە گەنجە لێرە پزیشکی دەخوێنێ. ئەو لە سێپتامبری ١٩٢٠دا لە سابلاغەوە هاتووەتەوە ئێرە و باسی زۆر خەفەتاوی سەبارەت بەو خەڵکەی کە ئێمە لە ساڵی ١٩١١وە زۆر چاکیان دەناسین بۆ من گێڕاوەتەوە...... (کوردستان میشنێری، ساڵی ١٣، ژمارەی ٣، مارسی ١٩٢١) " ئەمەش لە دووی قسەی: بەڕێز خەلیلی فەتاحی دەدا کە دەڵێ شەوقی ئەودەمی لەگەڵ بابی بۆ ماوەیەک چووەتەوە

سابلاغێ.

له ساڵی ١٩١٩ لەگەڵ کچێکی تورکی خەڵکی سالۆنیک، ژیانی هاوسەریی پێک هێناوه و لەماوەی سالانی ١٩١٨ - ١٩١٩دا بەدەم خوێندن له کالێجی پزیشکیی ئەستەنبووڵ پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ " کۆمەڵەی پێشکەوتنی کورد" هەبووه و له گۆواری "ژین" ئۆرگانی نارەسمیی ئەو کۆمەڵەیەدا چەندین شێعر و پەخشانی بلاو کردووەتەوه.

بەرلەوەی بۆ خوێندن ڕوو له دەرەوەی ولات بکا له سابلاغ لەگەڵ میسیۆنێره لووتێرییەکان و لەوانه، لویس ئولسن فاسوم، پێوەندیی نزیکی هەبووه و وەک خۆی له نامەکانیدا که له Kurdistan Missionaryدا چاپ کراون، باس دەکا یارمەتیی ڕەحمەتی فاسوومی داوه بۆ لێکۆڵینەوه له سەر شێوەزاری کوردیی موکری. له نێوان سالانی١٩٢١ - ١٩٢٣دا پێوەندیی نامەییی بەردەوامی لەگەڵ نێوەندی میسیۆنی ڕۆژهەلاتی لوتێری له ئەمریکادا هەبووه و له ژمارەکانی ٣، مارسی ١٩٢١، ژمارەی ٢، فێڤریەی ١٩٢٢، ژمارەی ٤، ئاوریلی ١٩٢٢، ژمارەی ٨، ئووتی ١٩٢٢، ژمارەی ٢، فێڤرییەی ١٩٢٣، ژمارەی ٨، ئووتی ١٩٢٣، ژمارەی ١٠، ئۆکتۆبری ١٩٢٣ی Kurdistan Missionaryدا چەندین نامه و دەنگوباس لەمەڕ وی بلاو کراونەتەوه و بەپێی ئەو نامانه دەردەکەوێ له کۆتاییەکانی خوێندنیدا، ئەوان یارمەتیی مالییان پێ کردووه. هەر بەپێی نووسینی خۆی له یەکێک لەو نامانەدا له یەکی سێپتامبری سالی ١٩٢٢ خوێندنی تەواو کردووه و له نەخۆشخانەی ئێرانی له ئەستەنبووڵ وەکو ئینتێرن دامەزراوه. ئەگەرچی لەو نامانەی لەگەڵ نێوەندی میسیۆنەکه له ئەمریکا ئالوگۆڕی کردووه باسی ئەوه هاتووه بۆ کارکردن لەگەڵ میسیۆنێرەکان و خزمەتی پزیشکی دەگەڕێتەوه سابلاغ، بەلام ئەوه بەتەواوی ڕوون نابێتەوه ئەو سەروبەندی گەڕاوەتەوه یان نا؟

له ١٦ی ژووەنی ١٩٢٣ ژنی یەکەمی کۆچی دوایی کردووه و لەو خانمه کچێکی بەنێوی Gealet بۆ بەجێ ماوه.

زۆر وێ دەچێ له سالی ١٩٢٤ بۆ جاری دووەم هاوسەری گرتبێ، چونکو بەورد بوونەوه له نامەیەک که له ٢٠ی رجب المجرب ی ١٣٤٨ی کۆچی مانگی (کۆتاییەکانی سالی ١٩٢٩ زاینی) بۆ خوشکی گەوهەرتاج خانمی قازی (دایکی نەمر خەلیلی فەتاحی قازی) نووسیوه و لەگەڵ ئەو نامەیه وێنەی منداڵەکانی بۆ ناردووەته سابلاغ و نێوی منداڵەکانی تێدا نووسیوه، دەردەکەوێ کچی یەکەمی که لەنامەکەدا بەنەهال باسی دەکا هەر هەمان Gealet

بێ کە لە Kurdistan Missionary زۆرجار باسی لێوەکراوە. دوکتور قازی لەو نامەیەدا بۆ خوشکی دەنووسێ: " ئێستا نەهال تەمەنی ٦ ساڵانە ". هەر لەو نامەیەدا باسی سێ کچی دیکە مەراڵ، ئوێلکەر و گویلبەسەر دەکا و تەمەنیان دەنووسێ. بەڵام لەسەر وێنەیەکی دیکەی هاوسەر و منداڵەکانی نێوی ئایسەل و گون سەل نووسراوە، هەروەها دوو نێوی 'فەرەنگیس' و ' ساوج' هەن کە بەئەگەری زۆر ' فەرەنگیس' دەبێ نێوی هاوسەری بووبێ. ئەو وێنەیەی دووەم، تاریخی ٢٦ی (حوت) ی ١٣١٣ ی لە بن نووسراوە.

ئەو نامەیەی بۆ گەوهەرتاج خانمی خوشکی ناردووە (بڕوانە بەڵگە نامەکان)، لە سەر کاغەزی ڕەسمی نووسراوە لە گۆشەی لای ڕاستی سەرەوەی بەزمانی تورکیی عوسمانی و گۆشەی لای چەپی بەزمانی فەڕانسەیی نووسراوە: " قاضی زادە دوقتور مصطفی شوقی / (Kazi Zade Dr. M. Chévki) و دەردەکەوێ لەوکاتدا لە "دینار" وەکو "حکوومەت تەبیبی" کاری کردووە. دینار ناوچەیەکە لە هەریمی ئەفیۆن.

سەیفولقوزات لە نامەیەکدا بۆ محەمەد حوسێن خانی کوڕی کە لە ١٣١٠/١٢/١٣ (١٩٣٢/٣/٤) لە تەورێزەوە بۆ (گوێگجەلی) نووسیوە باسی هاتنەوەی دوکتور مستەفا قازیزادە شەوقی بەگ دەکا کە هاتووەتەوە وڵات و لەتەورێز چاوی پێی کەوتووە.

زۆر وێ دەچێ ئەوە هەر ئەو سەفەرەی دوایی بێ کە نووسەری ئەم کتێبە هێمای پێ کردووە. بەداخەوە ئیدی ئێمە لە سەر ژیانی دواتری دوکتور قازی هیچ نازانین. لە ساڵی ١٩٩٦ لەگەڵ مامۆستای بەڕێز دوکتور ئەمیری حەسەنپوور بەبۆنەی سەد ساڵەی لەدایکبوونی دوکتور مستەفای قازی باسێکمان بەنێوی " بەسەرهاتی مستەفای قازی" بەپێی هێندێک لە ژمارەکانی Kurdistan Missionary بڵاو کردەوە (گۆواری گزینگ، ژمارەی ١٤، زستانی ١٩٩٦، سوێد، لاپەڕەی ٤١ تا ٤٦) لە وێدا نووسیبوومان: " ئێستا چەند ساڵێکە لە شاری بۆنی ئاڵمان خانمێک کە تورک زمانە و لەگەڵ چەند کەسێک لە بنەماڵەی قازی، ناسیاوی و هاتوچۆی هەیە، خۆی بەنەوە یان نەتیجەی دوکتور شەوقی دا دەنێ"، بەداخەوە دوایە دەرکەوت ئەو بۆچوونە ڕاست نەبووە، ئەگەر ئەو هێمایەی نووسەری ئەم کتێبەکردوویە: " بەپێی قسەی ڕێبوارێک کە لە ترکییە هاتبووەوە دەرکەوت کە دوکتور لە ساڵی ١٣٢٩ی هەتاوی (١٩٥٠ی زاینی) بەسەکتەی دڵ مردووە" بکەینە پێوەر دوکتور قازی زادە لە تەمەنی ٥٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

ئەوەی بۆ من جێگای پرسیارە ئەوەیە بۆچی لە گەرمەی خەباتی کۆمەڵەی (ژێکاف)

پێکهاتنی حیزبی دیمۆکرات و کۆماری کوردستاندا هیچ ڕچەیەک لە دوکتور شەوقی بەدی ناکەین ؟، ئەوەش لەبەر نووسینەکانی خۆی دەڵێم. بۆچی دواتر براکەی میرزا کەریمی یەمینولقوزات، خوشکەکانی و برازاکەی، قەیسەرخانم و خوارزاکانی، نەمران میرزا خەلیلی فەتاحی قازی و سەرهەنگ حەسەنی فەتاحیی قازی و براکانی تریان و ئاغایانی دارەلەکێ کە ئەوانیش خوارزای بوون، هیچ سەرو سۆراغێکیان لە خاڵیان نەکردووە؟ یان بۆچی کچەکانی دوکتور قازی قەت نەیانویستووە، خەبەرێک لە خزمەکانی بابیان بزانن؟ حەولدانی نووسەری ئەم دێڕانە بۆ دیتنەوەی تۆرەمەی دوکتور مستەفای قازی بەردەوامە.

بەشێعر و نووسینەکانی مستەفا قازی لە گۆواری (ژین)دا و ئەو نامانەی بەزمانی ئینگلیزی لەگەڵ ناوەندی The Luthran Orient Mission Society لە ئەمریکا ئاڵوگۆڕی کردووە دەردەکەوێ، چەندە مرۆیەکی خۆشفکر و پێشکەوتوو بووە و ئاواتی بووە ڕۆژێک لەگەڵ هاوسەری یەکەمی کە ئەویش هەرپزیشکیی تەواو کردووە، بەڵام جوانە مەرگ بووە، یارمەتی "ژنی کورد" بدا.

ڕەنگە ئەو پەخشانانەی مستەفا قازی کە لە گۆواری (ژین)دا بلاو بوونەتەوە لەگەڵ ئەو بابەتانەی نەمر فاسووم بەشێوەزاری کوردی موکری لە ئەمریکا چاپی کردوون، یەکەم پەخشانی چاپکراوبن بەو شێوەزارەی کوردی. بەراوردکردنی ئەو پەخشانانە کە نزیکەی ٩٠ ساڵ لەمەوپێش نووسراون لەگەڵ زمانی نووسینی ئەم ڕۆژگارە سەرچاوەیەکی گرینگن بۆ سەرەدەرکردن لەو پێشوەچوونانەی لەودەمییەوە تا ئێستا لە نووسینی ئەو شێوەزارەی کوردیدا پێک هاتووە. ئەم نووسینە بە شێعرێک، پەخشانەکانی دوکتور قازی لە گۆواری " ژین"دا و وەرگێڕاوی بەسەرهاتی ژیانی لە Kurdistan Missionaryدا تا سەردەمی تەواوکردنی خوێندنی دادەکوژێنین.

## له بۆ کوردان

گۆواری ژین، عەدەد ١٤، ١٥ی مارتی ١٣٣٥
ژمارەی ١٤، ١٥/ ٣ / ١٩١٩

له مـڵکی کـوردەکـان ئەورۆ تەپومـژ، هێندە پەیدا بوو
دەڵێی مـەحـشـەری خـێـزانە، یا لە ڕۆژئاوا، خـۆر ئـاوا بوو

کـە پووری بێکەس و خـوشـکی هەتیـوت چاو بەفـرمـێـسکن،
کـە مـاڵی باب و باپیـرت سـەراپا چۆڵ و ڕووخـابوو

تەمـاشـای دەزگـیـرانت کـە بەکـێـردی دوشـمـنی نامـەرد
دڕابوو دامـەنی پاکی و بەهـیـجـران قـەلبی سـووتابوو

لە ژێر زنجـیـری زوڵـم و بەندی ئێـخـسـیـری چ مـەحـزوونە
تەمـاشـای دایکی مـەحبووبت بکە چۆن دەست بەسـترا بوو

کـە مـڵکی مـوکـریان(١) و شـاری سـابـڵاغ بێ تۆ خـاپووره
لە سەر قەبری جەوانان چاوی نێرگس غەرق دە خوێندا بوو

سـەراپا مـەوتەنی ئەجدادی پێشـووت جا تەمـاشـا کـە !
لەبۆچ ڕووخـاوە، بۆچ سـووتاوە، کـاکت بۆچی خنکابوو؟

تەمـاشـاکـە کـە کـانی قـوڵقـوڵاغێ(٢) سـوور و سـووراوە
ئەوە گـەرمـە برینی کـاکـتـە، چون لێـرە کـوژرابوو

---

١– موکری: ایران کوردستاننکی آزربایجان قسمیدر، مرکزی (سابلاّغ) ساوجبلاق شهریدر
٢– ساوجبلاق شهری جوارنده سغوق پنارلاریله معروف بیوک بیر شاهیکه در.

له مـلکی خـۆشـەویسـتی تۆ، دەخـوێنـێ کـوند سـبـەینان زوو
"کە ئـەی کوردی فەقیر تاکەی دەنووی هـەسـتە چ قەومـابوو؟"

لـەبـۆچـی تۆ دەنـووی و خـــــــەلـقـی بێـگانـه بـه چالاکـی
ببـەسـتن دەسـتـی پڕ زوورت مـەگـەر مـەردانەگـیت وابوو ؟

له نێـو کـوردان کـەسـێک مـلکی نەبێ، خـۆ نۆکـەرە بێ شک
له سـەر خـەڵقـی، له بەر مـلکە، کە ئەمـری ئێـوە موجـرا بوو

بەبێ مـلکی وەتەن ئەی قـەومـی کـوردی لێت یەقین بێ، تۆش!
به ئێـخسـیری و زەلیلی سـەر دەبەی عـومرێک کە بۆت مـابوو

دەگـەڵ شـــەوقی وەرن! ئـەورۆ هـەتـاکـو فـورسـەتوو مـاوە
بەعـیلم و مـەعـریفـەت تێـراو بکەن مـەوتـەن کـە ڕووخـابوو.

قازیزادە

م. شەوقی

# وەزعییەتی ئێمەی کوردان دە عەسری حازردا

گۆواری ژین، عەدەد ٣، ٢٨ی تشرینی سانی ١٣٣٤
(٢٨ / ١١ / ١٩١٨)

ئەوێستا کە دە عالەمدا ئەساسی عورف و عادەتی کۆنە، بە تەرەقی زەمانە و پێشکەوتنی عولووم و فنوونی تازە، کە هەر یێکێک لەوان خاریقولعادە فکری ئینسانیان ئیشغاڵ کردووە، سەبرە سەبرە تەکامولی کرد و لە بۆ سەعادەتی بەنی بەشەر، عالەمان لە هەموو قووەت و تەئسیراتی تەبیعییە، بەنەوعێکی موحەیرولعوقوول ڕێگای ئیستیراحەتی ئینسانیان تەئمین کردووە.

بەڵێ، بەس لە بۆ ئیستیراحەتی ئینسانان بوو کە ڕێی ئاسن (شوێمەندوێفێر) و کەشتیی بوخاری لە پاش ئەو هەموو مەشەقەت و دەردی سەرییە ئیجاد کرا؛ بەواسیتەی وی ڕێگای دوور نزیک بوو، مەشەقەتی زەمانی قەدیم کە دەبوویایە بە پشتی ولاغی بگەڕێی، بەتەواوی لە دنیایە - غەیری مەملەکەتی بەدبەختی ئێمە نەبێ هەڵگیرا، و بۆی مومکین بوو کە خانەوادەی نەوعی ئادەم بە ئاسانی لەگەڵ یەکدی تێکەڵی پەیدا بکەن، و لە جیرانی خۆیان شتی تازە فێر بن و لە شاری یەکدی هاتوچۆیە بکەن و بەو نەوعەی تەجارەتێ بکەن و ماڵی خۆیان ئاوەدان بکەن. لە لایەکی دی هەر ئەو عیلمە وەقتە بوو کە لە بۆ چارەی بەعزە موسیبەتێکی کە دەپێشوودا پەنجەی غەداری خۆی زۆر لای مەملەکەتی خراب کردبوو، چرای چەند هەزار ماڵی کووژاندبۆوە، دەروو و ڕێگایەکی ڕاستی دۆزییەوە و لەبۆ ناخۆشی و دەردەدارییان، عیلمی تەبابەت وەکو پێغەمبەر فەرموویەتی: " لكل داء دواء " دەرمانێکی تازەی دییەوە و لە سەر سەری ئینسانی رەفع کرد. ئینسان دەتوانێ بڵێ کە زۆر موسیبەت و دەردی پێشوو ئەوڕۆ تەواو دەفع کراون.

پەس مەعلوومە بۆمان زەمانی ئێستا خولاسەی سەعی و غیرەت و کەشفیاتی چەند سەد ساڵەیە و ئەو هەموو تەرەقییانە، بەڕەوشەنێکی تازە ژیانێکی دیکەیان پەیدا کردووە و هەموو دنیا، لە تەرزی ئەو ژیانەی بەقەدری ئەوەی کە لازمە ئیستیفادەیان کرد وە، ئەوەبوو

که ئەورۆکە مەدەنییەتی حازرە یا خود مەدەنییەتی عەسری بیستەم، هاتە وجوودێ.

کەوابوو ئینسـان دەتوانێ بڵێ عەسری وێستا خولاسـەی سەعی و تەرەقیی ئەو هەموو ساڵەیە و ئەوان کەسانەی کە ئەوێستا دەژین، دەبانەوێ کە ئاسوودە و مەسعوود بن.

دەگەڵ ئەو هەمـوو پێشرەفتییە، عـەسری حازر لە گەلێک شـتاندا لە دوایە و عیلم و فەن نەیتوانیوە لە ئینسـاناندا بەعزە سـفـەتێکی خراپ هەڵبگرێ. مەسـەلەن حیرس و تەمـەع. ئەوێستا فکری هەمـوو کەس ئەوەیە کە ڕزقی غەیری خۆیان برفێنن و دەڵێن: ئەمن دەخۆم، ئەتۆ مەخۆ !!

لەو خسـووسـەیدا زەمـانی پێشـوو دەگەڵ ئەو هـەموو جەهلەی چاتر بوو، چونکە حیرس ئەوەندە زۆر نەبوو، پیـاوی فەقیـر و میللەتی بێ دەسـتـەڵات دائیمـەن موحافەزە دەکران، بەڵا ئەوێستا وانییە. مەعەلتەئەسوف وەکو دەڵێ: فلک زده و از هر طرف سنگی (فەلەک زەدێ و ئەز هەر تەرەف سـەنگی)، ئەوانە کـە بەزەعیـفی مـان لە هـەموو تەرەفـێکی تەعـەڕوزیان بۆ دەکەن، بەتەمەعی کراسی بەری، دەکوژرێن.

لەبەرئەوەی لازمـە بێ دەسـتـەڵاتان لە بۆ موحـافەزەی حـەیاتی خۆیان زۆرتر تەقـەلای بکەن تاوەکو نەمـرن. لێ لە عەسری حازر ئینسـان یا دەبێ سەعی بکا بژی، یاخود کە بەتـەمبەڵی بمرێ. جا بـەئەو مـولاحـەزە، ئەمن پێم خۆشـە کـەمێک ئەحوالی خـۆمـان تەمـاشـا بکەم، و مـەعـەلـەمنوونییـە دەبینم کە: قـەومی من یەعنی کـوردان، میلەتێکن مـوسـتـەعـید و وەتەن پەروەروە دائیمـەن لە بناغەی تاریخیان هەتا وێستا کە چوارهەزار سـاڵ ڕابردووە و دەگەڵ ئەوەی زۆر قـەومی جـیـرانیـان وەکـو ئاثۆری و بابلی و سـائیـرە کـە مـەحـو بوون و ئەورۆ کەسیان لێ نەماوە، ئەوان بەواسیتەی ئەو حەمییەتە کە هەیانە؛ هەر مـان و هەم وەها مان کە ئینسان ئەورۆ دەتوانێ بڵێ: کوردستان هەیە.

ئەو کوردسـتـانە کە خـەڵکی وی هـەموو عـەشیرەتن، پیاون، (بە) غیرەتن، مـوسـوڵمـانن، ساحێب ناموسن، مەدرەسـە و فەقێیان هەیە، ئەسپ و مـاینی حدوود دەبەخشـێ... فـەقەت چ فـائیدە، ئەورۆ لە دنیای دوور مـاون و لـە فیکری خراپی خـەڵکی کە لە حـەق وانیـان هـەیە تەمـامـەن بێ خـەبەرن... هـەتا وێسـتا چون لە ڕۆژئاوا (مـەغریب، فـەرەنگسـتـان)یە دووربوون ئاگـایان لـە هـیـچ نەبوو وە، وایان دەزانـی کـە وەکـو پێشـوو دەتوانن لە مـاڵی بابیـان ڕاحـەت بمێنن...، بەڵا ئەورۆ و مـەعەلتـەئەسوف زەمانە وا نەمـاوە، جێگامـان خراپە، بەچاکە ناتوانین ڕاوێستین. لە بۆ دەفـعی نامـووسمـان، وەتەنمان مـەجبـوورین کە ئێـمـەش وەکو خـەڵکی

بەغیرەت بین، بەقووەت بین، عیلممان ببێ، بەخەبەربین، وەئیلا دەمرین.

بەڵێ برایەکانی من! ئەمن کوردم و بەوەی فەخر دەکەم، بەڵا چ بکەم زەمانە بەتۆپزی ئیقرارم پێ دەکا کە بڵێم: ئەورۆ قەومی ڕەشی وەحشی ئەفریقای گەرم، بەواسیتەی عیلم و هونەر لە دنیادا جێگایان هەیە، مەکتەبیان هەیە، ڕێی ئاسنیان هەیە، دەوڵەمەندن. بەڵا ئێمە دەگەڵ ئەوەی قەدیمین، ئەسڵمان نەجیبە، بەدبەختین و هێشتا لە مەملەکەتی خۆشی کوردستانێ، (بە) هەچە هەچەی گوێدرێژی دێین و دەڕۆین. لەبەر بێ عیلمی مردوومان بەبێ نوێژی دەمرێ، لەبەر بێ حەکیمی دایکمان لە سەر منداڵی وەفات دەکا.. لەبەر پیسایێ چاومان کوێر دەبێ، لەبەر بێ سەنعەتی چەند پووڵێکی کە بەئەزییەت وەگیرمان دەکەوێ بەخۆڕایی دەیدەین بەخەڵکی..

وە ئەگەر خودا نەخواستە وا دەوام بکا سەروەتمان زایع دەبێ و ملکمان لە دەست دەڕوا و دەبین بەنۆکەر و بەزەلیلی دەمرین. ژنمان فەساد دەکرا، کەڕار جارەی فەساد کرا.

فەقەت لەبۆ ئێوە حەیفە دەگەڵ ئەو شەئن و شۆهرەتەتان وا بەفەقیری ڕاوەستن و بە تەمبەڵی ملکی عەزیزتان لە دەست بدەن. ئەڵبەتە ئێوە کە ساحێب شەرەفن، قسەی من دەگوێ دەگرن. وەرن تا زووە لەبۆ خاتری ئێسکی بابوباپیرانمان ئیتیفاق بکەین و وەتەنی خۆشمان، قوربانیی مەنفەعەتی ڕەزیلە و کورسیی ڕیاسەت نەکەین. چونکە وەقت تەنگە و دوشمن لە غەفڵەتی مە ئیستیفادە دەکا. حەیە عەلەلفەلاح! وەئیلا پەشیمان دەبنەوە و ئیدی ئەو دەمی هیچ فائیدەی نییە.

بعد ازاین گر بسر قبر من آئی تو، چنان می ماند
نوشدارو کە پس از مرگ بە سهراب دهند

قازیزادە م. شەوقی

# وەتەن

گۆواری ژین عەدەد ۱۰، ۲ی شوباتی ۱۳۳۵
ژمارەی ۱۰ (۲ / ۲ / ۱۹۱۹)

لە خیلقەتی حەزرەتی ئادەم، کە ئینسانی حازری، هەموو نەوەی وینە، دنیا وەکو لە کتێبی موقەدەسدا نووسراوە، سەراپا چۆل و دێم و لێرەوار بوو، بەغەیری وەش با و، گورەگورِی رەعد و خورە خورِی چۆم و دەریایان وە، زریوە زریوی داعبایان، شتێکی دی لە سەر ئەو ئەرزە وەسیعە مەوجوود نەبوو، سەراپا چۆل و واحدەلقیهار.

ئەوی دەمێ حەزرەتی ئادەم هاتە سەر ئەو ئەرزە چۆلە و بەموقتەزییاتی ئیرادەی خودای، مەئموور بوو کە بەئەولادی خۆی ئەو سەحرای واسیعەی مەعموور بکاتن ؛ تاوەکو لە ناو زەریتی ویدا هێندێک وەحدانییەتی خودای بزانن، وجوودی وی تەقدیس بکەن. حەدیسی قیدیسی خودا دەفەرموێ: " کنت کنزا مخفیا، فاردت ان اعرف" یەعنی ئەمن وەکو خەزێنەی پێش چاوان ون بووم و کەیفم لێ بوو کە عەبدی من بمناسن. ئاوا بوو کە دنیام خەلق کرد.

جا لەبەر سیری ئیلاهی بەزەمانێکی زۆر کەم، لە دایک و بابێکی، زۆر کەس پەیدا بوون و سەبر سەبر رووی دنیایان داگرت. بەڵا ئەوان وەکو ئێمە خانووبەرە و شاریان نەبوو. جووتیان نەدەزانی، لیباسیان دەبەر دانەبوو، وەکو مەیموونان بەمیوەی داران و رەگی گیایان بەرێ دەچوون. و لەبەر شیدەتی سەرمای زستانێ و گەرمی هاوینێ و وەحشەتی درِندان زۆریان مردن، موتەفەریق بوو(ن) و، ئەگەر ئەو ئینسانە زەعیفانە بەئەو جوورەی مابان و لەبۆ موحافەزەی حەیاتی خۆیان لە قووەی عەقلیان ئیستیفادە نەکردبایە، ئەورۆکە مومکین بوو ئینسانێک لە سەر دنیا نەبێ...

دوماهیک هەیە

م. شەوقی

# وەتەن

گۆواری ژین، عەدەد ١١، ١٥ی شوباتی ١٣٣٥
ژمارەی ١١، (١٥ / ٢ / ١٩١٩)

مابەعد (پاشی)

مەعلووم بوو کە ئەوی دەمێ زەروورەتی ئیحتیاج ئینسانی مەجبوور کرد کە بەخرِی حەتەلمەقدوور لە موقابیلی دوشمنی خاریجی ڕابوەستن و بەکۆمەڵی مودافەعەی خۆیان بکەن، چونکە حەیاتیان لە ژێر تەهلەکەدا بوو. لە دوایە لە مغارە و هاوڵ داراندا وەخرِبوون و عائیلەیان تەشکیل کرد و لە بەرد و دانی (داری) لە بۆ مودافەعەی نەفسیان ئەسلەحەیان دروست کرد و بە ئەو نەوعە مەرتەبەی ئەوەڵی مەدەنییەت پەیدا بوو.

لاکین ئەوەش لە موقابیلی ئیحتیاجاتی ناموتەناهیی ئینسانی کیفایەتی نەدەکرد و شەو و ڕۆژێ ئیحتیاجی ئینسانان ڕووی لە زێدەیی بوو، مەجبوور بوون لە قووەیی عەقلییەیان ئیستیعانە بکەن و، دەفعی ئەو ئیحتیاجانە بکەن وە، ئەوەبوو کە مەعدەنییات کەشف کرا و لیباسیان دروست کرد و حەیواناتی وەحشییە وەکو ئەسپ و گا و گامێشیان گرت و ڕامی خۆیان کرد هەتاوەکو ئیحتیاجی سەفەر و ئیحتیاجی جووتی و خواردن بەوان بتوانن تەئمین بکەن.

ئەوە تەبەقەی دووەمی مەدەنییەتە و، لەو دەورەیەدا حەقیقەتەن عائیلەی بەشەر کەمێک رەفاهی پەیدا کرد. لاکین چونکەئینسان بەتەبیعەت مەجلووبی حیرس و تەمەعن و لەبۆ ئەوەی کە بەئەزێتێکی کەم سەعادەتێکی زۆر پەیدا بکەن، هەڵستان دەستیان کرد بەخرابی و چاویان لە نیعمەتی جیرانی خۆیان بڕی کە تالانی بکەن و ماڵی زۆر پەیدا بکەن و، بەو نەوعە ئینسان لەبۆ جەلبی مەنفەعەت بوون بەدوشمنی یەکتری و دەستیان بەشەڕ و پیاوکوشتنان کرد و بەو نەوعەی حیسی برایەتییان لە فیکر چۆوە. ئەو کەرەتەی ئینسان مەجبوور بوون کە بە موتەفیقی نێعمەتی خۆیان لە موقابیل یەکدی موحافەزە بکەن و ئەوە بوو کە عەشیرەت و ئەقوام پەیدابوون. وا مەعلووم بوو کە ئەو هەموو ئەزییەت و سەعیە لە

بۆ تەئمینی ئیستراحەتیش فەقەت بەدوو تشتان مومکین دەبێ:

١- تەدارەککردنی لەوازماتی حەیاتییە

٢- موحافەزە لە دوشمنی خاریجی

**لەوازماتی حەیاتییەی ئینسانی:** ئێمە ئەوە دەزانین کە ئینسان بەخواردن و پێخەف و لیباس موحتاجە، و ئەوانەش مومکین نابێ کە بەیەکێ بێتە جێ. دەبێ یێکێک خەیات بێ و ئەویدیکەش کەوشدوور یێکێکی دی جووتێر بێ. کەوشدروو لە موقابیلی کەوشی خۆی لە جووتێری دەغڵ بکڕێ و جووتێریش لە موقابیل دەغڵی لە خەیاتی لیباسی بستێنێ، هەتا وەکو نە جووتێر بێ لیباس و خەیات بێ دەغڵ و نە کەوشدروو بێ لیباس بمێنێ و لەوەش تەقسیمی ئەعمال هاتە وجوود. کە دەڵێن ' ئینسان مەدەنیولتەبعە' مەعنای وایە لە بۆ ڕەفعی ئیحتیاجی خۆی دەبێ لە ڕەفیقی خۆی مەزهەری موعاوەنەت بێ و ئەوەش بینائی مەدەنییەتە و پەس...

**موحافەزە لە دوشمنی خاریجی:** ئەوەش دیسان بە پیاوێکی مومکین نابێ، چونکە ئەو بەتەنها نە لە موقابیلی دڕندەی وەکو شێر و پڵینگ و، نە لە موقابیلی دوشمنی بەنی نەوعی، خۆی پێ موحافەزە ناکرێ. جا لەبەرئەوەی مەجبوور بوون کە چەند کەسێک وەخڕ بن و ئەو دوشمنانە دەفع بکەن. بەڵا ئینسان ئەو وەختەی دەتوانن پێکەوە بژین کە ئیرتیبات و تێکەڵییان هەبێ. ئەو تێکەڵییەش بەخزمایەتییە و، یاخود هاوزبانییە، کە ئەویش دەچێتەوە سەر خزمایەتێکە. ئیشەڵلا پیاو کە بۆی مومکین بێ ئەڵبەتە دەگەڵ خزمی خۆی دەژی و قەتعییەن مومکین نابێ کە کورد دەگەڵ عەرەبێکی کە زبانی وی نەزانێ هەتا هەتایە بژی..... وە لەبەرئەوەی بوو کە خزم و ئەقرەبا وەخڕ بوون و لە بۆ ڕەفعی ئەو ئیحتیاجانەی کە عەرزمکردن عەشیرتێکیان دانا و ئەو عەشیرەتەش زۆر بوو، دووعەشیرەت، لە عەشیرەت نیهایەت قەومێکی لێ پەیدا بوو وە دەحەقیقەتدا هەر میللەتێک کە عیبارەتە لە ئەو هەموو عەشیرەتانە خزمی یەکترینن و ئەرازێکی کە لەبۆ خۆیان گرتووە وەتەنی وانە.

چلۆن خانەوادەیەک (یەعنی پیاو و ژنێک) بێ ماڵ ناژی، و عەشیرەتێک لە بۆ تەئمینی ئیستیراحەتی خۆیان مڵکیان پێ دەوێ کە مەڕی لێ بلەوەڕێنن و جووتی لێ بکەن. ئەڵبەتە قەومێکی لەبۆ ئەوەی کە لە سەر دنیایە بمێنێ ئەرزێکی پێ لازمە. ئەو ئەرزە عیبارەتە لە مەجمووعی مڵکی ئەو عەشیرەتانە. ئەگەر وا بوو بە مولاحەزەی وەی کە ئەمن کوردم،

ئەرزی من کوردستانە و وەتەنی زەنگینی منیش ئەوێیە وە بەمولاحەزەی وەی کە عەشیرەتیم ملکی من سابلاغە، وە بەمولاحەزەی وەی کە فەردم ماڵی من لە سابلاغێیە. ئەگەر وابوو مەعنای وەتەن مەوهووم نییە.

وە محەبەتی وەتەن وەکی پێغەمبەر فەرموویەتی:' حب الوطن من الایمان ' لازمە.

پەس وەتەنی ئێمە کە کوردان، عیبارەتە لە مەجمووعی ملکی ئەو عەشیرەتانە کە هەموو پێکەوە خزمن و، هاوزبانن و لە بۆ موحافەزەی مەوجوودیيەتی خۆیان بەڵکو چەند هەزار ساڵ لەوەی پێش وەعد و قەولیان کردووە کە پێکەوە بژین و لە موقابیلی دوشمنی خاریجی پێکەوە حەرەکەت بکەن. وە لە بۆ ئێمە لە بابوباپیرانمان بەمیرات بەجێ ماوە و دەبێ ئەگەر دەمانەوێ کوری بابی خۆمان بین قەولی وان نەشکێنین حیمایەی ملکی یەکدی بکەین. چونکە هەموومان خزمین، بەئەو نیشانە کە حیسمان، فیکرمان، ئەخلاقمان، عاداتمان موشتەرەکە. ئەگەر بێتو قسەی وان بەجێیەکی نەهێنین و مودافەعەی یەکدی نەکەین چمان لێ دێ؟ بەبێ شک هەموومان دەبین بەئەسیری ئەقوامی تر کە چاویان لە مەملەکەتی خۆشی ئێمە بڕیوە.

وە ئەمنیش پێم وایە پیاو کە پیاو بێ، پێی عەیبە ماڵی خۆی بەحیزی بەجێ بێلێ و خزمی خۆی بەرەڵا بکا و ببێتە نۆکەری خەڵقی عەرەب و لی فاختر لنفسک منزلا تعلوبه اومت! کریما تحت ظل القسطل...

پەس وەتەنی ئێمە مەعلوومە، حازرە مەوجوودە، ئەو پەس " کوردستانە " مەهدی زهووری مەدەنییەتی عالەمە. جەمشید و فەرەیدوون و کەیخوسرەوی ئێمە بینای حکوومەتیان دانا، رۆستەمی ئێمە نموونەی شەجاعەتی بابوباپیرمانە، ملکی ئێمە، وەتەنی ئێمە یادگاری جەمشیدە، فەرەیدوونە، کەیخوسرەوە و ئەوان لە مەجالیسی شاهانەی خۆیان بەناموس سوێندیان خواردووە کە حیفزی بکەن، ئەڵبەتە ئێمەش حیفزی بکەین و دەبێ قسەی وان نەشکێنین هەتاکو عالەم تەعەنەمان نەکا.

لە دوای ئەوەکە وەتەنمان حیفز کرد، لە بۆ تەئمینی ئیستراحەتی خۆمان دەبێ سەعی بکەین وەکو قەومی دی بەواسیتەی زۆر شتی تازە زهوور ملکی خۆمان، ماڵی خۆمان ئاوەدان بکەین. ئەگەر وا بکەین دەژین، وەئیلا دەمرین و یاخۆ دەبین بە ئێخسیر.

زان صرصر شمال و زان آتش جنوب

شوقی وطن خراب و گلشن ارغوان شود

(شەوقی لەبەر بای سەرسەری باکور و لەبەر ئاگری باشوور، نیشتمان خراپ دەبێ و گوڵستان دەبێتە ئەرخەوان)

قازیزادە

مستەفا

# ئۆتۆبیوگرافی (بەسەرهاتی خۆیی)

بەقەڵەمی مستەفای قازی

The Kurdistan Missionary, Volume 15. MIN-

NEAPOLIS, MINN, FEBRUARY, 1923.No 1.

PP 26-27

کوردستان میشنێری، ساڵی ، ١٥ میناپۆلیس، میناسوتا،

فێڤریەی، ١٩٢٣ ژمارەی ٢ لاپەڕەی ٢٦– ٢٧

ئەمن ناوم مستەفایە. ناوی بنەماڵەم قازییە. بنەماڵەی قازی خەڵکی گورجستانن و، لە بناوانەوە بە" شازادەی تاتوولا" بەناوبانگ بوون.

نزیکەی ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر باپیرە گەورەی من شازادەی تاتوولا، گورجستانی بەجێ هێشت و ڕووی لە ئێران کرد و، کاتێک لە تەورێز بوو لەوێ لە لای وەلیعەهدی ئێران هاتە سەر دینی محەمەد. لە بری ئەو لە دین وەرگەڕانە لە ساوجبولاغ زەویوزارێکی زۆری درایە. لەو ناوچەیەدا هێشتاش زۆر گوند و ئاوایی ماونەتەوە کە گشتیان ئی خانەدانی ئێمەن؛ بنەماڵە و خێزانی ئەوتۆ کە مەزرا و باغ و باغاتیان تەنانەت ئەمڕۆش بەنێوبانگن. بەڵام بەداخەوە ئەوانە گشتیان لە شەڕی جیهانی یەکەمدا بەدەستی ڕووسەکان کاول کران. باوانی من دوایە دەستیان بەخوێندن و لێکۆڵینەوەی دین و فیقهی محەمەدی کرد، و وەچ لە دوای وەچ لە لایەن حکوومەتەوە کران بە قازیی هەموو هەرێمەکە، هەر بۆیەشە بنەماڵەکە پاشناویان قازییە.

ئەمن لە ساڵی ١٨٩٦ی زاینی لە ساوجبولاغ لە دایک بووم و بڕێک لە لای باوکم و هێندێک لە لای مامۆستای سەر ماڵێ، زمانی فارسی و عەرەبیم خوێند، کە زۆر چاکی فێر بووم و بووم بە" دوکتوری فیقە"

(ئیجازەی مەلایەتیم وەرگرت). دواتر دەبوو جێی باوکم بگرمەوە و وەک قازی فەرمانڕەوایی بکەم. لە هەمان کاتدا چەندین میسیونێر (موبەشیر) گەیشتنە ساوجبولاغ، و

لە ڕێگای ئەوانەوە هان درام دەست بکەم بەفێربوونی کولتووری نوێ و وڵات بەجێ بهێڵم. لە ساڵی ١٩١١ هاتم بۆ کۆنستانتینۆپل (ئەستەنبووڵ) بۆ خوێندن لە لیسەی شایانەی ترکییە(Turkish Imerial Lyceum) (خوێندنگەی ئامادەیی). لە ساڵی ١٩١٣ خوێندنی لیسەم تەواو کرد و چووم بۆ ئاڵمان بۆ تەواوکردنی دەورەی خوێندنی پزیشکی. باوکم وای دانابوو هەموو مانگێک ٧ پاوند لیرەی ستێرلینگی ئینگلیزیم بۆ بنێرێ، بەڵام لە ساڵی ١٩١٥ نەهامەتییەکی گەورە تووشی بنەماڵەی من هات و باوکم چیتر لە وزەی دانەبوو دراوم بۆ بنێرێ. جا بۆیە لە ساڵی ١٩١٦ گەڕامەوە کۆنستانتینۆپل و لە Rote Halle Mond بووم بەئاسیستانت. لە نیوەی یەکەمی ساڵی ١٩١٧ کۆتاییم بەکار و خزمەتی خۆم لەوێ هێنا و وەک خوێندکار چوومە کالیجی پزیشکی. ئەو دەمی ئەمن لەگەڵ خێزانێکی تورکی خەڵکی سالۆنیک، هەڵسوکەوتم هەبوو، و، لە ساڵی ١٩١٩ بەپێی داب و شوێنی ئۆرووپایی، کچە گەورەکەیانم مارە کرد. خەزوورم لە ماوەی ساڵانی خوێندنمدا یارمەتیی بەرەوپێشچوونی دابووم. ئەو لە ساڵی ١٩٢٠سەری نایەوە. ئەمن لە ١ی سێپتامبری ١٩٢٢دا خوێندنی خۆم تەواو کرد و ئێستا لە نەخۆشخانەی ئێرانی ئینتێرنم. کچێکی ٩ مانگانەم هەیە ناوی Gealet ە. هاوسەرم تەمەنی ٢٢ ساڵە و ناوی نەدیدەیە. ئەو سەر بە بنەماڵەیەکی مامناونجییە، و لە سالۆنیکی لە خوێندنگەی بەرزی پزیشکی خوێندوویەتی. باوکی لە وەزارەتی خزمەتی گشتی تورکیی دا (Public Department) کاریەدەست بوو. خەسووم هێشتا ماوە و دوای مردنی مێردەکەی مێردی کردووەتەوە. هاوسەرم زۆر خوێندەوار و بەکولتووره و فەڕانسەییەکی زۆر باش دەزانێ. ئێمە زۆرجار بەیەکەوە بەتورکی ئینجیل دەخوێنینەوە. ئەمن زمانی کوردیی فێر دەکەم و ئەو ئێستا هێندێک کوردی حاڵی دەبێ. هیوادارم لە داهاتوودا هاوکارێکی بەنرخی من بێ بۆ پەروەردەکردنی ژنی کورد.

ئەم کاتە بەدەرفەت دەزانین و من و هاوسەرم سڵاوی مەسیحییانەی خۆمان بۆ ئێوە دەنێرین. هەروەها Gealet ی وردیلانەش، دەستتان ماچ دەکا. ئەو داوخوازی کەرەمی خولای لە زوور بۆ خۆی و گەلەکەیەتی

دۆستانی دڵسۆزی ئێوە

خانم و دوکتور مستەفای قازی

# کۆچی دواییی یای قازی

The Kurdistan Missionary, Volume 15. MIN-
, AUGUST, 1923. No.8, .NEAPOLIS, MINN
116-117 .PP
کوردستان میشنێری، سالّی ,١٥ میناپۆلیس، میناسوتا،
فێڤرییەی، ١٩٢٣ ژمارەی ,٨ لاپەڕەی ١١٦– ١١٧

دوکتــور قــازی لە نامــەکـانی ئـەو دوایانەی خـۆیدا باسـی ناسـاخی یای قـازی کـردبوو و پەژارەی خـۆی لەوە دەربڕیبوو کە بەزوویی ژمـارەی نەفـەسـی هـاوسـەری ئاخـرین دەبێ. لە قووڵاییی دڵەوە هـاودەردیی خـۆمان لەگەڵ دوکتـور قـازی و Gealetی پچکۆڵانە دەردەبڕین و کـۆچی دواییی یای قـازی کــە ڕۆژی شــەمــۆ، ١٦ی ژووەنی (١٩٢٣) مــاڵاوایی لێ کـردین ڕادەگەیێنین. ئێمــە دڵنیـایـن و لەو باوەڕە داین کە یای قـازی جێگـای بەهەشـتـە. دەزگـای مـیـسـیـۆنی ئێمــە هـاوکـارێکی ئـەوتـۆی لە دەست داوە کـە ئێـمـە هومـێدی ئەوەمـان پێ بوو کەڵکێکی زۆری بۆمـان هەبێ. بەڵام ئەوە هـەر خـودایە کـە دەزانێ کـاری هـەرەچاک چییـە، و بەپشـتیوانیـی وی چ ئێمە و چ دوکتور قازی هـەوڵ دەدەین کارو بار بەباشـی جێبەجێ بن بۆ چاکەی ئەوانەی ئەویان خۆش دەوێ.

دۆستانی خـۆشـەویسـتی میسـیـۆن! با لە نوێژ و پاڕانەوەی خۆماندا دوکتـور قازی و Gea-letای پچکۆڵانە لە بیر نەکەین، و ئەگەر ئێوە پێتان خۆشە بەشـەخسـە هـاودەردیی خۆتانی پێ ڕاگەیێنن، دەکرێ بەم ناوونیشانەی خوارەوە نامە لە دوکتور قازی بنووسن:

Dr. Mustafa Kazi
Sultan Ehmed , Nachilbend 1-3,
Constantinpole, Turkrey

-ن. جێی.لۆر، سەرۆک
میسیۆنی لووتێری ڕۆژهەڵات

# میرزا جەوادی قازی

## ١٩٥٨ - ١٨٨١

نووسینی: سەید عەبدوڵای سەمەدی

دوکتور جەوادی قازی، کوڕی شێخ جەلال، ساڵی ١٢٦٠ی هەتاوی لە مەهاباد یان گوندی (سریلاوا)ی دەڤەری مەهاباد لە دایک بوو. پاشی تەواوکردنی دەرسی سەرەتایی، بۆ خوێندن و فێربوونی زانیارییە ئاینییەکان ڕووی کردە حوجرە. ساڵی ١٩٠١، 'ئۆسکارمان' سەرۆک و پارێزەری کتێبخانەی سەڵتەنەتیی ئەڵمان، بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانییەکان هاتە ئێران. سەردانی لوڕستان و کوردستانی کرد، بۆ گردارییی ئەدەبی زارەکی و هەروەها فێربوونی زمانی کوردی، لە مەهاباد مایەوە ئەودەم جەواد لە تەمەنی بیست ساڵیدا، لە مزگەوتی شادەرویشی مەهاباد بەفەقێیەتی هێشتا خەریکی خوێندنی علوومی دینی بوو.

ئۆسکارمان لە لای میرزا جەواد، زمانی کوردیی لەهجەی موکری دەخوێند و لە هەمبەر ئەو ئەرکەدا ئەویش زمانی ئینگلیزیی فێری جەواد دەکرد. هەڵبەت میرزا جەواد پێشتریش هێندێکی ئینگلیسی لە لای یەکێک لە کاربەدەستانی نەخۆشخانەی ئەمریکایی لە مەهاباد خوێندبوو(*). لێکۆڵینەوەکانی ئۆسکارمان تا ١٩٠٣ درێژەیان کێشا، لە گەڕانەوەدا بۆ ئەڵمان، میرزا جەوادیش لەگەڵی چوو و لەوێ درێژەی بەخوێندن دا. دوای ماوەیەک، خوێندنی بەرزی لە ڕشتەی مافدا بەدوایی گەیاند و هەر لەوێ، لە باڵوێزخانەی ئێران دامەزرا. لەو ماوەیەدا هاوکارییەکی نزیکی لەگەڵ ئۆسکارمان کرد بۆ وەرگێڕانی ئەڵمانیی کتێبی Die Mundart der Mukri- Kurden کە بە' توحفەی موزەفەرییە ' ناسراوە، و لە

---

(*) لەو سەردەمەدا میسیۆنێرە ئەمریکاییەکان هێشتا نەهاتبوون بۆ سابلاغ، بەڵکو میسیۆنێکی ئاڵمانی لێ بوو، ڕەنگە مەبەست لەوان بێ.

ئەم نووسینە کورتە، بەڵام پڕ لە زانیارییەی سەید عەبدوڵای سەمەدی بە سپاسەوە لە نووسراوەیەکی بەڕێزیان بەنێوی 'ناودارانی موکریان ' وەرگیراوە. زۆر سپاسی دەکەین بۆ ئەوەی ڕێگەی پێ داین لێرەدا بڵاوی بکەینەوە. (حەسەنی قازی)

ساڵی ١٩٠٦ له بەرلین چاپ و بڵاو کراوەتەوە. دوکتور جەواد هەر له بەرلین، لەگەڵ کچە ئەڵمانییەک زەماوەندی کرد و هیچ منداڵی لێی نەبوو. له ساڵی ١٩٢٨دا گەڕایەوە تاران و بوو بەڕاوێژکاری بەرزی دیوانی. سەرلەنوێ له تاران زەماوەندی کردەوە، بەڵام تا دوایی تەمەن هەر بەوەجاغکوێری مایەوە. پاشی ساڵێک داوای له بنەماڵەی قازی، له مەهاباد کرد که برازا هەتیوەکەی، بۆ ڕەوانەی تاران بکەن تا سەرپەرشتیی بکا و دەرسی پێ بخوێنێ. ئەوە بوو که ' محەمەدی قازی'، وەرگێڕی بەناوبانگی پاشەڕۆژ، ڕۆیشتە لای مامی و له ژێر چاودێری وی درێژەی بەخوێندن دا.

دوکتور جەوادی قازی، بەسەر حەوت زمانی: ئینگلیسی، ئەڵمانی، فەڕانسەیی، عەرەبی، فارسی، تورکی و کوردیدا شارەزایی تەواوی هەبوو. ژمارەیەک وتار و لێکۆڵینەوەی بەزمانی ئەڵمانی له دوا بەجێ ماون، که هێندێکیان له گۆوارەکانی ئەو سەردەمی ئەڵماندا چاپ کراون؛ نموونەی ئەو وتار و لێکۆڵینەوانە، وتارێکە لە سەر هۆزی مەنگوڕ، که له گۆواری Globusدا چاپ کراوە، هەروەها لێکۆڵینەوەیەک بەناوی " دەستوور و یاسای کوردەواری" کە له گۆواری " زانستی بەراوەردکاریی ماف" دا، له ساڵی ١٩٠٩ بڵاو کراوەتەوە. گرینگیی نووسراوەکانی دوکتور جەوادی قازی لەوە دایە یەکەم کوردێک بووە که بەزمانی ئەڵمانی وتاری له سەر کورد نووسیوە. بەپێی ئاماژەی مامۆستا محەمەدی قازی، دوکتور جەواد له ساڵی ١٩٥٨ بەنەخۆشیی شێرپەنجە کۆچی دوایی کرد و له گۆڕستانی 'ئیمام زادە عەبدوڵا 'ی تاران نێژرا.

# شێخ ئەحمەدی سریلاوا

حەسەنی قازی

شێخ ئەحمەدی سریلاوا، کوڕی دووەمی قازی شێخ جەلال، برای پچووکتری میرزا جەوادی قازی و مامی محەمەدی قازی، (وەرگێڕی زۆر بەرهەمی بەنێوبانگی ئەدەبی جیهانییە لە زمانی فەرانسییەوە بۆ سەر زمانی فارسی).

بەداخەوە نووسەری کتێب نە لەسەر قازی شێخ جەلال و نەلەسەر کوڕانی زانای دوکتور جەوادی قازی و شێخ ئەحمەدی سریلاو هیچی نووسیوە.

ناوبانگی شێخایەتیی ئەحمەدی قازی، ڕەنگە لەبەر بابی یان لەبەرئەوەی ماڵی خالانی لە سادات و شێخان بوون پێی بڕابێ. سریلاوا ناوی ئاوەدانییەکە لەنێوان بۆکان و مهاباد و لەبەرئەوەی شێخ ئەحمەد لەوێ ژیاوە، خەڵک بەو ناوە بانگیان کردووە. ئەحمەدی قازی شاعیر بووە و لە ساڵانی نیوەی کۆتاییی ۱۹٤٠ کاندا ماڵاوایی لە ژیان کردووە.

پارچەیەک لە شێعرەکانی لە کتێبێکی پچووکدا بەناوی ' دیاریی کومەڵەی (ژ.ک) بۆ لاوەکانی کورد' کە لە ساڵی ۱۳۲۲ی هەتاوی/ ۱۹٤۳ی زاینی لە لایەن کۆمەڵەی (ژێکاف) ڕا بڵاو کراوەتەوە لە بەشی سێیەمدا بەناوی ' دەستە گوڵێکی جوان و بۆنخۆش لە باخی نیشتمانپەروەری' کە بەسەرنووسی بەیتێک لە یەکێک لە شێعرە بەناوبانگەکانی سەیفولقوزات ڕازاوەتەوە: (هەر میللەتێ لە لاوە حەقی خۆی بەدەستەوە/ کوردێک ئەگەر(کە) سەری هەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو) چاپ کراوە.

عەبدولڕەحمانی زەبیحی، گەڕێنەندەی گۆواری نیشتمان و چاپەمەنییەکانی کۆمەڵەی ژیانی کورد بەچەند دێڕێک شێخ ئەحمەد و پارچە شێعرەکەی ئاوا ناساندووە:

دوای جەنگی ڕابوردوو کە جمهووریەتی ترکییە سازبوو مەحکەمەیەک بەناوی (مەحکەمەی سەربەخۆیی) (ئیستیکلال مەهکەمەسی) داندرا، جەنابی شێخ عەبدولقادری شەمزینی و سەید محەمەدی کوڕی دەگەڵ هەندێ لە گەورە و ناودارانی کورد لەم مەحکەمەیەدا محاکەمە کران و هەڵیان ئاوەسین. ئینجا "شێخ ئەحمەدی سریلاوایی" کە

پیاوێکی بەناوبانگی موکوریانە ئەم شینەی خوارەوەی بۆ شەهیدانی ڕێگای سەربەستی کورد گێڕاوە.

ئەم ئاسمانە شینە کە وا بەرگی ماتەمە
ئیجادی وا کراوە کە قوبیەی هەموو غەمە

بارانی مەرگە، بەفرە کفن، ڕەعدە نەفخی سوور
ئەورۆ گرانی قابیزی ئەرواحی عالەمە

سەرتیپی تیپی هەورە شەماڵ، بۆ سەفی قیتال
نارەنجەکیی تەرزەیە، تەیارەیی تەمە

ڕۆژی سیایە، ڕۆژ و شەوی تارە چەرخی پیر
هەوری لەدوودە، ئاهو تەمی وی هەموو غەمە

ئەم چەرخە کۆنە ماشێنەکەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا بەخوێنەکی، سووڕانی عەستەمە

لەم قەرنی بیستەمی مەدەنییەت بەخوێنی کورد
ژەنگی لە سەر نەهێشتووە، هێشتاکە پێی کەمە

تاراندراوە چەرخی ستەم، کارییە
ئەو زوڵم و جەورە قسمەتی هەر شین و زارییە

خاسسە بەخوێنی کوردی شیمالی هەموو زەمین
گوڵزاری خوێنە غونچە سفەت دڵ هەموو غەمین

هەوری خەفەت لە ئەوجی فەرەجدا موسەلەتە
شادی نەبوو لە هیچ دڵێدا نەبێ بەشین

مەحشەر میسالە دەشتی شیمال، کەربەلا سفەت
غەمناکە لەم موسیبەتە سوککانی حەوتەمین

ئەکسەر لەوانە سەیدن و هاشمی نەسەب
میراسی جەدیانە شەهادەت کە پێی گەیین

فەرمانی قەتڵی عامی "کەماڵ" بۆ کەماڵییە
مەقسوودی مەحوی دینە لە ئێعدامی ئەهلی دین

وا حەسرەتا، چرای ئومێدم کووژایەوە
قەتڵی موحەڕەمێ لە شیمالی بڕایەوە

چەنگیز کەماڵە، ئەهلی کەماڵ شاهیدی دەدا
کوانێ زەمان و عەسری 'مەغوڵ' زوڵمی وا کرا

هەر بەو گوناهە دوژمنی دین مەحوی کردەوە
لەو جێ و مەکانی کوردە کە بینی خودا، کرا

نەسسی حەدیسە تەرکی... ئێستە مەحکەمە(*)
بەو زوڵمە خیبسی باتنییان بەرمەلا کرا

دڵ بەحری خوێنە، سۆفی مەپرسە چ فاییدە
تەعدادی ناکرێ، کە بڵێم چەند خەتا کرا

هاوارە قەومی کورد، وەرن ڕۆژی غیرەتە
نیسبەت بەئێمە زوڵم و تەعەدی چها کرا

غوسسەم ئەوەندە زۆرە، دڵم هێندە پڕ غەمە
سەحبالی ناتیقم لە غەما لاڵ و ئەبکەمە

..........................................

سەرچاوە:' نیشتمان، بڵاوکەرەوەی بیری کۆمەڵەی ژ.ک، ئامادەکردنی عەلی کەریمی، بنکەی ژین. سلیمانی ٢٠٠٨، لل ٢٦٢، ٢٦٣، ٢٦٤.

---

(*) ئەم وشەیە لە دەقی ماک دا نە نووسراوە

# چەند بیرەوەرییەک لە محەمەدی قازی

حەسەنی قازی

ڕەنگە محەمەدی قازی تاکە کەسی بنەماڵەی قازی بێ کە لە نێو فارس زمانانداله هەموویان زیاتر ناسراوە. هۆیەکەشی ئەوەیە، محەمەدی قازی زیاتر لە ٧٠ ڕۆمان و کتێبی بەنێوبانگی لە زمانی فەڕانسەییەوە کردووەتە فارسی و درۆ نییە ئەگەر بگوترێ هیچ فارس زمانێکی کتێبخوێن لە ئێران نییە نێوی وی نەبیستبێ.

محەمەدی ئیمامی کوڕی میرزا عەبدولخالەق (ئیمام جومعە) لە تافی مێردمنداڵیدا کوردستانی بەجێ هێشتووە و لە تاران خوێندوویەتی، هەر بۆیەش لەوێ بۆی نەلواوە بەزمان و ئەدەبی کوردییەوە خەریک بێ.

ئەمن شانازیی ئەوەم هەیە یەکێک لەو کەسانە بووم، ئەو سەردەمەی لە تاران دەژیام هەمیشە حەولم لەگەڵ دەدا لایەک لە زمانی کوردی بکاتەوە. قازی لەبەر هەڵکەوتی ڕووناکبیرانەی خۆی زۆر بەساڵان بەرلەوەی کتێبی باسیل نیکیتین وەرگێڕێتە سەر زمانی فارسی ئەو کتێبەی خوێندبووەوە. زۆرجار لە مەجلیسان باسی ئەوەی دەکرد، چۆن ئەمیر نیزامی گەڕووسی چۆلەکەیەکی لە سینگی خۆی ناوە و بەدرۆ گوتوویە قورئانە و سوێندی پێ خواردووە، ئەگەر هەمزاغا بێتە سابڵاغێ هیچ مەترسی لە سەر ژیانی نییە و بەدەک و دۆلاب هەمزاغای مەنگوڕی کێشاوەتە ئەوێ و ناجوانمێرانە کوشتوویەتی.

یەکەم کتێبی محەمەدی قازی "زارا، عشق چوپان" کە تائێستا بەچەند وەرگێڕانی کوردییەوە بڵاو کراوەتەوە لە سەربنەمای ژیانی ڕاستینەی کۆمەڵێک خەڵکی بەلەنگاز کە تووشی نەخۆشیی گولی بوون هەڵنراوە.

محەمەدی قازی لە ڕێگای مامی دوکتور جەوادی قازی، لەگەڵ ناوەرۆکی بەیتی کوردی و بەتایبەتی ئەو بەیتانەی ڕۆژهەڵاتناسی ئاڵمانی ئۆسکارمان لە زمان ڕەحمان بەکرەوە بەیارمەتیی میرزا جەوادی قازی گردەوەکۆیی کردوون ناسیاوی هەبوو، جارێکیان لە مەجلیسێکدا بەو زمانە ڕەوان و خۆشەی چەند برگەیەک لە بەیتی "لاس و خەزاڵ" بۆ

جەلالی ئال ئەحمەد نووسەری بەنێوبانگی ئێرانی وەردەگێڕێ، بەتایبەتی ئەفسانەی گووڕانی ئاولەمەی لاس لە سەر پشتی شێر. زۆر جار دەیگوت، جەلالی ئەحمەد پێی گوتووم ئەمن لەجیات تۆبایەم ئەو شاکارانەی ئەدەبی زارەکی گەلی کوردم وەردەگێڕا و خۆم لە دەقی فەڕانسەیی نەدەدا.

جارێکیان کە تازە وەرگێڕانی کتێبی ' آزادی یا مرگ ' ی نووسەری زۆربا، نیکۆس کازانتزاکیس دەرکەوتبوو و ئەمن بەهەڵپەوە لە ماوەیەکی کورتدا خوێندمەوە، هەستم کرد لە زۆر جێگا وشەوبێژەی پەتیی کوردی بەکارهێناوە و دەمزانی ئەوانە لە زمانی فارسیدا نین. لە مەجلیسێکدا لە ماڵی خۆی کە چەند نووسەری ناسراوی ئێرانی وەک غولامحوسێنی ساعیدی و مەنووچێهری هەزار خانی لێ بوو، پێم گوت، ئەو کارەت زوڵمێکی گەورەیە لە هەنبانەی وشە و تەعبیری کوردی، چونکو ئەگەر کەسێک ئەو دەقە بەفارسی بخوێنێتەوە ئیدی ئەو جۆرە وشە و بێژانە بەهاسانی دەبنە ماڵی زمانی فارسی و دەکەونە لاپەڕەی قامووسان لە بەرئەوەی ئەتۆ نووسیوتە. چاکم لە بیرە یەک لەو وشانە ' کەندال' و بێژەکەش 'هەوا بۆ گوتنی' کوردی بوو کە ئەو نووسیبووی: 'هوائی برایمان بخوان' ئەگەرچی ئێستا دوای نزیکەی چل ساڵ لەو دەمییەوە پێم وایە وشە خواستنەوەی زمانان لە یەکترەوە وەنەبێ شتێکی سەیر بێ، هەر بووە و هەر دەش بێ.

ئەو کاتەی لە تاران دەژیام، دوای ئەوەی بەحەولێکی زۆر توانیم بەرگی یەکەمی کتێبی ئۆسکارمان پەیدا بکەم، و زۆرم خۆ ماندوو دەکرد بەیتەکان بهێنمە سەر خەتی عەرەبی (بەساڵان دواتر مامۆستا هێمن لە بەغدا لەگەڵ دوکتور ئەنوەر قادر محەمەد ئەو کارە گەورەیەیان ڕاپەڕاند و کۆڕی زانیاری کورد بڵاوی کردەوە)، ئەگەرچی لە نووسینی کوردیدا کول بووم، توانیم محەمەدی قازی پێمل بکەم بۆ ئەوەی بەیەکەوە بەیتی 'لاس و خەزاڵ' وەربگێڕینە سەر زمانی فارسی، ئەمن وەرم گێڕا و ئەویش دەقە فارسییەکەی کردە فارسی! و لە گۆوارێکی بەڕمێنی ئەو سەروبەندی تارانێدا بڵاو کراوە، دواتریش لە گۆواری 'ارک'دا کە ژمارەیەک لە تێکۆشەرانی تورکی ئازەربایجانی لە تەورێز دەریان دەکرد، بەیتی ' سەیدەوان' مان کە لە زمانی بەیتبێژێکی خەڵکی گوێگجەلی نووسیبوومەوە بڵاو کردەوە.

محەمەدی قازی یەک لەو ئینسانە هەرە قسە خۆشانە بووە کە ئەمن لە ژیانمدا ناسیومە. لە سەردەمی ڕێژیمی بلەوەزی کوڕی ڕەزاخان لە کۆڕوکۆمەڵی گشتیدا دژایەتی دەربڕین و ڕەپوڕوو ڕەخنە گرتن لە داودەزگای داپلۆسێنەر زۆر ئاستەم بوو، بەلام خەڵکی مووقەڵێش و وردبین ڕێگایەکیان هەر دەدۆزییەوە، بۆ ئەوەی قسەکانی خۆیان بکەن و محەمەدی قازی

یەک لەو کەسانە بوو. لە میوانییەکدا کە تەنانەت یەک دوو ئەفسەریشی لێ بوو، باسی ئاخر نوکتەی تازە دەکرا. محەمەدی قازی چیرۆکی ئەو شێر و گوێدرێژەی گێڕایەوە کە لە دورگەیەک کەلەلا، هەوای نەوس زۆریان بۆ دێنێ، ئەو بەزانایی هەموو جارێ کە باسی شێرەکەی دەکرد دەیگوت: " ئەعلاحەزرەت ! سولتانی جەنگەڵ "، کەس نەبوو لە مەبەستی سەرەکیی تێ نەگا کە ئەویش ئەعلاحەزرەتی شای شایان بوو کە هێشتا نەبووبوو بە'ئاریامیهر'. لە بیرمە یەکێک لە ئەفسەرەکان کە دۆستێکی پێشکەوتووی ئازەربایجانی بوو، بۆ شوێنە ونکە و بۆ ئەوەی دوایە بەربینگی پێ نەگرن کە گوێی لە چیرۆکێکی ئەوتۆ هەڵخستووە مەجلیسەکەی بەجێ هێشت.

ڕەحمەتی دوکتور هاشمی شیرازی لە تاران، هەموو ساڵێک بەبیانووی ساڵڕۆژی لە دایکبوونی یەکێک لە منداڵەکانی میوانییەکی گەورەی ساز دەکرد بۆ بەرز ڕاگرتنی بیرەوەری و پیرۆزبایی دووی ڕێبەندان. ساڵێکیان ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی دانیشتووی تاران لەو جێژنی لە دایکبوونەدا لە ماڵی دوکتور شیرازی کۆبووبوونەوە.

یەک لە میوانەکان بۆ زۆربەی ئامادە بووانی مەجلیسەکە نەناسراو بوو، بەڵام دەنگی یەکجار زۆر خۆش بوو و یەک دوو مەقامی فارسیی گوت، و لەبەرئەوەی کەشوهەوای مەجلیسەکە کوردی بوو، بۆ ئەوەی نەکا لۆمەی بکەن، لە جیات ئەوەی سەربەندی مەقامەکان بڵێ دەیگوت: ' بیبوورن، بەڵام ئەمن دایکم کوردە'، قازیش بەدەنگی بەرزەوە (ئەو دەمی هێشتا ساخ بوو و دەنگی نەکەوتبوو) بێ ئەوەی هیچ ناسیاوییەکی پێشووی لەگەڵی هەبێ چەند جار گوتی: ' زیا جان (ئەو میوانە پاشناویی زیبایی بوو) قربان مادرت (قوربانی دایکت، بۆ ئەو دەنگەت) و بەو شێوەیە نەبانی ئاغای زیبایی ڕەواندەوە و دواتر بوون بەدۆستی زۆر نزیک.

برای پچووکتری نووسەری ئەم کتێبە خودالێخۆشبوو سەرهەنگ حەسەنی فەتاحیی قازی، لەگەڵ ئەوەشدا لە کوردبوون نەشۆرابووەوە، بەڵام لەبەر هەڵکەوتی خۆی کە ئەفسەری ئەرتەش بوو، بەهیچ جۆر بەلای باسی سیاسیدا و ئەوەی بۆنێکی دژایەتیی ڕێژیمی لێ هاتبا نەدەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا دۆستایەتییەکی زۆر گەرم و نزیکی لەگەڵ محەمەدی قازی هەبوو. قسەی مەجلیسێک کە ئەوان هەر دووکیانی لێبان ئەوەندەی تر خۆشتر دەبوو. جەناب سەرهەنگ کە زۆربەی خزمان ئاوایان بانگ دەکرد، لە دواین زەواجی خۆیدا ناوی زۆر تۆخی فارسی کە زیاتر درینگەی ناوی براکانی شای لێوە دەهات لە منداڵەکانی نابوو (هیوادارم ئێستا کە ئەم دێڕانە دەخوێننەوە لە دڵیان گران نەیە)،

محەمەدی قازی هەرکاتێک هاتبا ماڵی سەرهەنگ فەتاحی هەر چاوی بەیەکێک لە کوڕەکانی کەوتبا یەک بەخۆی هەرای دەکرد: "سلام آقای والاحضرت! (بەبراکانی شایان دەگوت والاحەزرەت). محەمەدی قازی تازە کتێبی ' بحثی در بارەء مفهوم انجیلها' ی وەرگێڕابوو، ڕەحمەتی حەسەنی فەتاحیی قازی بیستبوویەوە لەوانەیە هێندێک کۆڕ و کۆمەڵ بەناوەرۆکی ئەو کتێبە هەڵبەزنەوە. بە محەمەدی قازی دەگوت: قازی ئەتۆ بەو قەڵەمەت ئاخری نانی دەمی منداڵەکانت دەبڕی، دەست هەڵگرە، زمانت گاز بگرە!! قازییش گوتی: "قەڵەمێک بتوانێ ببڕێ و هەڵدروێتەوە نابێ هەڵپەسێردرێ.

هاوسەری محەمەدی قازی خەڵکی شاری ڕەشتی سەرووی ئێران بوو. ناوی ئێران خانم بوو، نەخۆشیی دڵی هەبوو و محەمەدی قازی زۆری بەپەرۆشەوە بوو و بۆ تەداوی بردبوویە لەندەن و دوای عەمەلێکی سەرکەوتوو گەڕانەوە تارانێ. بەڵام ساڵێک دواتر کە دەبوو بۆ بەردەوامی تەداوییەکە بچنەوە ئۆرووپا، بەداخەوە ئێران خانم ئەوڕۆژەی دەبوو هەڵفڕن بۆ لەندەن ماڵاوایی لە ژیان کرد. بڕیار وا بوو ئەمن لە خزمەت جەناب سەرهەنگدا بۆ بەڕێکردنیان بچینە فرۆکەخانەی مێهراباد، بەیانی زوو تەلەفۆنی ماڵی سەرهەنگ فەتاحیم کرد بۆ ئەوەی بزانم کەنگێ وەڕێ کەوین، بۆ فرۆکەخانە ؟ گوتی چوونی فرۆکەخانە پێویست ناکا دەبێ بچینە سەرقەبران!

کە چووینە ماڵی محەمەدی قازی خزمی هاوسەری زۆربەیان لەوێ کۆبووبوونەوە و یەکدەنگ بەزمانی گیلەکی هاواریان دەکرد: " ئێران مەن ترۆ خایەم' و لە سەر و ڕووی خۆیان دەدا. تەنانەت لەو کەشوهەوایەشدا، نە محەمەدی قازی و نە سەرهەنگ فەتاحی قسەی خۆشیان لێ نەدەبڕا. دوای عەرزی تەسلییەت، جەناب سەرهەنگ ڕووی لە محەمەدی قازی کرد و بەئاسپاییەک پێی گوت: قسەی خۆمان بێ، قازی هێندێکیش سەرت سووک بوو. خۆ تۆ ئەوە زیاتر لە دوو ساڵە هەدادانت لێ بڕابوو!!

دواتر کاک محەمەد بۆ ئەوەی وەجاغی ماڵی سارد نەبێتەوە لەگەڵ خوشکی گەورەتری ئێران خانم؛ کیشوەر خانم کە خانمێکی بێوەژن بوو وەک بەزاراوەی ناقۆڵای ئەم ڕۆژگارەی باشوور دەڵێن:" ژیانی هاوسەرگیریی" پێک هێناوە! ئەمنیش بۆ ئەوەی دەم لە قسەی خۆش وەردەم پێم دەگوت: ' قوربان جەنابت فاتیحی کیشوەری ئێرانی' بەڕاستیش لە باری ئەدەبییەوە هەر وابوو.

ئەو دەمەی کتێبی " خاطرات یک مترجم" دەرکەوت و دوایە لە کوردستانی ئێران و

کوردستانی عێراق هێندێک هەرای لێ ساز بوو، و ڕەخنە لە محەمەدی قازی گیرا، ئیدی ئەمن لە ئێران نەمابووم. وابزانم لەو بارەیەوە هێندێک ناحەقی لە محەمەدی قازی کرا. محەمەدی قازی وەک خۆی جوان بوو، نەک وەک ئەوەی من و تۆ دەمانەوێ.

لەو ساڵانەی دواییدا چاوبەستێکی 'ئەدەبی' بۆ کەڵکی خراپ وەرگرتن لە نێوبانگ و خزمەتی گەورەی محەمەدی قازی بە زمان و ئەدەبی فارسی، کتێبێکی سەبارەت بەئەو نووسیوە و نانی پێوە دەخوا. بێشک ئەگەر قازی ئێستا زیندوو بایە نەیدەهێشت کاسبی بەنێو و نیشانییەوە بکرێ.



١- فەرمانی قەزاوەتی قازی عەلی بە مۆر و ئیمزای نایبی سەڵتەنەتی قاجار

مانگی موحەڕەمی ١٣١٢

بەڵگەی ١: فەرمانی قەزاوەتی قازی عەلی بە مۆر و ئیمزای نایبی سەڵتەنەت

مانگی موحەڕەمی ١٣١٣

محل مهر

خدا را شکر آنکه چون رعایت حقوق اسلاف در بارهء اخلاف همواره منظور نظر عدالت گستر والدست من جمله مرحوم میرزا قاسم قاضی که از جملهء دعاگویان دوام دولت قاهره و شغل قضاوت ولایت ساوجبلاغ... با او بوده بعد از فوت او مراتب استحقاق و اهلیت و دعاگوئی جناب محامد و معارف نصاب میرزا علی خلف آنمرحوم بعرض خاک پای اقدس همایون شاهنشاهی روحنا فداه رسیده وبمنصب قضاوت ساوجبلاغ و مضافات مفتخر شد، لهذا مانیز انتالا للام اله قدس الهعلی منصب قضاوت ساوجبلاغ مکری را در حق مشارالیه مرحمت و مقرر میداریم که حکام حال و استقبال و عموم آقایان و اهالی ساوجبلاغ در محاکمات شرعیه بمشارالیه رجوع نموده توقیر قدر و رعایت احترام او را بفراخور این منصب مرعی و حسب المقرر معمول و مرتب دارند شهر محرم ١٣١٣

وەرگێڕانی بۆ کوردی

شوێنی مۆر

شوکر بۆ خودا ئەوەی کە ڕەچاوکردنی ماف لەلایەن ڕابردووان سەبارەت بە ئەوانەی بەدوویاندا دێن هەمیشە لە بیری داد بڵاوکەرەوەی باب دایە لەوانە / شوێن ئیمزا

خوداڵێخۆشبوو میرزا قاسمی قازی کە لە دوعاخوانانی درێژە کێشانی دەوڵەتی بەدەستەڵات بووە و پیشەی قەزاوەتی ویلایەتی ساوجبولاغ..... لە دەست ئەو دابووە دوای وەفاتی وی چلۆنایەتیی حەقداری و لێوەشاوەیی و دۆعاگۆیی جەنابی بە حەمد و زانا میرزا عەلی کوڕی ئەو خوا لێخۆشبووە بەخاکی پیرۆزی بەرێی موبارەکی شایشایانی ڕۆحمان بە فیدای بێ، گەیشت و شانازیی وەرگرتنی پلەی قەزاوەتی ساوجبلاغ و دەوروبەری پێ درا، بۆیە ئێمەش مەنسەبی قەزاوەتی ساوجبولاغی موکری بە نێوبراو مەرحەمەت دەکەین و بڕیار دەدەین _ کاربەدەستانی هەنووکە و داهاتوو و گشت ئاغایان و خەڵکی ساوجبولاغ لە مەحکەمە شەرعییەکاندا ڕوو لە ئاماژە پێکراو بنێن و قەدری بگرن و ئەو حورمەتەی لەو پلەیە دەوەشێتەوە ڕەچاوی کەن و وەک بڕیار دراوە دەکاری بهێنن و بەو پێیە بجووڵێنەوە. مانگی موحەڕەمی ١٣١٣

*تێبینی: ئەوەی سرنج ڕادەکێشێ مۆر و ئیمزا لە سەرەوەی حوکمەکە دراوە. لە مۆرەکەدا هەر وشەی 'حکمرانی' و 'ولیعهد' باش دەخوێندرێنەوە.*


بنام نامی شاهنشاه
اعلیحضرت قوی شوکت اقدس همایون شاهنشاهی سلطان
احمد شاه قاجار خلد الله ملکه
و سلطانه

٢- فەرمانی تازەکردنەوەی پلەی قەزاوەتی قازی عەلی بە مۆر و ئیمزای نایبی سەلتەنەت عەلیڕەزای قاجار. مانگی موحەڕەمی ١٣٢٥

بەڵگەی ٢ فەرمانی درێژ کردنەوەی پلەی قەزاوەتی قازی عەلی لە لایەن عەلیرەزای قاجار نایبی سەڵتەنەت. مانگی موحەڕەمی ١٣٢٥

بنام نامی اعلیحضرت قویشوکت اقدس همایون شاهنشاهی سلطان احمد شاه قاجار خلدالّله ملکه و سلطانة                    محل مهر نایب السلطنه: علیرضای قاجار

چون جناب مستطاب میرزا علی قاضی ساوجبلاغ سلمه الّله بصفات علم و زهد آراسته و متصف و در خدمات و آسایش ملت در حدود ساوجبلاغ                    محل امضاء

کمال مراقبت و اهتمام را داشته وسایل رضا و خوشنودی اولیای دولت و ملت را از هر حیث فراهم نموده در اینموقع برای رعایت توقر و احترام و تجدید امر قضاوت معزی الیه بر حسب استدعای جناب مستطاب اجل اکرم مخبرالسلطنه فرمانفرمای کل آذربایجان و بتصویب جناب مستطاب اجل اکرم افخم حاجی قلی خان سردار اسعد وزیر داخله از قرار صدور این ملوفه فرمان معزی الیه را کماکان بمنصب قضاوت متصوب و برقرار میداریم که مراقبت کافیه درترتیب و شرایط ترویج شرع مطهر و اشاعه امر معروف و نهی از منکر و مطلق وظایف امر قضاوت بعمل آورده و خود را از جانب شخص شخیص سلطنت برای انجام مقررات مندرجه مجاز دانسته و حکام حال و استقبال لوازم شغل است مرجوع و مرعی دارند محرم ١٣٢٥

وەرگێڕانی کوردی

بە ناوی بە نێوبانگی ئەعلاحەزرەتی بەهێزشەوکەتی پیرۆزی موبارەکی شایشایانی سوڵتان ئەحمەد شای قاجار ملک و سەلتەنەتی هەمیشەیی بێ

شوێنی مۆری نایبی سەلتەنەت: عەلیرەزای قاجار

لەبەر ئەوەی جەنابی بەرز میرزا عەلی، قازیی ساوجبولاغ سلاوی خودای لێ بێ، خەسلەتی زانست و پاکیی هەیە و بۆ ئاسوودەیی میللەت لە سنووری ساوجبولاغ                    شوێنی ئیمزا

ئەوپەڕی چاودێریی کردووە و حەولی داوە و هۆی ڕازیبوون و پێخۆشیی کاربەدەستانی دەوڵەت و میللەتی لە هەموو ڕوویەکەوە پێک هێناوە، ئێستا کە بۆ ڕەچاو کردنی ویقار و حورمەت تازەکردنەوەی کاری قەزاوەتی ئەو لایەنە عەزیزە بە پێی تکا و داوای جەنابی بەرزی پیرۆزترینی خۆشەویسترین موخبیرولسەڵتەنە فەرمانفەرمای گشتیی ئازەربایجان لە لایەن جەنابی بەرزی پیرۆزترینی خۆشەویسترینی گەورەترین حاجی قوڵی خان سەرداری ئەسعەد وەزیری ناو خۆ پەسند کراوە، بەهۆی ئەم فەرمانەی پەیوەست ئەو لایەنە عەزیزە هەر وەک ڕابردوو بۆ پلەی قەزاوەت پەسند دەکەین و دای دەنێین کە چاودێریی پێویست بە سەر بەڕێوەچوونی هەلومەرجی شەرعی پاک و بلاو کردنەوەی ئەمری بە مەعرووف و نەهی لە مونکیر و موتلەق بکا و ئەرکی قەزاوەت پێک بهێنێ، ئەمن لە لایەن کەسی بەکەسایەتیی سەلتەنەتەوە خۆم بۆ بەڕێوەبردنی ڕێساکانی بلاوکراوە بە مۆڵەتپێدراو دەزانم و کاربەدەستانی ئێستا و داهاتوو پێداویستییەکانی ئەو پیشەیە لە بەر چاو بگرن و ڕووی تێ کەن. موحەڕەمی ١٣٢٥



٣- حوكم و دەستخەتی قازی عەلی، سەبارەت بە داری خانووەکانی محەحمەد شەی خـواروو. ٢٥ ی سـەفـەری ١٣٤١ای کـۆچی مـانگی ٢٦ /٧ /١٣٠١ ی هـەتاوی= ١٩/١٠/ ١٩٢٢ ی زاینی.

بەڵگەی ٣ حوکم و دەستخەتی قازی عەلی سەبارەت بە داری خانووەکانی مەحمەدشای خواروو.
٢٥ی سەفەری ١٣٤١ی کۆچی مانگی = ٢٦ / ٧/ ١٣٠١ ی هەتاوی = ١٩/ ١٠ / ١٩٢٢.

شاهد خلف مرحوم بایزید آقای دهبوکری

مهر: محمد کریم

الشاهد بما رقم الداعی

مهر: ابوالحسن سیف القضات

المطلع بمازبر فی المتن الداعی

مهر: الحق مع علی و علی مع الحق

مضمون این نوشته صحیح است

مهر: یمین القضات

مضمون متن همان واقع است

خلاف ندارد معروف مالک قره خان

مخفی نماناد عمدتا الامراء و العظام علی اصغر خان و خان کشی خان از بابت چوب خانەهای قریه محمد شاه سفلی هر حقی که بر ذمەء جناب میرزا رسول و سائر آقایان مالکین قریه چوملان داشتند نذر تبرر و هبەءایشان نمودند و میرزا محمدرسول مبلغ هشت تومان بعلی اصغرخان و خانکشی خان داد هرگاه من بعد ادعایی در انخصوص از مالکین چوملان نمایند باطل است

تحریرا فی ٢٥ شهر صفر المظفر ١٣٤١

امضاء

خانکشی خان باقی علی اصغر....

وەرگێڕانی کوردی

بە نهێنی نەمێنێتەوە ئەمیران و مەزنانی سەرەکی، عەلی ئەسغەر خان و خانکیشی خان لە بابەت دارەکانی دێی مەحمەدشای خواروو هەر حەقێکیان کە لەسەر جەنابی میرزا ڕەسووڵ و ئاغاکانی تری خاوەنی ئاوەدانیی چۆمەڵان هەبوو نەزریان کردن و میرزا محەمەد ڕەسووڵ بڕی هەشت تمەنی بە عەلی ئەسغەر خان و خانکیشی خان دا. بێتو لەمەودوا لەو بارەیەوە ئیددیعایەک لە خاوەن موڵکانی چۆمەڵان بکەن باتڵە

نووسراوە لە ٢٥ی مانگی سەفەری سەرکەوتووی ١٣٤١

ئیمزا: خانکیشی خان ئیمزا: عەلی ئەسغەر...

شاهید: کوڕی خودالێخۆشبوو بایزاغای دێبۆکری

مۆر: محەمەدی کریم

شاهیدی دەدەم لەسەر ئەوەی نووسراوە دۆعاگۆ

مۆر: ئەبولحەسەنی سەیفولقوزات

ئاگادارم لەوەی لە دەقەکە دایە دۆعاگۆ

مۆر: حەق لەگەڵ عەلییە و عەلی لەگەڵ حەق

قازی عەلی

نێوەرۆکی ئەم نووسراوەیە ڕاستە

مۆر: یەمینولقوزات

نێوەرۆکی دەقەکە ڕاستە

خیلافی تێدا نییە، مارف خاوەن موڵکی قەرەخان

*تێبینی: ئەمە حوکمێکە بە دەستخەتی قازی عەلی سەبارەت بە پێکهاتنی میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی، بابی نووسەر و دوو لە خاوەن موڵکانی محەمەدشای خواروو کە وێ دەچێ سەر بە عێلی قەرەپەپاغ بووبن. گوندی مەحمەدشە و چۆمەلان لە نێوان سابلاغ و نەغەدە هەڵکەوتوون.*

*قازی عەلی کە ئەو حوکمەی داوە، بە دەستخەتی خۆی نووسیوە ومۆری کردووە. کەسانی دیکەی لە دووی ڕاستیی ئەو پێکهاتنەیان داوە، بریتین لە مەحمەدئاغای دێبۆکری، سەیفولقوزات، میرزا عەبدولکەریمی قازی (یەمینولقوزات) کوڕی قازی لەتیف و ژنبرای میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی، مارف ئاغا خاوەنی دێی قەرەخان.*



٤- حوکم و دەستخەتی قازی عەلی سەبارەت بە بەشە زێڕی فاتمە سوڵتان خانم کچی میرزا ڕەسووڵی. باغچەی، بابی نووسەر ٢ی ڕەجەبی ١٣٤٧ی کۆچی مانگی = ٩/٢٤/ ١٣٠٧ ی هەتاوی= ١٥ / ١٢ / ١٩٢٨ی زاینی.

بەڵگەی ٤: حوکم و دەستخەتی قازی عەلی سەبارەت بە بەشەزێڕی فاتمە سوڵتان خانم کچی میرزا ڕەسووڵی باغچەی بابی نووسەر ٢ی ڕەجەبی ١٣٤٧ی کۆچی مانگی ٢٦ / ٧ / ١٣٠٧ ی هەتاوی ١٥/ ١٢ / ١٩٢٨ی زاینی

مخفی نماناد جناب میرزا محمد رسول وکاله از طرف فاطمه سلطان خانم دخترش عیال مرحوم میرزا غنی خلف مرحوم ابراهیم آقا ادعاء سی مثقال طلا حق الصداق او بر ذمهء آنمرحوم از جناب آقا میرزا ابراهیم قاضی زاده وکیل مادر انمرحوم نمود و او اقرار کرد حالیه باید مقدار سی مثقال طلا از ترکه آنمرحوم بفاطمه سلطان خانم داده شود

تحریرا فی ٢ شهر رجب المرجب ١٣٤٧

وچون انمرحوم أولاد ندارد ربع ترکه او بفاطمه سلطان خانم عیالش میرسد

تحریرا فی ٢٤ آذر ماه ١٣٠٧

محل مهر الحق مع علي

علي مع الحق

١٧/٤/٢

خط و مهر مرحوم ابوی تصدیق میشود

محمد قاضی امضاء

خط و مهر مرحوم حضرت قاضی علی تصدیق مینمایم

... الحقیر عبدالکریم قاضی زاده امضاء

وەرگێڕانی کوردی

بە نهێنی نەمێنێتەوە، جەنابی میرزا ڕەسووڵ بە وەکالەت لە لایەن فاتمە سوڵتان خانمی کچی، خێزانی خوداڵێخۆشبوو میرزا غەنی کوڕی خوداڵێخۆشبوو برایم ئاغا، ئیددیعای سی مسقاڵ زێڕی حەقی ئەلسیداق کە لە ئەستۆی ئەو خوداڵێخۆشبووە بووە لە جەنابی ئاغا میرزا ئیبراهیمی قازی زادە وەکیلی دایکی ئەو خوداڵێخۆشبووە کرد و ئەو ئیقراری کرد ئێستا دەبێ بڕی سی مسقاڵ زێڕ لەوەی لەپاش ئەو خوداڵێخۆشبووە بە جێ ماوە بدرێ بە فاتمە سوڵتان خانم

نووسراوە لە ٢ی مانگی ڕەجەبولموجەڕەبی ١٣٤٧ی کۆچی مانگی

و لە بەر ئەوەی ئەو خوداڵێخۆشبووە ئەولادی نییە یەک لە چواری ئەوەی لە پاشی بەجێ ماوە دەگا بە فاتمە سوڵتان خانمی خێزانی

نووسراوە لە ٢٤ی مانگی سەرماوەزی ١٣٠٧ی هەتاوی

شوێنی مۆر: حەق لەگەڵ عەلییە و عەلی لەگەڵ حەقە

قازی عەلی

٢ / ٤ / ١٧

خەت و مۆری باوکم حەزرەتی قازی عەلی تەسدیق دەکرێ

محەمەدی قازی ئیمزا

خەت و مۆری خوداڵێخۆشبوو حەزرەتی قازی عەلی تەسدیق دەکەم

.... چکۆڵە عەبدولکەریمی قازیزادە ئیمزا

تێبینی: ئەم حوکمەش ئی قازی عەلییە کە وەکو قازیی شەرع بە دەستی خۆی نووسیویە سەبارەت بە بەش پێبڕانی فاتمەسوڵتان خانمی فەتاحی قازی کە کچی میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی و خوشکی نووسەر بووە. ئەوەی لەو بەڵگەیەدا جێگەی سەرنجە ئەوەیە _ نزیکەی دە ساڵ دواتر محەمەدی قازی واتە (پێشەوا قازی محەمەد) خەت و مۆری قازی عەلیی تەسدیق کردووە. ئەو کەسەی دیکەش کە خەت و مۆری قازی عەلی تەسدیق کردووە، عەبدولکەریمی قازی (حاجی قازی) کوڕی قازی مونعیمە. میرزا برایمی قازیزادە کە لەم بەڵگەیەدا نێوی هاتووە کوڕی میرزا جەلیلی باغچەی و ئامۆزای باوکی نووسەر واتە میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی بووە. هەر وەک لەم کتێبەشدا باس کراوە و بە پێی نووسینی لێکۆڵەرەوەی کورد سەید محەمەدی سەمەدی، میرزا برایمی قازی زادە لە ساڵی ١٣١٠ ی هەتاوی لە دوای میرزا محەمەدی هومامی قازی (پێشەوا قازی محەمەد) بووە بە نوێنەری ئیدارەی معاریف (فەرهەنگ)ی مهاباد (سەید محەمەدی سەمەدی، نگاهی بە تاریخ مهاباد، انتشارات رهرو،١٣٧٣ هەتاوی، لاپەڕەی ٤٠٠)

بەڵگەی ٥: شکایەتنامەی میرزا ڕەسووڵی فەتاحی قازی (بابی نووسەر) بۆ کاربەدەستانی ئێرانی. دەی جۆزەردانی ١٣٢٢ی هەتاوی = ١ / ٦ / ١٩٤٣ی زاینی

وەرگێڕانی کوردی

جەنابی ئاغای سەرۆک وەزیر

وەزیری نێوخۆ

وەزیری خواروبار

وەزیری داد

سەرۆکی مەجلیسی شوورای میللی

سەرۆکی ئیدارەی گشتیی ژاندارمەریی وڵات

ئۆستانداریی ئەستانی ٣ و ٤

ئیدارەی ژاندەرمەریی ئەستانی ٣ و ٤

فەرماندەریی گوردانی ژاندارمەریی ورمێ لە میاندواو

ئیدارەی فەرمانداریی شارستانی مهاباد

ئاغای حوسێنی مەعرووفیی دیبۆکری کوڕی خدر خاوەنی دێی ئەمین ئاباد کە لەگەڵ ئەم فیداییە لە گوندی قزڵجەی سەرێ کە لە دوو فرسەخ و نیوی مهاباد هەڵکەوتووە دراوسێی ملکییە، لە دوای ڕووداوی خەرمانانی ١٣٢٠ی هەتاوی کە هێمنیی ئەم مەڵبەندە چەتی تێ کەوت و سەربازخانەی مهاباد هەڵوەشاو وەزع تێک چوو، بە خراپە کەڵکی لەو بارودۆخە و پێڕا نەگەیشتنەوە بە کاروباران وەرگرت چەند پارچە زەوی بە بەرهەمییەوە و پارچەیەک قەڵەمەزار و چەند پەڵە زەویی وێنجە و گژوگیا و مێشەڵانی ساڵی ڕابردوو لە گوێن چۆنییەتیی عەشیرەتی و بە زەبری چەک داگیر کرد. قەڵەمەکانی بڕییەوە، وێنجە و گژو گیای درووییەوە، لەگەڵ حاسڵاتی غەلە و دانەوێڵە دوو پارچە مەزرای تاڵان کرد، لەوەش زیاتر سەبارەت بە پاشماوەی ملکەکە و ڕەعییەتەکانی ئەم چاکیرەتان دەستی لە هیچ جۆرە شەڕاڕەت و هەرزەیی نەپاراست و لە ژێر تاوی گوشار و هەڕەشە و گوڕەشەی نێوبراو و پەلپ و بیانووەکانیدا ژمارەیەک لە ڕەعییەتەکان ساڵی ڕابردوو کۆچیان کرد و هەڵاتن. ئەمساڵیش لە بەر ئەوەی هیچ نەکراوە بۆ پێشگرتن لە شەڕاڕەت و دەستدرێژیی ڕابردووی وی غیرەتی وەبەر هاتووە، جگە لە زەوییەکانی کە باس کران، هێندێکی دیکەش لە زەوییەکانی ملکی بەندەتانی داگیر کردووە و چوار بنەماڵەی دیکەی ڕەعییەتەکانی لە شوێنی خۆیان دەرپەڕاندووە و ناچاری کردوون هەڵێن. جگە لەوەی بە هەزاران تمەنی خەسار و زەرەر پێ گەیاندووم، ئێستا ئاوەدانییەکەی بەندە وێران و کەس نەکێڵە و کەسی تێدا نەماوەتەوە و دەرفەتی دابینکردنی گیان و ماڵی لەم فیداییەتان ئەستاندووە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ درێژە بە

شەڕارەتی خۆی دەدا. لە بەرواری ٢٥ / ٢ / ١٣٢٢ی هەتاویدا دەستوپێکورەی ئەو شەش سەد کیلۆ گەنم باراشی منیان کە بۆ دابینکردنی ژیانی بنەماڵەکەم ناردبوومە ئاشی خۆم، دزیوە. لە ساڵی ڕابردوودا لە بەر نەبوونی هێزی بەڕێوەبەری لە مهاباد و بێدەستەڵاتیی ئیدارەکانی پێوەندیدار ناچار بووم ڕوو لە فەرمانداری و پیاوماقووڵان و ڕدێن سپییەکانی ناوچە بکەم. ئاشکرایە ئەوە کەمترین ئاکامی نەبوو. ئێستاش ئەگەرچی بە قسە ئیدارەی داد لە مهاباد هەیە بەڵام بە نەبوونی هێزی بەڕێوەبەری لە دەرەوەی شاری و تەنانەت لە نێو خۆی شاریشدا هیچ دەستەڵاتێکی نییە و ناتوانێ بۆ دانەوەی حەق بە حەقدار هیچ بکا. ئێستا عاجزانە لەبەرتان دەپاڕێمەوە و داوا دەکەم تا ئەوکاتەی هێزی بەڕێوەبەری لە مهاباد دادەمەزرێتەوە و چارەنووسی باری هێمنیی ئەم مەڵبەندە یەکلایی دەکرێتەوە، بە ئاغای حاجی قەرەنی ئاغای ئەمیر عەشایری سەرۆکی عێلی مامەش کە ئینتیزاماتی ئەم هەرێمەی بە ئەستۆ وەیە دەستوور بفەرموون فەرمانی پێویست بدا بۆ پێشگیری لە شەڕارەت و دانەوەی خەسار و مڵکە داگیرکراوەکانم. لەوانەیە نێوبراو بتوانێ تا ڕادەیەک هەنگاوی بەکەلک هەڵبهێنێتەوە بۆ ئەوەی زیاتر لەمە نەکەومە_ بەر دەستدرێژی و گوشار و زوڵم و پێشێل نەکرێم.

ڕەسووڵی فەتاحی قازی لە مهابادەوە ئەم (سکاڵایەی)
پێشکێش کردووە، لە بەرواری دەی جۆزەردانی ١٣٢٢ی
هەتاوی

ئیمزا: ڕەسووڵی فەتاحیی قازی

*تێبینی: ئەم بەڵگەیە سکاڵانامەیەکە کە باوکی نووسەر، لەو سەروبەندە دا کە بەرپرسیارەتی ئینتیزاماتی شار لە لایەن حکوومەتی نێوەندییەوە بە ئەستۆی قەرەنی ئاغای ئەمیر عەشایری مامەش بووە بۆ کاربەدەستانی ناردووە. نووسەر لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا: 'سالهای اضطراب' (ساڵانی پەشێوی) بە دوورودرێژی باسی ئەو داگیرکارییەی کردووە کە لەم نامەیەدا هێمای پێ کراوە. وەرگێڕی کوردی.*




٦– نامەی دوکتور جەوادی قازی بۆ دوکتور مستەفای قازی (شەوقی)

١٣ی ئاوریلی ١٩١٣

بەڵگەی ٦: نامەی دوکتور جەوادی قازی بۆ مستەفای قازی لە ژێنێڤەوە بۆ بێرلین
١٣ی ئاوریلی ١٩١٣ زایینی.

نور چشمها انشاالله سلامت و بی ملالید مدتی است از شما بی خبرمی باشم، نمی دانم تا حال جای پیدا کرد(ه) اید یاخیر اقداماتی که من از اینجا کرده‌ام هنوز جوابی نرسیده است وضع خودتان از هر جهت به من بنویسید از حضرت ابویت کاغذی رسیده یا خیر زیاده در امان خدا باشید جواد قاضی.

وەرگێڕانی کوردی

نووری چاوان ئینشائەڵڵا سڵامەت و بێ وەیین. لە ئێوە بێ خەبەرم نازانم تا ئێستا شوێنێکت پەیدا کردووە یان نا. ئەو کارانەی ئەمن لێرە کردوومن هێشتا وڵامیان نەهاتووەتەوە. وەزعی خۆتان لە هەموو ڕوویەکەوە بۆ من بنووسن، لە حەزرەتی باوکت نامەیەک گەیشتووە یان نا، زیادە لە پەنای خوایدا بی جەوادی قازی.

تێبینی: وەک لەو نیشانەی کە بە خەتی لاتینی لە سەر زەرفەکە نووسراوە دەردەکەوێ، جەوادی قازی (دوکتور جەوادی قازی) کوڕی قازی شێخ جەلال ئەو نامەیەی بۆ مستەفای قازی ئامۆزای (دوکتور مستەفای قازیزادە – شەوقی) کوڕی قازی لەتیف نووسیوە، نامەکە بە پێی مۆری پۆستخانە کە لە سەر زەرفەکە جوان دیارە لە ١٣ / ٤ / ١٩١٣ لە ژێنێڤڕا ناردراوە بۆ بێرلین و ئەو دەمە مستەفای قازی لە بێرلین ژیاوە. بە پێی نامەکە دوکتور جەوادی قازی حەولی داوە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکانی مستەفای قازی. دوکتور مستەفای قازی دواتر گەڕاوەتەوە ترکیا و لە کۆنستانتینۆپل (ئەستەنبول) درێژەی بە خوێندن داوە و لە ١ی سێپتامبری ١٩٢٢ خوێندنی پزیشکیی تەواو کردووە. وەرگێڕی کوردی.



٧- کورتە شێعرێکی دوکتور مستەفای قازی (شەوقی)

عەرەفەی ئەزحا ١٣٤٢ی کۆچی مانگی (٢ /٥/ ١٣٠٣)ی هەتاوی = ٢٤ ,٧ ,
١٩٢٣ ی زاینی

بەڵگەی ٧: کورتە شێعرێکی دوکتور مستەفای قازی (شەوقی)

کوردی

شەوقی وەرە لەو غوربەتە مائیل بە وەتەن بە
بێ خاکی وەتەن عێزەتی تۆ مەحزی خەیاڵە

بەو کاکۆڵی ڕەش ڕەنگە کە وا بۆزی فیراقە
با ڕام بێ لەبۆت فەزل و هونەر بۆ تۆ حەڵاڵە
ینی.....؟!
عەرەفەی ئەزحای ١٣٤٢

تێبینی: ئەو کورتە شێعرە دوکتور مستەفای قازی لە ترکیا نووسیویە و بۆ خزمانی ناردووە لە مهاباد بەداخەوە وشەیەک کە وێدەچێ نێوی شوێن بێ نەخوێندرایەوە




٨- نامەی دوکتور مستەفای قازی بۆ گەوهەرتاج خانمی قازی، دایکی نووسەر ٢٠ ڕەجەبی ١٣٤٨ = ٣,١,١٩٣٠ زاینی

بەڵگەی ٨: نامەی دوکتور مستەفای قازی بۆ گەوھەرتاج خانمی قازی، یەکێک لە خوشکەکانی کە لە دینارەوە_ لەگەڵ وێنەی منداڵەکانی بۆی ناردووە بۆ ساباڵاغ (دینارە ناوچەیەکە لە ئەیالەتی ئەفیۆنی ترکییە لە دەڤەری دەریای سپی) ٢٠ی رەجەبولموجەرەبی ١٣٤٨ = ٢,١, ١٩٣٠

حکومت طبیبی

قاضیزاده

دوقتور مصطفی شوقی          دینار: ٢٠ رجب المجرب ١٣٤٨

KAZI ZADE

CHEVKI.M.D

No du Diplome

3570

Medecin Des Maladie

Internes et ENFANTS

دیپلومه – ٣٥٧٠

امراض داخلیه و جوجق خستەلغلری

حکیمی

همشیره عزیز مهربان دامت عفتها

چندی قبل مراسلەء شریفرا زیارت کرده از مژده صحت و سلامتی آنوجود عزیز فوق الحد ممنون و خوشحال گردیدم. حق تعالی وجود شریف و مزاج فرزندان که نورچشمان این غربت زده میباشند از جمیع... و سیئات محفوظ فرمایند. علی الخصوص تمثال و عکس آن وجودان عزیز چندان رقت و غریبی فراهم آورد که بی اختیار اشک حسرت ازدو دیدەام جاری گردید. ایامنزلی سلمی سلامی علیکما هل الاون التالی و راجع متفقد حالات این جانب گردیده بودند بحمدالله همگی سلامت و بغیراز دوری و محرومی فیض حضور کدری فراهم نه – چنانکه امیدوارم این هجران بزودی زود مبدل وصال شود.در رقمجات گذشته چنانکه نوشته بودم فی الواقع در این پائیز خیال مراجعت داشتم ولی از آنجائیکه دختران بنده چنانکه در عکسشان معلوم میشود خیلی کوچک و تحمل شاق سفر ندارند بالضروره مراجعت را به همین بهار تعلیق گردید. و چونان خیال دارم که در اول وهله بسمت ریاست صحیه ولایت وان که بساوجبلاغ خیلی نزدیک است بآن طرف بیایم و سپس زیارت وطن مبارک بنمایم و چشمان اشتیاق را غریق سرور و ابتهاج نمایم. واقعا از این زیادتر اقامت غربت جائز نیست ولی از ان جائیکه میترسم که اهالی مملکت قدر و قیمت بنده را نشناسند و بسعی و عمل زیادی موقعیکه اکنون در پیش

حکومت ترکی بدست آورده‌ام بخیال اینکه در وطن کاری بدست آورم نمیخواهم باسانی ترک کنم. این است که هنگام بودن در ولایت (وان) بنزدیکی احوال و روش وطنرا تدقیق خواهم کرد در صورتیکه در وطن مبارک موقعی خوبی تصور کردم البته اقامت در وطن را ترجیح خواهم نمود. در این صورت انشاالله در همین پنج شش ماهه مراجعت بوطن نصیب خواهد شد. محض یادگار عکس افراد عائله و دخترانرا بعرض دست بوسی تقدیم مینمایم. نهال دختر بزرگی بشما خیلی شباهت دارد، مرال هم به خالوی مرحومم خیلی مشابهت دارد. اکنون نهال در سن شش ساله‌گی و مرال در ٤ ساله‌گی، اولکر هم سه ساله و گول بسر (گونسه‌ل) هم پانزده ماهه است. همه دست محترمت را میبوسند.

نورچشمان میرزا محمد خلیل و میرزا حسن و دیگرانرا دیده بوسم. در خدمت جناب مستطاب برادری مکرم آقای میرزا رسول سلم الله عرض سلام و تحیات دارم. جناب مستطاب برادری آقای میرزا ابراهیم قاضی را دامت ظله العالی عرض سلام و تحیات دارم، مدتی است که بنده را فراموش کرده است. افراد سائرهء خویشاوندانرا سلام و حرمت رسانم. زیاده منتظرنوید سلامتی هستم

برادرت

دکتر مصطفی شوقی

قاضی زاده

وەرگێرانی کوردی

قازیزادە

دوکتور مستەفای شەوقی          دینار: ۲۰ی ڕەجەبولجەڕەبی ۱۳٤۸

دیپلۆمە ۳٥۷۰

حەکیمی نەخۆشیی هەناو و نەخۆشیی منداڵان

خوشکی ئازیزی مێهرەوانم پاکیی درێژە بکێشێ

چەندێک لەمەو پێش نامەی بەرزتانم زیارەت کرد لە مزگێنیی ساغوسڵامەتی ئەو وجوودە عەزیزە ئەو پەڕی مەمنوون بووم و خۆشحاڵ بووم. حەق تەعالا وجوودی شەریف و میزاجی منداڵەکانت کە نووری چاوانی ئەم غەریبی لێدراوەن، لە هەموو بەڵا و دەردێک بپارێزێ. بە تایبەتی وێنەی ئەو وجوودە عەزیزانە ئەوەندەی کار لە دڵی کردم و هەستی غەریبیی ورووژاندم بێ ئەوەی بتوانم خۆم ڕابگرم فرمێسکی دووری لە دوو چاوانم هێنایە خوارێ. (ئەی دوو ماڵی سەلما سڵاوی من لە ئێوە / گەلۆ ئەو کاتانەی کە ڕابردوون دەگەڕێنەوە ؟) ئەگەر لە حاڵی من بپرسن شوکرانە بژێری خودام هەمووماں ساغین و جگە لە دووری لە بەهرەی حزووری ئێوە هیچ ناخۆشییەک نییە. هەر وەک

